ساڵی سیانزەهەم پاییزی ٢٠١٢
گۆڤارێکی تایبەتە بەوەرگێڕانو کلتوری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات


# سەردەم
72


خاوەنی ئیمتیاز
شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

راوێژکاری گۆڤار
ڕێبین هەردی

دەستەی نووسین
هیوا قادر
هەورامان وریا قانع

دیزاین
ئومێد محەمەد

تایپ و هەڵەچنی
ڕێبوار سەدرەدین

بەرگ
ئارام عەلی



ئیمەیڵ
govarysardam@yahoo.com

www.serdem.net

# ناوەرۆک

## فیکرو فەلسەفە ٤ ـ ٥٧



## وتارو لێکۆڵینەوە ٥٨ ـ ٨٥



## گفتوگۆ ٨٦ ـ ٩٣



## ئەدەب و هونەر ٩٤ ـ ١٤١

# پلاتۆن

میشائێل برۆت
و. لە ئەڵمانییەوە: کاوە جەلال

## ١) لە پێناسەوە رووەو ئیدێکان

### A) پنتی دەرچوون

گەر بمانەوێت تێبگەین کە چی پاڵی بە پلاتۆنەوە نا لە ئیدێ بدوێت، ئەوا دەبێت سەرەتا لەو کێشە هەقیقیانە تێبگەین، کە پاڵیان بە پلاتۆنەوە نا گریمانەی «ئیدێ» بکات. فەلسەفەی پلاتۆن لەو پرسیار و کێشانەوە سەرهەڵدەدات کە سۆکرات کردبوونی و دانوستانی کردبوون.
با روو بکەینە پرسیارەکەی سۆکرات سەبارەت بە پێناسەی «رەوشت».
لە دیالۆگە ئاپۆرێتییەکانی پێناسەدا، کە هەروەها بە دیالۆگە سەرەتاییەکانی پلاتۆن ناسراون،

**سۆکرات لەو بڕوایەدا بوو، کە هەموو کەسێکی دادپەروەر و دانا، دلێر و ناخسەنگین، چاکترین ژیان دەژی، بێگومان چاکترین ژیانێکی ئەوتۆ کە بۆ ئەو وەك مرۆڤ شیاو بێت**



میشائیل برۆت

سۆکرات لەتەک هاوگفتوگۆکەرانیدا لەبارەی ئەوە نادوێت کە داخۆ ژیانی چاک و بەختیار چی بێت، بەڵکو لەوە دەدوێت، کە چۆن گەرەکە رەوشتێکی تایبەتی، بۆ نموونە دادپەروەری یان ئیمانداری، پێناسە بکرێت.

لە لای گریکەکان پەیوەندیی نێوان پرسیاری ژیانی چاک و پرسیاری رەوشتێکی چاک راستەوخۆ دراوە. بەڵام پێویستە سەرەتا رووبکەینە تێگەیشتنی گریکییانەی رەوشت.

وشە گریکییەکەی رەوشت بریتییە لە ئاریتێ (areté). ئەم وشەیە لە وشەی «چاک» (ئاگاتۆس) گەردان دەکرێت، یان دەشێت لە هەندێک حاڵەتدا وەریبگێڕین بۆ «باشترین». بەڵام ئەم چاکێتییە لە گریکیدا تەنیا بۆ مرۆڤ بەکارنایەت، بەڵکو بۆ هەر شتێک کە کاراییەک یان فرمانێک بەجێبگەیەنێت و بەم رێیەشەوە کاراییەکە یان فرمانەکە بە شێوەی جیاوازی «چاک» بەدیبهێنێت. مرۆڤی گریکی دەتوانێت ببێژێت، کە چەقۆ یان چاو رەوشتیان هەیە. رەوشتی چەقۆ ئەوەیە کە چاک ببڕێت، رەوشتی چاو ئەوەیە کە چاک ببینێت.

ئێمە هەروەها دەتوانین رەوشتە مرۆڤییەکانیش هاوشێوەی ئەو نموونانەی سەرەوە دیاریبکەین. چۆن فرمانی چەقۆ بڕین و فرمانی چاو بینینە، بە هەمان شێوە فرمانی مرۆڤ ئەوەیە کە ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێت. هەروەها چۆن چەقۆ یان چاو فرمانەکەی خۆیان بە چاکی جیاواز بەجێدەگەیەنن، بە هەمان شێوە مرۆڤ دەتوانێت ژیانی خۆی بە

چاکی جیاواز بژی، ئەمەش بێگومان بەگوێرەی ئەو دۆخە کە ئەو تێیدایە.
دۆخـی چاکی مـرۆڤ، ڕەوشتە ڕاستەقینەکەی مرۆڤ، بریتییە لە ژیانی چاک. ئەم ژیانە چاکە بەسەر ڕەوشتی جیاوازدا بەش دەبێت، بەتایبەتی بەسەر چوار ڕەوشتە سەرەکییەکەدا: دادپەروەری، دانایی، دلێری، ناخسەنگینی.
سۆکرات لەو بڕوایەدا بوو، کە هەموو کەسێکی دادپـەروەر و دانا، دلێر و ناخسەنگین، چاکترین ژیان دەژی، بێگومان چاکترین ژیانێکی ئەوتۆ کە بۆ ئەو وەک مرۆڤ شیاو بێت.
لە سەردەمی سۆکراتدا ڕای دیکە هەبوو. مرۆ بۆ نموونە دەیپرسی کە داخۆ لەپاڵ چوار ڕەوشتە سەرەکییەدا، هەروەها لەشساغی و پـارەداری پێویست نەبن بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ژیانێکی بەختیار بژی.
بەڵام پەیوەست بە سۆکراتەوە پێویستە ڕوو بکەینە کێشە کرۆکییە قۆناغ دروستکەرەکەی ئەو: ئەو دەیگۆت، لەبەر ئەوەی نەیزانیوە کە ئەو دەزانێت، ئەوا ویستوویەتی لەتەک ئەسینایییەکاندا گفتوگۆ بکات، تاکو بزانێت ژیانی چاک چییە، بەڵام پاشان بۆی دەرکـەوتـووە، نە ئەو خۆی و نە ئەوانیش زانیویانە ئەو ژیانە چاکە چییە.

## B) دیالۆگە ئاپۆرێتییەکانی پێناسە لە نموونەی یۆتیفرۆندا

پلاتۆن بۆ یەکەم جار لە دیالۆگی «یۆتیفرۆن»دا وشـەی «ئـیـدێ» لـە واتـایـەکـی فەلسەفەییدا بەکاردەهێنێت. لەم دیالۆگەدا سۆکرات لەتەک یۆتیفرۆندا کە پیاوێکی ئایینە، گفتوگۆ دەکات.
بێگومان پێویستە سەرەتا پەیوەست بە پیاوانی ئایینی گریکی بڵێین، کە ئـەوان لـە گریکیا پێگەیاندنێکی تایبەتییان نەبوو، بەڵکو ئەو پایەگایە تەنیا پایەگایەکی شەرەف بوو و کەسێکی تایبەتی بۆی هەڵدەبژێررا.
یۆتیفرۆن بە سۆکرات دەڵێت، کە دەیەوێت شکات لە باوکی خۆی بکات، چونکە کەسێکی کوشتووە: کرێکارێکی ڕۆژانە، کە لای باوکی یۆتیفرۆن کاری دەکـرد، بە سەرخۆشی خزمەتکارێکی باوکی یۆتیفرۆن دەکوژێت، باوکیشی کرێکارەکە دەخاتە نێو چاڵێکەوە و دەڕوات بۆ ئەسینا بۆ ڕاوێژ، ئەو دەیەوێت بزانێت چی لەدژی ئەو کارە بکات، بەڵام لەم ماوەیەدا لەیادیدەچێتەوە بە تەنگ کرێکارەکەوە بچێت، کە ئیتر ئەو کرێکارە لە برسان و تینوان و سەرمادا دەمرێت. یۆتیفرۆن دەیەوێت باوکی بۆ ئەم بێدادییەی سزا بدرێت، بۆیە دەیەوێت بیدات بە دادگا، لەبەر ئەم هۆیە خزم و دۆستەکانی بە شێتی دادەنێن، بەڵام یۆتیفرۆن بە پێچەوانەوەی ئەوانەوە سزادانی باوکی بە ڕەوا دەبینێت و هاوکات دەبێژێت، کە خزم و دۆستانی هیچ شتێک لەبارەی هۆسیۆس (hosios)، واتا ئیمانداری، نازانن.
هۆسیۆس واتای ڕەفتارێک دەگەیەنێت کە نەک تەنیا پەیوەست بە کۆمەڵی مرۆڤەوە بـەداد و ڕاستە، بەڵکو پەیوەست بـەوەشـەوە کە چۆن خوداکان دەیانەوێت مرۆڤان پێکەوە بژین. ئەم ڕەفتارە پەیوەست بە خوداکانەوە ناودەنرێت هۆسیۆس. گومانی تێدا نییە کە وەرگێڕانی وشەی هۆسیۆس بۆ «ئیمانداری» ڕاستە، بە مەرجێک لەم ئیمانداریییە هەڵوێستێکی ناخەکی تێنەگەین، بەڵکو گەرەکە وەک ڕەفتارێک بەرانبەر بە مرۆڤانی

دی لێی تێبگەین، بەڵام بە مەرجێک کە ڕەفتارەکە بەدڵی خوداکان بێت.

لە مۆرالدیدیی گریکەکاندا ئەم هەوڵەی یۆتیفرۆن بۆ شکاتکردن لە باوکی خۆی وەک خراپترین تاوان دەبینرا. بەڵام پەیوەست بەم دیالۆگەی پلاتۆنەوە ئەو لایەنە گرنگە، کە سۆکرات و یۆتیفرۆن لەم کێشەیە نادوێن، بەڵکو سۆکرات هەنگاوێک بەرەو پاش دەگەڕێتەوە و لە یۆتیفرۆن دەپرسێت: «ئایا ئیمان چییە»؟ یۆتیفرۆن وەڵام دەداتەوە: ئیمان ئەوەیە کە من ئێستا ئەنجامی دەدەم، واتا تاوانبارێک بە سزا دەگەیەنم. پەرچەکرداری سۆکرات بۆ ئەم وەڵامەی یۆتیفرۆن ئەوەیە، کە پێی دەڵێت، ئەو گۆیا لە پرسیارەکەی تێنەگەیشتووە. ئاخر سۆکرات نایەوێت بزانێت چ کردارێک شایانی ئەوەیە ناو بنرێت بەئیمان، بەڵکو دەیەوێت بزانێت «ئیمان چییە؟»

مرۆڤ ناتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارە بە نموونەیەک بداتەوە و ڕوونی بکاتەوە داخۆ ئیمان چی بێت.

## C) ئامرازەکانی شرۆڤەی فەلسەفەیی

بەگشتی تێگەیشتنی ئێمە بۆ کردەکێتی (Wirklichkeit) ئەو واتایە دەگەیەنێت کە لە جیهانەکەماندا بابەت و زیندەوەران یان کردار هەن و ئەدگاری تایبەتییان هەیە. ئەم تێگەیشتنەی کردەکێتی لەو شێوازەدا دەردەکەوێت، کە چۆن ئێمە لەبارەی بابەتەکان، زیندەوەرەکان یان کردارەکان دەدوێین. ئێمە لە ڕستەی ئەدگاردا بۆ هەر هەڵگرێک (سەبژێکتێک)، کە بۆ بابەتێک، زیندەوەرێک یان کردارێک دانراوە، هەڵگیراوێک (پرێدیکاتێک، مەحمولێک) دادەنێین: دەیخەینە پاڵی. ئەم هەڵگیراوە نوێنەرایەتیی ئەدگارەکە دەکات. بۆ نموونە: «ئەم ویسکییە چاکە»، «سۆکرات کەچەڵە»، یان: «شکاتکردن لە باوکی خۆ، گەر کەسێکی بەڕێی برسێتییەوە لە چاڵێکدا کوشتبێت، ئیمانداریيە».

بەڵام ئەوە کە لە واژەناسیی فەلسەفەییدا وەک هەڵگیراو دادەنرێت، جیاوازە لەو هەڵگیراوە (خەبەرە) کە لە زۆرینەی ڕێزمانەکاندا هەیە، چونکە کردار (Verb) بە هەڵگیراوی ڕستەیەک دانانرێت، بەڵکو ئاوەڵناوێک بەو خەبەرە دادەنرێت کە وەک ناوی هەڵگیراو (Prädikatsnomen) بەکارهێنراوە، یان ناوی خەبەری / هەڵگیراو لەتەک کرداری ناتەواوی «ـە» (ist=is) دا بەکارهێنراوە. هەڵگیراوەکانی «چاک»، «کەچەڵ»، «بەئیمان»، چ لە گریکی و چ لە ئەڵمانیدا، بە ئامرازی ناسین لە حاڵەتی نێوترومدا (بێلایەندا) دەکرێن بە هەڵگیراوی ناو (اسم المضارع): واتا بە «چاکە» (das Gute)، «کەچەڵ» (das Kahle)، «ئیمان» (das Fromme). کاتێک پلاتۆن لەبارەی ئەدگارێک دەپرسێت، ئەوا بەزۆریی ئەم فۆرمە دیاریکراوەی سەرەوە بەکاردەهێنێت.

گەر پێناسەیەک ڕاست بێت، ئەوا دەبێت هەندێک تایبەتمەندی بەدیبهێنێت. بۆ نموونە پێناسەی «ڕەبەن». گەر کەسێک بپرسێت «ڕەبەن» چییە، ئەوا ئەو کەسە پرسیار لەبارەی پێناسەی تێگەکە دەکات، فۆرمی پێناسەش بریتییە لە: F = P.
F دانراوە بۆ تێگەکە کە گەرەکە پێناسە بکرێت (واتا ڕەبەن).

P دانراوە بۆ دەربڕینێکی زمانیانەی ئاڵۆزتر کە بەڕێیەوە پێناسەی «F» دەکرێت و ناودەنرێت «فۆرمولی پێناسە بۆ F» (واتا پیاوێک کە هاوسەرگیریی نەکردووە).

بەڕێی هێمای یەکسانییەوە («=») پێشان دەدرێت، کە: گەر پێناسەکە راست بێت، ئەوا هەمیشە دەشێت لە هەر رستەیەکدا لەبریی «F»، بەبێ ئەوەی واتاکەی بدۆڕێنێت، «P» دابنرێت.

بۆ نموونە پێناسەی «رەبەن» وەک پیاوی هاوسەرگیری نەکردوو راستە، چونکە لە هەر رستەیەکدا «رەبەن» هەبێت، ئەوا دەشێت لەبریی ئەو «پیاوی هاوسەرگیری نەکردوو» دابنرێت و بە پێچەوانەشەوە. گەر پیناسەکە راست بێت، ئەوا چ «F» و چ فۆرمولی پێناسەکەی، واتا «P»، روو دەکەنە هەمان بابەت.

بەڵام دەبێت رەچاوی جیاوازییەکی دیکە بکەین کە بۆ ئەرگومێنتهێنانەوەکەی یۆتیفرۆن گرنگە: جیاوازیی نێوان کشان (ئێکستێنزیۆن) و چوونەخۆی (ئینتەنزیۆن) هەڵگیراوێک.

کشانی هەڵگیراو واتای چێوەی هەڵگیراوەکە دەگەیەنێت، واتا سەرجەم ئەو شتانە دەگرێتەوە کە دەشێت هەڵگیراوەکە لەبارەیان دەرببڕێت. یان: کشانی هەڵگیراو بریتییە لە کۆمەڵی سەرجەم ئەو شتانە کە هەڵگیراوەکە روویان تێدەکات. بۆ نموونە کشانی هەڵگیراوی «کەچەڵ» هەموو ئەو مرۆڤانە دەگرێتەوە کە بەڕاستی کەچەڵن (رەنگە هەندێک ئاژەڵیش، بۆ نموونە لە ئەڵمانیدا دوای بڕینی مووی مەڕ دەگۆترێت، کە مەڕەکان کەچەڵن).

بە پێچەوانەوە چوونەخۆی هەڵگیراوێک بریتییە لە «واتا»ی هەڵگیراوەکە و ئێمە بە فۆرمولی پێناسەی هەڵگیراوەکە دیاریی دەکەین. چوونەخۆی هەڵگیراوی «کەچەڵ» ئەوەیە کە «موو بە سەرەوە نەبێت»؛ چوونەخۆی هەڵگیراوی «چاکە» سەرجەمی ئەو شتانە لە خۆ دەگرێت کە دەشێت بەگوێرەی راستی لەبارەی بگۆترێت کە «چاک-ـە».

## D) هێنانەوەی «ئیدێ» لە یۆتیفرۆندا

بێگومان پلاتۆن ئەم دوو واژە فەلسەفەییەی کشان و چوونەخۆ ناناسێت، بەڵام جیاوازیکردن لە نێوان ئەم دوو واژەیەدا دەرفەتمان دەداتێت تاکو ئەو هەڵەیە دیاری بکەین کە یۆتیفرۆن لە وەڵامی پرسیارەکەی سۆکراتدا لەبارەی «ئیمان» دەیکات.

سۆکرات دەیەوێت بزانێت: ئایا دەربڕینی «شتێک بەئیمانە» چ واتایەک دەگەیەنێت؟ وەڵامەکەی یۆتیفرۆن نموونەیەکە بۆ شتێک کە سەر بە کشانە، واتا نموونەیەکە بۆ ئەوە کە گۆیا مرۆ (المرو) دەتوانێت هەڵگیراوی «بەئیمان» دەرببڕێت. بەڵام ئەو لێرەدا نەک تەنیا وەڵامێکی هەڵە دەداتەوە، بەڵکو هەروەها لە پرسیارەکەی سۆکرات تێنەگەیشتووە.

ئێستاش سۆکرات بۆ روونکردنەوەی جیاوازیی نێوان کشان و چوونەخۆ تێگەی «ئیدێ» دەهێنێتە نێوانەوە (Euthyphron 6 d 9 – e 7). سۆکرات دەبێژێت: پرسیارەکەی روودەکاتە ئەو ئایدۆسە (Eidos)، کە هەر شتێک بەئیمان بێت، بەڕێی ئەوەوە بەئیمانە. هەر شتێک کە بەئیمان بێت، بەڕێی ئیدێوە (idea) بەئیمانە، هەروەها هەر شتێک کە بێئیمان بێت، ئەوا بێئیمانە.

سۆکرات دەبێژێت: ئەو دەیەوێت بزانێت داخۆ

ئەم «ئیدێیا»یە چی بێت، بۆ ئـەوەی لەکاتی لێڕوانیندا نموونەیەک یان پارادیگمایەکی هەبێت کە بەڕێیەوە شتە بەئیمانەکان لە شتە بێئیمانەکان جیابکاتەوە.

واژەکانی «ئایدۆس» و «ئیدێیا»، بە هەمان شـێوەی بینین، هـەمـان ڕەگـی وشـەیـان هەیە و لە هەمان واتـادا بەکاردەهێنرێن. گەر مرۆ لە شتێک بڕوانێت، ئەوا ئیدێیا یان ئایدۆسی شتەکە لەم ڕوانینەیدا ئەوەیە کە ئەو دەیبینێت، واتا: شێوەیەک یان فۆرمێک کە ئەو بابەتە یان ئەو شتە هەیەتی. کەواتە ئیدێ واتای فۆرمی دیاری بابەتێک دەگەیەنێت (ئیدێیا یان ئایدۆس لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیزماندا بۆ فۆرم وەردەگێڕرێت).

بێگومان کاتێک پلاتۆن ئیدێیا یـان ئایدۆس بەکاردەهێنێت، ئـەوا نـەک تەنیا لە دیالۆگی 'یۆتیفرۆن'دا، بەڵکو هەروەها لە دیالۆگەکانی دیکەیدا، خۆی لە چەسپاندنی واژەیـی بـەدوور دەگرێت – بە پێچەوانەی ئەمڕۆوە لە فەلسەفەدا. ئـەو هەمیشە بـۆ هـەمـان شتێک واژەی دیکە بەکاردەهێنێت، بۆ نموونە «ئیدێی ئیمان»، «ئیمان لە خۆدا»، کرۆکی ئیمان»، «سروشتی ئیمان». پلاتۆن دەیـەوێـت بـبێژێت: ئـەوە کە بەئیمانە، لە ئیماندا بەشدارە، یان: ئەو ئەوەکەیە تەنیا بەڕێی ئیمانەوە بەئیمانە.

کەواتە گەر مرۆڤ لە شتێک بڕوانێت، ئەوجا لەو شتەدا ئەوە ببینێت کە ئیدێیە، ئەوا ئیدێ شتێکە کە بۆ مرۆڤ شیاوی بینینە. پلاتۆن لە دیالۆگی 'یۆتیفرۆن'دا دەبێژێت: ئیدێ بریتییە لە پارادیگما، لە نموونە، لە سەروێنە، کە پێویستە مرۆڤ دیدی خۆی ئاڕاستەی بکات تاکو بتوانێت جیاوازییەک بکات، لێرەشەوە ڕوونببێتەوە کە داخۆ کردارێکی تایبەتی بەئیمانە یان بەئیمان نییە.

بەم پێیە گەڕان بەدووی فۆرمێکی پێناسەدا بۆ ئیمان مەرجێکە بۆ چارەسەری ناتەباییەکەی نێوان یۆتیفرۆن و سۆکرات. گەر ئەوان لەبارەی ئیمان تەبا بوونایە، ئەوسا ئەو حاڵەتە، کە داخۆ شکاتکردن لە باوکی خۆ کردارێکی بەئیمان بێت یان نەبێت، شیاوی چارەسەر دەبوو.

## E) مەرجەکانی پرسیار لەبارەی ئیدێ

وەک بینیمان، ئەو کێشە مۆرالییە کە سۆکرات کردبووی بە بابەتی دانوستاندن لەتەک یۆتیفرۆندا، بـوو بـە پاڵهێزی پرسیار لـەبـارەی پێناسەی ڕەوشتێکی تایبەتی و پاشان هێنانی ئیدێ بۆ نێو دانوستاندنەکە. بەڵام پلاتۆن ئەم «ئیدێ»یە لە «یۆتیفرۆن»دا بەپوختی دیاری ناکات. ئاخافتن لەبارەی ئیدێی ئیمان، لە کۆنتێکستی دیالۆگی 'یۆتیفرۆن'دا، گەرەکە تەنیا جەخت لەوە بکات، کە پرسیار لـەبـارەی پێناسەی ئیمان ڕوو لە شتێکی تایبەتی دەکات و پرسیارەکەش بێواتا نییە. کاتێک ئێمە لە ئیدێ دەدوێین، ئەوا بەمە دەمانەوێت ئاماژە بۆ شتێک بدەین، کە ئێمە تەنیا دەتوانین گریمانەیەکی نزیکەیی ئەو شتە بکەین. بەڵام لێرەدا ئەم لایەنە ڕوونە: ئیدێ ئەوەیە، کە پرسیاری پێناسە وەڵامی دەداتـەوە. کێ ئیدێی ئیمان بناسێت، ئەوا واتای ئەوەش دەزانێت کە ناو دەنرێت بەئیمان. گەر ئێمە لەبارەی ئیمان بپرسین، ئەوا لێرەدا لەبارەی شتێک دەپرسین، کە نەگۆڕە، یەکە، هەروەها ناسینی زەرورییە بۆ ئەوەی بزانین چ کردارێک بەئیمانە. بەڵام ئەو پرسیارە، کە داخۆ ئەم ئیدێیانە چی بن، داخۆ شت بن، جۆرێکی

بابەت بن، ئەمە جارێ لە دیالۆگەکانی سەرەتادا دانوستان ناکرێت. بەڵام دانوستاننەکردنی ئەم پرسیارە هەڵەیەکی بنەمایی نییە. ئێمە دەتوانین لە دانوستاندنەکانماندا لەبارەی پرسیارە ئێتیکییەکان واژەی تایبەتی بەکاربهێنین، بۆ نموونە واژەی «دادپەروەری». پێدەچێت تێڕوانینێکی ئەوتۆمان هەبێت کە گۆیا لە جیهانەکەماندا دادپەروەری نییە، بەڵام سەرباری ئەمە لەو بڕوایەدا بین کە وشەی «دادپــەروەری» نیشانەیە بۆ شتێکی تایبەتی، ئەوجا گەر ئێمە بەداخەوە بین بۆ ئەوە، کە لەم ڕۆژگارانەی ئێمەدا لە هیچ جێیەک دادپــەروەری نابینرێت، ئەوا لێرەدا ڕوو لە شتێکی تایبەتی دەکـەیـن، یـان دەشێت تێڕوانینێکی ئەوتۆمان هەبێت، کە مرۆ گەرەکە لە ڕەوشێکی تایبەتیدا پشتیوانیی دادپەروەری بکات بۆ ئەوەی باڵادەست بێت، بەڵام گەر کەسێک داوامان لێبکات، کە بۆی ڕوونبکەینەوە داخۆ مەبەستمان لە دادپــەروەری چییە، ئەوسا دۆشدادەمێنین.

پرسیارەکەی پلاتۆن لەبارەی ئیدێ پێشمەرجی هەیە. یەکەم، ئیدێی ئیمان بەندە بەو پێشمەرجەوە، کە ئیدێیەک خۆی بەهایەکی ئۆبژێکتییە (ئەمە ئیمانی خەڵکە عەوامەکەی ئەسینا ناگرێتەوە). پلاتۆن لە هەموو ئەو دیالۆگانەدا کە لە ئیدێ دەدوێت، ئەم ئۆبژێکتێتییەی ئیدێی وەک پێشمەرج داناوە. بۆ نموونە پلاتۆن لە دیالۆگی «گۆرگیاس» و «کـۆمـار»دا پرسیار لـەبـارەی دادپـــەروەری دەکات و پرسیارەکە بەندە بەو گریمانەیەوە، کە دادپەوەری بەهایەکی ئۆبژێکتییە (مەوزوعیە)، واتا شتی بەداد ڕێژەییانە بەند نییە بە کولتوورێک یان گرووپێکەوە (پلاتۆن لێرەدا دژایەتیی ڕێژەگەرایی سۆفیستەکان دەکات، کە بەو پێیە بەهایەک بۆ ناوچەیەک دەشێت، بەڵام بۆ ناوچەیەکی دیکە ناشێت). دووەم: گریمانەیەکی دیکە کە بە ئەمەوە بەندە، پڕکێشەیە: کاتێک پلاتۆن لەبارەی «یەک» ئیمان دەپرسێت کە وادەکات سەرجەم کردارەکان بەئیمان بن، ئەوا لەم پرسیارەیدا لەو بنەمایەوە دەردەچێت، کە بۆ هەر شتێکی بەئیمان دیاریکراوێکی «یەکایەتی» هەیە.

(ڤیتگنشتاین نکۆڵی دەکات لە هەبوونی یەکایەتی. بۆ نموونە گەمە لە لای ئەو مۆرکی تایبەتیی هەیە: گەمە بۆ خۆشی، بۆ بردنەوە، بۆ کاتبەسەربردن).

## ٢) ڕوانگەکان بۆ ئیدێی چاکە

### A) زانین لەبارەی چاکە وەك پێشمەرج بۆ دیاریکردنی ڕەوشتەکان

مۆرکی دیالۆگەکانی سەرەتا ئەوەیە، کە ئێمە لەم دیالۆگانەدا تەنیا کاتێک دەتوانین وەڵامێک بۆ پرسیارە دەربـڕراوەکـەی پێناسە بدۆزینەوە، گەر سەرەتا چییەتیی «چاکە» دیاری بکەین. لە دیالۆگی «خارمیدێس»دا دەگوترێت: ئێمە بەبێ دیاریکردنی چاکە ناتوانین ناخسەنگینی دیاری بکەین. لە دیالۆگی «لیسیس»دا دەگوترێت: بەبێ تێگەیشتن لە چاکە نەشیاوە لە دۆستایەتی تێبگەین. دیالۆگی «یۆتیدێمۆس» داوا دەکات، کە مرۆ دەبێت سەرەتا لە چاکە تێبگات، تاکو پاشان تێبگات، کە چۆن فەیلەسوفێکی ڕاستەقینە، کە دەزانێت چاکە چییە، لە سۆفیستێک کە ئەم زانینەی نییە، جیادەبێتەوە.

بەڵام دیالۆگەکانی سەرەتا وەڵامـی پرسیارەکە

لەبارەی چییەتیی چاکە نادەنەوە. ئەم دیالۆگانە تەنیا گۆڕان بە دانانی پرسیار سەبارەت بە چاکە دەدەن و ئاماژە بۆ وەڵامێکی شیاو دەدەن. بەڵام پلاتۆن بۆ یەکەم جار لە دیالۆگی «کۆمار»دا تەواو ئاشکرا روو دەکاتە پرسی چاکە.

ئێمە دەتوانین بە نموونەی دیالۆگی «خارمیدێس» روونی بکەینەوە، کە بۆچی پرسیار لەبارەی رەوشتێکی تایبەتی دەبێت پاڵنەر بۆ پرسیار لەبارەی چاکە.

لەم دیالۆگەدا سۆکرات و خارمیدێس گفتوگۆ دەکەن. خارمیدێس گەنجێکی نزیکەی چواردەساڵانە و کێشەیەکی هەیە: زۆر جار تووشی سەرئێشەی قورس دەبێت. سۆکرات پێی دەڵێت، کە دەسوێژێک (دەرمانێک) لەدژی ئەو سەرئێشەیە دەناسێت و بریتییە لە گەڵای رووەکێک، بەڵام مەحاڵە ئەو دەرمانە سەرئێشەکەی نەهێڵێت، گەر خارمیدێس پێش وەرگرتنی دەرمانەکە دەروونی خۆی چاک نەکردبێتەوە، دەروونیش بەرێی گفتوگۆوە چاکدەکرێتەوە، چونکە دەروون بەرێی گفتوگۆوە سەنگین دەبێت، هەر ئەم سەنگینییەشە کە دەروون چاک دەکاتەوە. بەڵام بەشداریکەرێکی نێو دانیشتوان هەڵدەداتێت، کە گوایە خارمیدێس سەنگینە. ئێستا سۆکرات داوا لە خارمیدێس دەکات، بۆی روون بکاتەوە کە ناخسەنگینی چییە. خارمیدێس سێ وەڵامی شیاو دەداتەوە، بەڵام دووەم وەڵام بۆ ئێمە گرنگە. خارمیدێس دەبێژێت: ناخسەنگینی شەرمە (160 b 1 161 – 5 d). ناخسەنگینی شەرم دەخاتەوە و کێ شەرمن بێت، ئەو کەسە ناخسەنگینە.

سۆکرات بە یاریدەی تێگەی چاکە دژبێژیی ئەم تێزەی خارمیدێس دەکات. سەرەتا لە خارمیدێس رەزامەندی سەبارەت بەوە وەردەگرێت، کە ناخسەنگینی شتێکی چاکە. بەڵام دۆخگەلی ئەوتۆ هەن کە مرۆڤ تێیاندا بە شەرمەوە پەرچەکردار دەنوێنێت و شەرمەکە بۆ ئەو دۆخە نالەبارە. کەواتە شەرمنی لەم جۆرە حاڵەتانەدا شتێکی چاک نییە، بەڵکو شتێکی خراپە، پەرچەکردارێکی نەگونجاوە. بەم پێیە گەر ئەوە راست بووایە کە ناخسەنگینی شەرمە، ئەوا ناخسەنگینی هەندێک جار شتێکی خراپ دەبوو. بەڵام گەر ناخسەنگینی شتێکی خراپ بێت، ئەوسا ئەمە دەبێت بە دژبێژییەک بۆ پێشمەرجەکەی لێوەدەرچوون، کە خارمیدێس خۆی قبووڵی کردبوو. کەواتە ناشێت ئەو تێزە، کە گوایە ناخسەنگینی شەرمە، راست بێت.

(ناخسەنگینی یەکێکە لە چوار رەوشتە کلاسیکییەکە، رەوشتیش چاکترینێکە، کەواتە شتێکی چاکە).

بۆ نموونە لە دیالۆگی «لاخێس»دا سۆکرت لە ژەنەڕال لاخێس دەپرسێت، داخۆ دلێری چی بێت، ئەویش وەڵام دەداتەوە، کە دلێری شێوەیەکی جەسووریی دەروونە. بەڵام سۆکرات بەرپەرچی دەداتەوە، کە جەسووری فۆرمی جیاوازی هەیە. هەندێک فۆرمی جەسووری تەواو نەگونجاون، واتا خراپن. تەنیا جەسووریی ئاوەزمەندانە چاکە، هەر بۆیە ناشێت دلێری شێوەیەکی جەسووریی دەروون بێت (Lach. 192 b 9 – d 12).

هەروەها روویەکی دیکە بۆ تێگەیشتن لە پرسیاری چاکە پرواتایە. ئەو تێگانە کە پلاتۆن لە دیالۆگە ئاپۆریتییەکانی سەرەتادا پێناسەیان دەکات، تێگەی شتەکانن، واتا فۆرمەکانی چاک یان چاکترینن.

گەر ناخسەنگینی یان دلێری ڕەوشت بن، ئەوا تێگەیشتن لە ڕەوشت پێشمەرجێکە بۆ تێگەیشتن لێیان. کێ سەرەتا تێنەگات، کە ڕەوشت چییە، ئەوا لە ناخسەنگینی یان دلێری تێناگات. لەبەر ئەوەی ڕەوشتێک چاکێکە (شتێکی چاکە)، بەڵام چاکێک تەنیا کاتێک شیاوی تێگەیشتن دەبێت، گەر مرۆ تێبگات کە چاکە چییە، ئەوا تێگەیشتن لە وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە پێناسەی ڕەوشتێکی تایبەتی بەندە بە تێگەیشتنەوە لە چاکە. گەر مرۆ نەزانێت چاکە چییە، ئەوا نەشیاوە بزانێت کە داخۆ ڕ ە و شتێکی تایبەتی چییە.

## B) چاکە وەك دوایەمین ئامانجی سەرجەم کۆششەکان

دەروازەیـەکـی دیکە ڕووەو چاکە بریتییە لە دیالۆگی «لیسیس». پلاتۆن لەم دیالۆگەدا لەوە دەکۆڵێتەوە، کە داخـۆ دەربـڕیـن سـەبـارەت بە شتێکی چاک چی لە خۆ بگرێت (Lys. 218 c 7 – 220 b 5).

هەر شتێک ناو بنرێت «چاک»، ئەوا ئەو شتە شایانی ئەویە کۆششی بۆ بکرێت. ئەمە ئاشکرایە. گەر کەسێک لەو بڕوایەدا بێت کە ئەسپرین لەدژی سەرئێشە چاکە، ئـەوا ئـەو کەسە لە حاڵەتی سەرئێشەدا ئەسپرین قـووت دەدات. بە زمانی فەلسەفەیی ببێژین: ئەسپرین چاکێکە بۆ ئەو کەسە کە هەوڵی بۆ دەدات. تێڕوانین سەبارەت بەوە کە شتێک چاکە، بناغە دەدات بەو کۆششە کە بۆ ئەو چاکە دەکرێت. مرۆ کۆشش بۆ شتێک دەکات، چونکە لەو بڕوایەدایە، ئەو شتە کە ئەو کۆششی بۆ دەکات، چاکە و شایانی ئەوەیە کۆششی بۆ بکرێت.

بەڵام لێرەدا کێشەیەک زیت دەبێتەوە. پلاتۆن دەبێژێت: ئێمە ئامادە نین هەر شتێک کە مرۆڤ کۆششی بۆ دەکات، «بەڕاستی» بەبێ مەرج وەک چاک داینێین. گەر کەسێک دوای مەینۆشینێکی فـرەی شەوانە دەمـەو بەیانی تووشی سەرئێشە ببێت و ئەو کەسەش لەو بڕوایەدا بێت، کە سەرلەنوێ خواردنەوەی بڕێکی زۆر ویسکی چاکترین دەسوێژە



سوقرات

لەدژی ئەو سەرئێشەیە، واتا لەو بڕوایەدا بێت کە ویسکی چاکێکە لەدژی سەرئێشەکەی، ئەوا ئەو کاریگەرییە خوازراوە کە کەمکردنەوەی ناڕەحەتی و سەرئێشەکەی بەیانییە، تەنیا بەزەحمەت دێتەگۆڕێ. کەواتە ئەو کەسە لە بڕواکەیدا سەبارەت بەوە، کە چی چاکە، بەهەڵەدا چووە. ئەو شتێکی بە چاک داناوە کە چاک نییە.

هەروەها چاکە جیاوازەکان کە کۆششیان بۆ دەکرێت، بێپەیوەندی نین و بەدووی یەکتریدا دانرابن. مرۆ کۆشش بۆ هەندێک چاک دەکات تاکو بەڕێیانەوە بە چاکی دیکە بگات. بۆ نموونە ئەسپرین چاکە، چونکە بە یاریدەی ئەسپرین لەشساغی دەهێنرێتەوە گۆڕێ. هیچ کەس ئەسپرین بۆ خاتری ئەسپرین قووت نادات. ئەو بەهایە کە دەرمانێک هەیەتی، تەنیا بەو رێیەوە هەیەتی، کە ئەو دەرمانە چاکێکی دی، واتا لەشساغی، دەشێنێت. بەڵام لەشساغی بە پێچەوانەی دەرمانەوە چاکێکە، کە مرۆ چ بۆ خاتری خۆی و چ بۆ خاتری چاکی دیکە کۆششی بۆ دەکات. ئێمە کۆشش بۆ لەشساغی دەکەین، چونکە لەو بڕوایەداین کە لەشساغی بۆ مرۆڤ چاکە. بەڵام ئێمە هاوکات کۆشش بۆ لەشساغی دەکەین تاکو بە چاکی دیکە بگەین، چونکە ئێمە بەڕێی لەشساغییەوە دەتوانین شتی دیکە ئەنجام بدەین، بۆ نموونە کار بکەین. کەواتە کارکردنیش چاکێکە. بێگومان گەر کارکردن چاکێک بێت کە بۆ خاتری خۆی یان بۆ خاتری شتی دیکە هەوڵی بۆ بدرێت، ئەوا ئەمە بەندە بەو پرسیارەوە، کە داخۆ کار لە خۆدا شادیهێن بێت. بەڵام کار بۆ زۆرینەی مرۆڤان بۆیە چاکە، چونکە مرۆ بەڕێیەوە بە چاکی دیکە دەگات، بۆ نموونە پارە پەیدا دەکات. بەڵام مرۆ دەیەوێت پارە پەیدا بکات، تاکو بەڕێیەوە شیمانە بۆ شتی دیکە بڕەخسێنێت، بۆ نموونە بتوانێت گوزەرانی خێزانەکەی دابین بکات.

وەک دەردەکەوێت، چاکە جیاوازەکان بێپەیوەندی نین، بەڵکو پەیوەندییەکی تایبەتییان بە یەکترییەوە هەیە. مرۆ لە فەلسەفەدا لە پەیوەندیی «تێلیۆلۆژییانە» دەدوێت، واتا پەیوەندی رووەو ئامانجێک (تێلۆسێک). کەواتە ئامانجی نموونەکەمان بەم چەشنە دەکەوێتەوە: دەرمان رووەو لەشساغی، لەشساغی رووەو کارکردن، کارکردن رووەو پارەپەیداکردن، پارەپەیداکردن رووەو ژیاندنی خێزان.

ئایا هەتا کوێ دەتوانین لەبارەی روونکردنەوەیەک بپرسین، کە بۆچی مرۆڤ کۆشش بۆ شتێک دەکات؟ ئایا کەی وەڵامدانەوەی شیاوی پرسیارەکان کۆتایی پێدێت؟ ئایا کەسێک دەتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، کە بۆچی ئەو دەیەوێت خێزانەکەی بژێنێت؟ پلاتۆن لەو بڕوایەدایە کە پرسیار لەبارەی مەغزا و ئامانجی شتێک لە جێیەکدا کۆتایی پێدێت و لەم جێیەش بەدوواوە ناتوانین بپرسین: «بۆچی؟» (Smp 204 c 7 – 205 a 4). ئەم ئامانجە دوا ئامانجی ژیانی مرۆڤە، واتا: ژیانی چاک، بەختیار. پرسیار لەبارەی ئەوە، کە بۆچی مرۆڤ دەیەوێت ژیانێکی چاک، ژیانێکی بەختیار بژی، پرسیارێکی بێمەغزایە، چونکە لە پرنسیپەوە شیاوی وەڵامدانەوە نییە. لە نموونەکەماندا کە بۆ خۆزگەی هەبوونی خێزان هێنامانەوە، پێشبینیی خۆیی بۆ ژیانی چاک و بەختیار دەردەکەوێت. ئەم ئامانجە دوا چاکە، باڵاترین چاکە، کە مرۆ کۆششی بۆ دەکات. ئەمە دیاریکردنێکی چاکەیە، کە

بێگومان تەنیا دیاریکردنێکی فۆرماڵە (شێوەکییە) نەک ناوەرۆکیی. دیاریکردنەکە فۆرماڵە، چونکە جارێ پرسیارەکە لە رووی ناوەرۆکەوە بە کراوەیی ماوەتەوە نییە، کە داخۆ دوایەمین ئامانج، واتا چاکە، بۆ مرۆڤێکی تایبەتی چی بێت. هەروەها ئەو پرسیارەش بەکراوەیی ماوەتەوە کە داخۆ دوایەمین ئامانجێکی ئۆبژێکتییانە هەبێت، کە ئیتر لەم دوا ئامانجەوە ژیانی چاک و بەختیار بۆ سەرجەم مرۆڤان هەمان ژیان بێت. ئێمە هەروەها دەتوانین بپرسین، کە داخۆ چاکە وەک سەرجەم لە تاکە شتی تایبەتی یان لە یەککخستنی شتگەلی تایبەتی پێکهاتبێت. بەڵام پلاتۆن لەم کۆنتێکستەدا روو ناکاتە پرسیارەکە.

C) بناغەی ئەنترۆپۆلۆژییانە

ئێمە ناتوانین پرسیارەکە سەبارەت بە دوایەمین ئامانج لە رووی ناوەرۆکییەوە وەڵامبدەینەوە، گەر سەرەتا پرسیارێکی دیکە روون نەکەینەوە: پرسیار سەبارەت بەوە کە داخۆ کرۆکی مرۆڤ چی بێت.
ئێستا روودەکەینە دیالۆگەکانی قۆناغی ناوەڕاست: کۆمار، فائیدۆن، سیمپۆزیون. پلاتۆن لەم دیالۆگانەدا، بە پێچەوانەی دیالۆگەکانی سەرەتاوە، ئەوەندە کێشە و پرسیاردانان ناهێنێتە نێوەندی دیالۆگەکانەوە، بەڵکو وەڵامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە لە دیالۆگەکانی سەرەتادا کراون، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانیش «تیۆریی ئیدێکان» بەگەڕدەخات.

لەش و دەروون لە دیالۆگی «فائیدۆن»دا

پلاتۆن لە دیالۆگی جیاوازدا لەوە دەدوێت، کە مرۆڤ زیندەوەرێکی پێکهاتووە لە لەش و دەروون. دەروون ئەوەیە کە لەش لە ژیاندا دەهێڵێتەوە. دەروون پرنسیپی ژیانە.
پلاتۆن لە دیالۆگی «فائیدۆن»دا خۆی بە مەرگی سۆکراتەوە خەریک دەکات. سۆکرات لەم دیالۆگەدا روونی دەکاتەوە، کە چۆن دەروون لە ساتی مردندا لە لەش جیادەبێتەوە. ئەوە کە دەمرێت، تەنیا لەشی بمرە، بەڵام دەروون نەمرە و لە مردندا لەش جێدەهێڵێت (Phd. 63 e 8 – 69 e 4).
زۆر جار رەخنەی ئەوە لە پلاتۆن دەگیرێت، کە ئەو نوێنەرایەتیی دوالیزمی لەش- دەروون-ی کردووە و لێرەشدا فەزلی بە دەروون داوە. رەخنەگران بەتایبەتی پشت بەو دەربڕینانەی نێو دیالۆگی 'فائیدۆن' دەبەستن، کە پلاتۆن تێیاندا لەش بە زیندانی دەروون دادەنێت (Phd 82 d 9 – e 7)، ئەوجا جەخت دەکات کە دەروون لە مردندا لە زیندانەکەی رزگاری دەبێت.
تێڕوانینی سۆکرات لەم دیالۆگەدا ئەوەیە، کە فەیلەسوفێک بە شادییەوە لە مەرگ دەڕوانێت، چونکە بە درێژایی ژیانی تەنیا بە دەروونی خۆیەوە خەریک بووە، ئەوجا کاتێک دەمرێت، ئیتر بە ئامانجی ژیانی خۆی دەگات: جیابوونەوە لە لەش، لەشێک کە بە درێژایی ژیانی ئەو ئاستەنگی بۆ زانین چێکردووە.
بەڵام دەبێت لە کێشەیەک بەئاگابین: کاتێک سۆکرات لەش بە زیندانی دەروون دادەنێت، ئەوا دەربڕینەکانی لە کۆنتێکستێکی تایبەتیدان: سۆکرات ئەوەندەی نەماوە کە ژەهرەکە بخواتەوە و بمرێت. ئەو هیوادارە بە لەش بمرێت نەک بە

دەروون.
بەشە سەرەکییەکەی «فائیدۆن» تەرخانکراوە بۆ سەلماندنی نەمریی دەروون. سۆکرات لەم پەیوەندییەدا واتای لەش نزمتر لە واتای دەروون دادەنێت. بەڵام لە کۆنتێکستێکی دیکەدا، بۆ نموونە لە دیالۆگی 'سیمپۆزیون'دا، نرخاندنێکی پۆزەتیڤتر بە لەش دەبرێت. بێگومان پلاتۆن لەم دیالۆگەشدا جەخت دەکات کە لەش کرۆکی مرۆڤ نییە، بەڵکو پرنسیپێکی ناجەستەیی، دەروون، کرۆکی مرۆڤە.

## جیاوازیکردنی توانستەکانی دەروون لە دیالۆگی 'کۆمار'دا

یەکێک لە پرسیارە سەنتراڵییەکان کە پلاتۆن لە دیالۆگی 'کۆمار'دا دانوستانی دەکات و چێوەی سەرجەم دیالۆگەکە پێکدەهێنێت، ئەو تێزەیە کە تراسیماخۆسی سۆفیست نوێنەرایەتیی دەکات. بە دیدی تراسیماخۆس تەنیا کەسی بێداد دەتوانێت بەختیار بێت، بەڵام پلاتۆن بەرێی سۆکراتەوە دژەتێزی تێڕوانینەکەی ئەو رادەگەیەنێت: تەنیا کەسی دادپەروەر بەختیارە.
سەلماندنی ئەم تێزەی پلاتۆن بەندە بەو پرسیارەوە کە داخۆ دادپەروەربوون چ واتایەک بگەیەنێت، هەروەها بەندە بەو پرسیارەشەوە کە داخۆ ژیانی بەختیار چی بێت. پلاتۆن بۆ وەڵامی پرسیاری دادپەروەری گۆڕان بە مۆدێلێکی تایبەتیی دەروون دەدات، کە بێگومان هاوکات سەربەخۆ لە پرسیارەکە سەبارەت بە دادپەوەری بەواتایە.
دەروون بەپێی ئەم مۆدێلە لە سێ بەش یان سێ توانست پێکدێت، کەواتە دەروون لای پلاتۆن یەک نییە. پلاتۆن بۆ روونکردنەوەی ئەم نایەکایەتییەی دەروون نموونەی نەخۆشێک دەهێنێتەوە کە خۆی لە ناکۆکیی دەروونیدا دەبینێتەوە: ئەو تینوویەتی و دەزانێت خواردنەوە زیانی گەورەی پێدەگەیەنێت. لەبەر ئەوەی نەخۆشەکە تینوویەتی، ئەوا دەیەوێت بڕێک ئاو بخواتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەزانێت خواردنەوە زیانی پێدەگەیەنێت، ئەوا نایەوێت ئاو بخواتەوە. بێگومان لە دۆخێکدا کە یەکێک بییەوێت بخواتەوە و هاوکات نەیەوێت بخواتەوە، نەسازییەک هەیە. نەخۆشەکە خۆی لە ناکۆکییەکی ناخەکیدا دەبینێتەوە. پلاتۆن بۆ تێگەیشتن لەم ناکۆکییەی نەخۆشەکە گریمانەی دوو توانستی یان دوو بەشی جیاوازی دەروون دەکات: توانستێک لە دەروونیدا کە دەیەوێت بخواتەوە، هەروەها توانستێکی دیکە کە نایەوێت بخواتەوە. پلاتۆن یەکەم توانست ناو دەنێت توانستی ئارەزووەکان – ئەمە نزیکەی لەتەک ئەوەدا دەگونجێت کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی دەنێین رەمەکە سروشتییەکانی مرۆڤ، وەک برسێتی، تینوێتی، سێکسوالێتی. دووەم توانست بریتییە لە توانستی ئاوەز. بەڵام پلاتۆن لەم دوو توانستەوە توانستێکی دیکە دیاری دەکات، کە نزیکەی بەو شتە دەگونجێت کە ئێمە ئەمڕۆ ناوی دەنێین سۆزەکانی مرۆڤ. بۆ نموونە گەر نەخۆشەکە خۆی بخاتە ژێر رکێفی رەمەکەوە و ئاو بخواتەوە، ئەوا بەم کارە لە خۆی تووڕە دەبێت. نەخۆشەکە لەوە تووڕە دەبێت کە گوێی لە ئاوەز نەگرتووە و ئاوی خواردۆتەوە. ئێمە پێویستە ئەم تووڕەبوونە لە خۆ چ لە رەمەکەکان و چ لە ئاوەز جیابکەینەوە، چونکە نەخۆشەکە بە تووڕەبوونی هەڵوێستێک سەبارەت بە ناکۆکییە ناخەکییەکەی

نێوان ئاوەز و رەمەکەکانی وەردەگرێت.
گریمانەی سێ توانستی دەروون پێشمەرجێکە بۆ دیاریکردنی تێگەی دادپەروەری. دادپەروەریی مرۆڤێک لە ئـارادا دەبێت، گەر لە نێوان سێ بەشەکەی دەروونـدا پەیوەندییەکی راستەقینە (گونجاو) هەبێت، بەڵام تەنیا گەر هەر یەکەی سێ بەشەکەی دەروون کاری خۆی بکات، واتا هەر یەکەیان ئەوە ئەنجام بدات کە تایبەتە بە خۆی، ئەوسا مرۆ بەم پەیوەندییە گونجاوە دەگات.
کارایی تایبەت بە دەروون بریتییە لە هزرینی راست، کارایی تایبەت بە سۆزەکان بریتییە لە نواندنی پەرچەکرداری دروست، کارایی تایبەت بە رەمەکەکان بریتییە لە دیاریکردنی ژیانی مرۆڤ بە جۆر و شێوەیەکی گونجاو. بەڵام بۆ ئەوەی رەمەک و سۆزەکان بەگونجاوی پەرچەکردار بنوێنن، ئەوا پێویستە ئاوەز نەک تەنیا راست بهزرێت، بەڵکو هەروەها پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی سەروەر بێت بەسەر سۆز و رەمەکەکاندا، کە ئیتر هەر یەکەیان پابەندی ئاوەز بێت. بەڵام نابێت وا تێبگەین کە دەسەڵاتی ئـاوەز فۆرمێکی چەوساندنەوەی سۆز و رەمەکە، بەڵکو ئەم دەسەڵاتە بریتییە لە رێکخراوی سۆزمەندێتی و رەمەکێتیی مرۆڤێک. رێکخراوییەکە بۆ نموونە لەئارادا دەبێت، گەر پەرچەکردارە سۆزمەندەکانی مرۆڤ شوێن ئاوەز بکەون نەک پابەندی رەمـەک بن. گەر کەسێک نەخۆش بێت و لەبەر ئەم هۆیە نەیەوێت ئاو بخواتەوە، ئەوا پێویست نییە لەوە تووڕە ببێت کە گۆیا ئەو تەسلیمی تینێتییەکەی نەبووە، بەڵکو گەرەکە قایل بێت بە کـردارە ئاوەزمەندەکەی. تەنیا بەڕێی سەروەریی ئاوەزەوە دەشێت سۆز و رەمەکەکان بە چەشنێک رێبکخرێن کە ئیتر دەروون وەک سەرجەم بە شێوەیەکی سەنگینی بگات، واتا مرۆڤ ناکۆکیی ناخەکیی نەبێت. دادپەروەریی مرۆڤ هەروەها خۆی لە سەنگینیی ناخەکیدا دەبینێتەوە، چونکە مرۆڤێکی بەم چەشنە کە ناخێکی رێکخراوی هەیە، ناتوانێت جگە لە کرداری بەداد هیچ جۆرە کردارێکی دی بنوێنێت.
ئێستا بۆ پرسیارەکەمان لەبارەی چاکە دەگەین بەو پنتە کە واتایەکی کرۆکیی بۆ چالاکیی ئاوەز هەیە: ئاوەز توانای بۆ هزرینی راست و بۆ کاراییە رێکخراوەکەی خۆی دەبێت، گەر رووی لە شتێک، واتا رووی لە چاکە کردبێت.
تێڕوانینی پلاتۆن بۆ ئاوەز جیاوازە لە تێڕوانینەکەی سەردەمی نوێ. ئاوەز لەم تێڕوانینەی سەردەمی نوێدا ئۆتۆنۆمە، بەڵام ئاوەز بە پێچەوانەوە لای پلاتۆن توانستێکی کۆششکەرە رووەو چاکە. گەر ئاوەز کۆشش بۆ چاکە بکات، ئەوسا لەو کۆششەوە سەنگینیی بەشەکانی دەروون دەکەوێتەوە. مرۆڤ دەیەوێت ئەوە بکات کە چاکە، ئەوجا دەیکات و بەوەش کە دەیکات، شادمان دەبێت.
ئەم مۆدێلەی دەروون بە سێ توانستی دەروونەوە دەرفـەت بۆ پلاتۆن دەرەخسێنێت، کە سۆکرات ببزوێنێت بۆ ئـەوەی نەخشەی ئەرگومێنتێک دابنێت و ئەوجا پێشانی بدات، کە بۆچی تەنیا کەسی دادپەروەر دەتوانێت بەختیار بێت. کاتێک هەر بەشێکی دەروون ئەوە دەکات کە بە خۆی تایبەتە، ئیتر هەر بەشێکی دەروون و خودی دەروونـیـش وەک سەرجەم خۆیان لە باشترین دۆخی شیاودا دەبیننەوە. بەڵام خۆبینینەوە لە باشترین دۆخی شیاودا بەپوختی ئەوەیە، کە ژیانی

چاک و بەختیاری مرۆڤێک پێکدەهێنێت. مرۆ بە کۆششی دەروون بۆ چاکە بەختیار دەبێت. دەروون بەم رێیەوە رێکدەخرێت و بە سەنگینیی ناخەکی دەگات، واتا چیدی لە ناکۆکیی ناخەکیدا ناژی. ئەم سەنگینییە ناخەکییەی مرۆڤ ئەوەیە کە ژیانە بەختیارەکەی ئەو پێکدەهێنێت.

ئێمە دەبینین کە پلاتۆن لە دیالۆگی 'کۆمار'دا هەنگاوێک لەو دیاریکردنە فۆرمالەی چاکە تێپەڕدەکات کە لە دیالۆگەکانی سەرەتادا یەدیدەکرا. کاتێک چاکە لە دیالۆگەکانی سەرەتادا وەک دوایەمین ئامانجی کۆششی مرۆڤ دادەنرا، واتا وەک هاوشێوەی خودی ژیانی چاک و بەختیار، ئەوا چاکە لە «کۆمار»دا هێشتا هەر دوایەمین ئامانجە، بەڵام ئێستا نەک لە مەغزای ژیانی چاک و بەختیاردا، بەڵکو لە مەغزای شتێکدا کە پێشمەرجە بۆ گەیشتنی کەسێک بە ژیانی چاک و بەختیار. چاکە ئەو ئامانجەیە کە دەبێت ئاوەز کۆششی بۆ بکات، تاکو مرۆڤ بتوانێت ژیانێکی چاک و بەختیار بەڕێوەبەرێت.

## D) چاکە چییە؟

بەڵام ئایا چاکە چییە؟ پلاتۆن لە شەشەم و حەوتەم بەشی «کۆمار»دا روو دەکاتە ئەم پرسیارە، کۆنتێکستەکەش ئەمەیە: ئایا چۆن دەبێت دەوڵەتێکی نموونەیی (ئیدیال)، کە تێیدا دادپەروەری سەروەر بێت، بینابکرێت؟ بۆ ئەم حاڵەتە گەرەکە بەتایبەتی گرنگی بە پەروەردە و پێگەیاندنی ئەو مرۆڤانە بدرێت، کە کارایییەکانی حوکمداری و رابەرایەتی لە دەوڵەتدا وەردەگرن. پلاتۆن وا دەکات کە سۆکرات لە نێوان دوو گرووپدا جیاوازی بکات: پاسەوانان (هەروەها ژنانی پاسەوانیش) و دەسەڵاتداران (هەروەها ژنانی دەسەڵاتداریش). ئەرکی پاسەوانان ئەوەیە کە دەوڵەت لە مەترسیی دەرەکی و نێوخۆیی بپارێزن. بەڵام دەسەڵاتداران حوکمی دەوڵەت دەکەن. ئێستاش سۆکرات نوێنەرایەتیی ئەم تێزە رادەگەیەنێت: گەر دەسەڵاتداران بیانەوێت بەڕاستی دەسەڵاتداری چاک بن، ئەوا دەبێت خاوەنی زانینێکی تایبەتی بن کە دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێنێت دەسەڵاتەکەیان بە شێوەیەکی دروست و دادپەروەرانە پیادەبکەن. ئەم زانینە بریتییە لە زانینی ئیدێی چاکە. ئەوجا لەبەر ئەوەی فەیلەسوف تەنیا بە زانینی چاکە لە بەناو فەیلەسوف جیادەبێتەوە، ئەوا زانینی فەیلەسوف بەتەواوی ئەو زانینەیە کە دەبێت دەسەڵاتدار هەیبێت. بۆیە دەبێت دەسەڵاتدارانی دەوڵەتێکی نموونەیی فەیلەسوف بن، یان فەیلەسوفەکان دەسەڵاتدار بن. تێزەکەی بەشی شەشەمی 'کۆمار' کە داوا دەکات، پێویستە فەیلەسوفەکان بەهۆی ناسینی چاکەوە دەسەڵاتدار بن، دەبێت بە پاڵهێز بۆ توێژینەوە لە ئیدێی چاکە. پلاتۆن سەرەتا لایەنێک دیاری دەکات: ئەو سەرەنجامە کە روانین لە ئیدێی چاکە دەیخاتەوە، ئەوجا رەخنە لە دوو دیاریکردنی هەڵەی چاکە دەگرێت و لە کۆتاییدا بە سێ لێچواندن وەڵامێک سەبارەت بەو پرسیارە، کە داخۆ ئیدێی چاکە چی بێت، دەداتەوە.

روانین لە ئیدێی چاکە وادەکات کە هەموو شتێکی دی لە ژیاندا شیاوی بەکارهێنان و هەروەها سوودمەند بێت. بە پێچەوانەوە گەر مرۆ ئیدێی چاکە نەناسێت، ئەوسا سەرجەم زانین و

هەموو جۆرە موڵکێک بێسوودە (Rep. 505 a 4 b-1). ئێمە دەتوانین ئەم تێزە بە نموونەی بونیادی تێلیۆلۆژیانەی کۆششکردن روونبکەینەوە. کەسێک کۆشش بۆ شتێک دەکات، چونکە لەو بڕوایەدایە، ئەو شتە کە ئەو کۆششی بۆ دەکات، شتێکی چاکە، واتا یان دەسوێژێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەتی، یان ئامانجێکە کە تەنیا بۆ خاتری خۆی کۆششی بۆ دەکرێت. بەڵام شتێک تەنیا کاتێک بۆ ئەو دەبێت بە چاکێک، گەر ئەو بتوانێت لەتەک ئەو شتە کۆششبۆکراوەدا بە چاکی و دروستی مامەڵە بکات. پلاتۆن هەمیشە لەنوێوە سەرنجمان بۆ ئەوە رادەکێشێت، کە توانینی یان هەبوونی هەندێک شتی تایبەتی هیچ سوودێکی نییە گەر مرۆ نەزانێت ئەو شتانە بە چەشنێک بەکاربهێنێت، کە ئیتر سوودی راستەقینەیان بۆ ئەو هەبێت. بۆ نموونە بردنەوەی خەڵاتی یەکەم لە یانسیبێکدا هیچ سوودێکی نییە، گەر کەسی براوە نەزانێت مامەڵە لەتەک ئەو پارەیەدا بکات. گەر کەسێک نەزانێت خەڵاتی یەکەم بەچاکی و پڕواتا بەکاربهێنێت، ئەوسا خەڵاتەکە زیانی پێدەگەیەنێت نەک سوود. جگە لەوە زۆر شت لەوانە کە کەسێک دەیانزانێت، لەخۆدا نە چاکن و نە خراپ. بۆ نموونە زانینی پزیشکێک جارێ ئەو زانینە نییە کە بۆ مرۆڤانی دی یارمەتیدەر و سوودمەند بێت، چونکە مەسەلەکە بەندە بە کەسی ئەو پزیشکەوە کە چۆن زانینەکەی بەگەڕدەخات. ئەو دەتوانێت زانینی خۆی بۆ چاککردنەوەی مرۆڤ بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی زیان بە مرۆڤان بگەیەنێت. بەڵام گەر ئەو بییەوێت بە زانینی خۆی چاکە بەدیبهێنێت، ئەوسا زانینەکەی بۆ کەسانی دی یارمەتیدەر و سوودمەند دەبێت.

بەم نموونانە روونده‌بێتەوە، کە کەسێک دەبێت خاوەنی زانینێکی تایبەتی بێت، بۆ ئەوەی بە جەختی بزانێت، کە ئەو لە گریمانەکەیدا بەسەهوودا نەچووە، کاتێک ئەو شتە کە کۆششی بۆ دەکات، وەک یارمەتیدەر و سوودمەند داناوە. وەک پێشتر لە بونیادی تێلیۆلۆژیانەی کۆششکردندا بینیمان، ئەم کێشەیە نەک تەنیا هەموو تاکە چاکێک دەگرێتەوە، بەڵکو بەتایبەتی چواندنی بۆ دوایەمین ئامانج هەیە، واتا هەروەها ئەو باڵاترین چاکە دەگرێتەوە کە کۆششی بۆ دەکرێت.

پلاتۆن لە 'کۆمار'دا سۆکرات دەبزوێنێت کە پەیوەست بە ئیدێی چاکەوە رەخنە لە دوو تێز بگرێت: یەکەم تێز دەبێژێت: چاکە بریتییە لە حەز؛ دووەم تێز دەبێژێت: چاکە بریتییە لە زانین.

بە دیدی پلاتۆن ناشێت چاکە حەز بێت، چونکە حەزی خراپیش هەیە. ئەو لە 'کۆمار'دا حەزی خراپ روونناکاتەوە، بەڵام لە دیالۆگەکانی 'گۆرگیاس' و 'فیلێبۆس'دا حەزی خراپ وەک حەز لە شتی ئەوتۆ دیاری دەکات، کە نابێت مرۆ حەزی لێیان بێت (بۆ نموونە مرۆڤ حەزی لە ئازاردانی مرۆڤانی دیکە بێت)، یان وەک حەزێک کە ناحەزێکی گەورەتر بەدووی خۆیدا دەهێنێت (بۆ نموونە مرۆڤ جڵەو بۆ چیپس و شۆکۆلاتە بە چەشنێک بەر بدات کە پاشان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بچێتە دۆخی ناڕەحەتییەوە). ئێمە پێویستمان بە پێورێکە تاکو بڕیار بدەین، کە داخۆ چ حەزێک چاک و چ حەزێک خراپە، واتا چ حەزێک بۆ ژیانمان سوودمەندە و چ حەزێک بێسوودە، لێرەشەوە ئیتر ئەو دەرەنجامە دەکەوێتەوە، کە ناشێت حەز چاکە بێت، چونکە




هۆسیۆس

چاکە ئەو سەنگی مەحەکەیە کە ئێمە بەرپێیەوە حەز دەنرخێنین، نەک بە پێچەوانەوە. هەروەها ناشێت چاکە هەموو زانین و مەئریفەیەک بێت. پلاتۆن لەم حاڵەتەدا دەبێژێت، کە نەک هەموو زانینێک، بەڵکو تەنیا زانینی (یان روانین لە- و) ئیدێی چاکە دەشێت وەک کاندیدات بۆ چییەتیی چاکە وەربگیرێت.

بەڵام گەر چاکە نە حەز و نە زانین بێت، کەواتە چاکە چییە؟ سۆکرات وەڵامێک دەداتـەوە کە لە پرسیارەکە لادەدات. ئەو دەبێژێت، کە ناتوانێت چاکە دیاری بکات، چونکە هێشتا نازانێت چاکە چییە، ئەو تەنیا بۆچوونی سەبارەت بە چاکە هەیە، جگە لەوە روونکردنەوەی ئەو بۆچوونانە پێویستیان بە داڕشتنی درێژخایەن هەیە، ئەوەش ئێستا بۆ گفتوگۆکەیان ناگونجێت. ئەوجا سۆکرات درێژە بە تێبینییەکەی دەدات و رایدەگەیەنێت:

ئەو دەتوانێت شتێک لەبارەی «وەچە»یەکی چاکە ببێژێت، کە زۆر لە «بـاوک»ی خۆی دەچێت، واتـا لە خـودی چاکە. سۆکرات بەم هەڵوێستە دەپەرێتەوە بۆ سێ لێچواندنە بەناوبانگەکەی خۆر و هێڵ و ئەشکەوت، کە تێیاندا ئیدێی چاکە بە خۆر بەراورد دەکات و هەر جارە رووە جیاوازەکانی ئەم بەراوردە ئاوەڵا دەکات.

## لێچواندنی خۆر

پلاتۆن لە یەکەم لێچواندندا وێنەیەکی بناغەیی بۆ هەر سێ لێچواندنەکە دەهێنێتە نێوانەوە: وێنەی خۆر. ئەو بەم رێیەوە شیمانەیەک بۆ بەراوردکاری بە ئیدێی چاکە دەهێنێتە گۆڕێ. گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە پلاتۆن جەخت لە سێ رووی خۆر و روناکیی خۆر دەکات. یەکەم، لەبەر ئەوەی خۆر روناکی دەبەخشێنێت، ئەوا خۆر هۆیەکە بۆ ئەوە

کە ئێمە بتوانین شتێک ببینین. گەر روناکی نەبووایە، ئەوسا نەشیاو دەبوو شتێک ببینین. ئێمە بەڕێی روناکییەوە دەتوانین دەرکی بابەتەکان بکەین. دووەم، روناکیی خۆر نەک تەنیا هۆیە بۆ دیاربوونی بابەتەکان، بەڵکو هەروەها بینینی ئێمە دەشێنێت. هیچ گومانی تێدا نییە کە ئێمە دەتوانین بە چاوەکانمان ببینین، بەڵام بۆ چالاکبوونی ئەم توانستەمان پێویستمان بە روناکی هەیە. سێیەم، خۆر نەک تەنیا هۆی دیاربوون و بینینە، بەڵکو هەروەها هۆیەکە بۆ ئەوە کە زیندەوەرەکان بتوانن لەسەر زەمین پێبگەن و خۆراک وەربگرن. بەبێ روناکی و گەرمیی خۆر هیچ شتێک پێناگات، نەشیاوە ژیان هەبێت. ئەوجا: خۆر لە جیهانی ئەزموون و شیاوی دەرککردندا چ رۆڵێکی هەیە، هەمان رۆل ئیدێی چاکە لە کایەی هۆشەکیدا هەیەتی. یەکەم، چۆن خۆر بەڕێی روناکییەوە دەرفەت بۆ دەرککردنی بابەتەکان دەڕەخسێنێت، بە هەمان شێوە ئیدێی چاکە هۆیەکە بۆ شیمانەی ناسینی ئەو شتانە کە بەڕێی زەینەوە شیاوی ناسینن. دووەم، چۆن خۆر بینین چالاک دەکات، بە هەمان شێوە ئیدێی چاکە هزر چالاک دەکات. سێیەم، ئیدێی چاکە نەک تەنیا هۆی ناسینی شتەکانە، بەڵکو هەروەها هۆیەکە بۆ ئەوە کە شتەکان لەسەر زەمین ئەوە بن کە ئەوان ئەوەن.

گەرچی ئەو وێنانە کە پلاتۆن لە لێچواندنی خۆردا کاریان پێدەکات، سادە و رۆشنن، بەڵام سەربارى ئەمە تەواو روون نییە کە داخۆ پلاتۆن لە بەراوردکردنی ئیدێی چاکەدا بە خۆر بییەوێت چیمان پیشان بدات. سەرەتا روونە کە پلاتۆن بەراوردێکی روون دەکات لە نێوان کایەی شتەکانی شیاوی دەرککردن و ئەو شتانەدا کە تەنیا بەڕێی هزرەوە شیاوی ناسینن. کایەی شتەکانی شیاوی دەرککردن بریتییە لە جیهانەکەمان بە مرۆڤ و ئاژەڵ و رووەکەوە، بە خانوو و بابەتەکانەوە، بە هەموو ئەو شتانەوە کە مرۆڤ دەتوانێت بییان بینێت. ئێمە ئەم جیهانەی شتەکانی شیاوی دەرککردن ناو دەنێین جیهانی ئەزموون. بەڵام ئایا مەبەست لە کایەی ئەو شتانە چییە کە تەنیا بەڕێی هزرەوە شیاوی ناسینن؟ ئێمە لێرەدا دەتوانین بە وەڵامێکی سەرەتایی بگەین، گەر هاتوو رەچاوی ئەو شتە بکەین کە پلاتۆن لە دیالۆگە ئاپۆرێتییەکانی پێناسەدا کردبووی بە بابەتی پرسیار. ئەو لەم دیالۆگانەی سەرەتادا دەیویست «چییەتی»ی هەر تاکە رەوشتێکی تایبەتی دیاری بکات. جگە لەوە بینیمان کە پلاتۆن هەروەها دەتوانێت پرسیار سەبارەت بە پێناسەی رەوشتێکی تایبەتی بە چەشنێک دەرببڕێت کە ئیتر دەرفەتی بۆ برخسێت تاکو لەبارەی ئیدێی رەوشتەکە بپرسێت. بۆ نموونە کاتێک ئەو پرسیاری لەبارەی ئیدێی دادپەروەری کرد، ئەوا گەرەک بوو لەم پرسیارکردنەدا بۆ بەشداریکەری گفتوگۆکە روون ببێتەوە کە پرسیاری چییەتیی دادپەروەری روو دەکاتە چوونەخۆی / چڕبوونەوەی تێگەی «دادپەروەری» نەک کشانی تێگەکە. مرۆڤ ناتوانێت ئەم ئیدێیە بە چاو ببینێت، بەڵکو تەنیا دەتوانێت بە لێهزرین دیاریی بکات (لێی تێبگات – و). کاتێک ئێمە هەوڵ دەدەین لەبارەی پێناسەکە بهزرێین، ئەوا لێرەدا هەوڵ دەدەین ئیدێکە بناسین. کەواتە سەرەتا دەتوانین بڵێین: کایەی ئەو شتانە کە دەتوانین بەڕێی هزرەوە دیاریی بکەین، کایەی ئیدێی رەوشتەکانە.

پلاتۆن دەبێژێت، هەر شتێک شیاوی ناسین بێت، بەرێی چاکەوە خاوەنی بوون و کرۆکی خۆیەتی (10-Rep. 509b 6). کاتێک پلاتۆن لەم جێیەدا لە بوون و کرۆکی شتێک دەدوێت، ئەوا مەبەستی لەو شتەیە کە ئەو لە کۆنتێکستی دیکەدا ناوی دەنێت ئیدێی شتێک. کرۆک یان بوون ئەوەیە کە بە فۆرمولی پێناسە دیاری دەکرێت. بەڵام کاتێک پلاتۆن ئەم تێزە دادەنێت: 'هەر شتێک شیاوی ناسین بێت، ئەو شتە بەرێی چاکەوە خاوەنی بوونی خۆیەتی'، ئەوا لێرەدا هەنگاوێکی گرنگ لە دیالۆگەکانی سەرەتا تێپەڕ دەکات. نەک تەنیا ئیدێی ڕەوشتەکان، بەڵکو تەنانەت کرۆکی هەر شتێک، تەنیا بەرێی چاکەوە دەناسرێت.
بەڵام ئایا چۆن بتوانین روونی بکەینەوە کە بەبێ ئیدێی چاکە هیچ ناسینێک شیاو نییە و لەبەر ئەم هۆیەش ئیدێی چاکە خۆی بەسەر کرۆک و بوونەوە دەبینێتەوە؟ سەرەتا دەتوانین ببێژین: ئەوە زۆر ئاساییە کە مرۆ پێویستە بزانێت چاکە چییە، تاکو پاشان بتوانێت بزانێت کە ڕەوشتێکی تایبەتی چییە. بەڵام ئەم تێزە نائاساییە، گەر کەسێک بۆ مەئریفەی ئەو شتانەش پێویستی بە زانینی چاکە هەبێت کە هیچ پەیوەندییەکیان بە ئێتیک و مۆراڵەوە نییە. مرۆ لایەنی کەم لەکاتی جیاوازیکردنەکەی کانتەوە لە نێوان ئاوەزی تیۆریانە و پراکتیکیدا جیاوازی لە نێوان دراوی (فاکتی) ئۆبژێکتییانە و پێشبینیی بەهاییدا دەکات. زۆر جار پابەند بە کانتەوە دەگوترێت، کە پێویستە بۆ خاتری ئۆبژێکتێتیی مەئریفەی دراوەکـان (فاکتەکان) هەموو شێوەیەکی بەها وەلاوە بنرێت. مرۆ ئاماژە بۆ ئەوە دەدات کە سەرکەوتنی زانستە ئەمپیرییەکان، بۆ نموونە زانستە سروشتییەکان، بۆ ئـەوە دەگەڕێتەوە کە تـوێـژەران تەقەلا بۆ دیدێکی ئۆبژێکتییانە دەدەن، واتا بۆ دیدێکی ئازاد لە بەها. لەم روانگەیەوە پێشبینییە پابەندەکانی بەها جێیان لە توێژینەوەی ئەمپیریدا نابێتەوە. بەڵام پێویستە لێرەدا ببێژین، کە مرۆ لێرەدا زۆر جار ئەو هەقیقەتەی لەیاددەچێت کە توێژینەوەی ئەمپیریش بەندە بە پێشبینیی بەهاییەوە، ئەمەش نەک تەنیا لە رووی ئەو پرسیارەوە کە داخۆ مرۆ لە چی بتوێژێتەوە، بەڵکو هەروەها لەو رووەشەوە کە مرۆ پێوری تایبەتی بۆ بڕیاردان بەسەر تیۆرییە زانستییە جیاوازەکاندا دادەنێت، بۆ نموونە بڕیاردان بەسەر ئەو تێڕوانینەدا کە گۆیا تیۆرییەکی سادە و ناسک چاکترە لە تیۆرییەکی ئاڵۆز.
پـلاتـۆن دژی ئـەو تێڕوانینەیە کـە مەئریفەی دراوەکان سەربەخۆ لە مەئریفەی بەهایی دادەنێت، ئەو جەخت دەکات کە مەئریفەی چاکە دەرفەت بۆ ئۆبژێکتێتیی مەئریفەی دراوەکان دەڕەخسێنێت. ئاشکرایە ئەم تێزەی پلاتۆن ناتوانێت قەنائەت بە هەمووان بهێنێت، ئەمەش بەچاکی روون دەبێتەوە گەر لە دیاریکردنی ئەو شتانە بڕوانین کە مرۆڤ دروستی کردوون. گەر ئێمە بۆ نموونە بپرسین کە داخۆ مێز یان ئەسپرین چی بێت، ئەوسا دەبێت وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە کرۆکی مێز یان کرۆکی ئەسپرین هاوکات فرمان و کارایی مێز یان ئەسپرین لە خۆ بگرێت. وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە کرۆک دەبێت روونی بکاتەوە کە بۆ «چی» شتەکان سوودمەندن یان چاکن. ئێمە تەنیا کاتێک دەتوانین کرۆکی شتە دروستکراوەکان بناسین، گەر لەنێو پەیوەندییەکی تێلیۆلۆژیانەدا

ڕێکیان بخەین. مرۆڤ ناتوانێت وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە کرۆکی مێزێک بداتەوە گەر روو نەکاتە ئەو کاراییە کە مێزێک لە ژیانی رۆژانەماندا هەیەتی. یان گەر ئێمە تەنیا فۆرمولی پێکهاتەی کیمایی وەربگرین بۆ ئەوەی وەڵامی پرسیارەکە سەبارەت بە کرۆکی ئەسپرین بدەینەوە، ئەوسا لێرەدا وەڵامێکی تەواومان نەداوەتەوە، چونکە هێشتا تێنەگەیشتووین کە داخۆ دەبێت ئەسپرین چی بێت. ئەسپرین و مێز بۆ مەبەستی کاراییەک دروست دەکرێن، هاوکات گەرەکە هەردووکیان کاراییەکەیان بەدیبیهێنن. ئێمە لە کرۆکی ئەسپرین یان مێز تێدەگەین، گەر کاراییەکەیان بناسین، واتا بزانین کە شتە دروستکراوەکان بۆ 'چی' چاک-ن. بەڵام پێویستە لە تێڕوانینەکەی پلاتۆندا رەچاوی ئەم لایەنە بکەین: تێڕوانینی ئەو سەبارەت بە شتە دروستکراوەکان هاوکات چواندنی بۆ هەموو شتێکی دی هەیە. پلاتۆن لە دیالۆگی 'فائیدۆن'دا سۆکرات دەبزوێنێت تاکو ئەم تێزە روون بکاتەوە: ئێمە تەنیا کاتێک دەتوانین بەتەواوی لە شتێک تێبگەین، گەر ئێمە خودی ئەو شتە لە چاکترین حاڵەتدا یان لە گۆڕانیدا رووەو چاکترین حاڵەت وەربگرین. ئەم تێڕوانینە بەهاییە دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری تایبەتی سەبارەت بە دراوەکان (فاکتەکان). پلاتۆن ئەم نموونەیە دەهێنێتەوە: گەر یەکێک بییەوێت بزانێت کە داخۆ زەوی گۆییە یان تەخت، ئەوا دەبێت ئەو کەسە لە خۆی بپرسێت کە داخۆ بۆ زەوی چاکترە گۆیی بێت یان تەخت. ئەم پرسیارە بەندە بەو مەرجەوە کە زەوی بە چ شێوەیەک خۆی لە چاکترین حاڵەتی شیاودا دەبینێتەوە. لەبەر ئەوەی زەوی بەگوێرەی پێشبینیی ئەنتیکە سەنتەری گەردوونە، ئەوا گۆییبوون چاکترین حاڵەتە بۆ زەوی، چونکە بەڕێی گۆییبوونی زەوییەوە روون دەبێتەوە کە بۆچی زەوی ناکەوێتە خوارەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە سەنتەری گەردووندا سرەوتووە. بێگومان پلاتۆن لە 'فائیدۆن'دا بە وردی لەم کێشەیە ناتوێژێتەوە، بەڵام دەشێت ئەو نموونەیە روونی بکاتەوە کە بۆچی پلاتۆن تێڕوانینێکی بەم چەشنەی هەبوو، واتا: بەبێ مەئریفەی چاکە نەک تەنیا مەئریفەی رەوشتەکان، بەڵکو هەروەها مەئریفەی ئەمپیری و مەئریفەی کرۆکی شتەکانیش نەشیاوە.

بە کورتکراوەیی وەرگێڕاوە لە:

Michael Brodt: Platon. Freiburg im Breisgau ١٩٩٩

## فەرهەنگۆك

دیالۆگی ئاپۆرێتی: مەبەست لە دیالۆگەکانی قۆناغی سەرەتای پلاتۆنە، کە هیچ چارەسەرێک ناخەنە بەردەم، بەڵکو لە بنەمای «من دەزانم کە من هیچ نازانم»ـەوە تێڕوانینی چەسپیوی خەڵکان و فەلسەفەیی دەخەنە ژێر پرسیارەوە.

کردەکێتی: ئەوە کە بە هەر شێوەیەک بێت لەگۆڕێیە، سەربەخۆ لە هزرین، بەڵام دەشێت بە هزرین بکرێت بە ریالێتی / داکەوت.

ئۆبژێکت: (موضوع)

تێلیۆلۆژی: هۆئەنجامی.

# پێکدادانی شارستانیەتەکان

نوسینی: سامویل هانتینگتۆنگ
و. لە ئینگلیزییەوە: بەختیار رەشید
پێداچونەوەی: هێرش کەریم

[شێوازی داهاتوی ململانێ ]

دونیای سیاسەت پێدەنێتە قۆناغێکی نوێوە و، رۆشنبیرانیش بێ هیچ دوودڵییەک پەرەیان بە چەندین دیدگا داوە بۆ وێناکردنی ئەوەی کە ئایا دونیای نوێ بە چ شێوازێک دەبێت، لەوانە بانگەشەکردنی کۆتایی مێژوو، گەڕانەوەی کێبرکێی سونەتی نێوان دەوڵەت نەتەوەکان و، کالبونەوەی دەوڵەت نەتەوەکان لەژێر کاریگەری ململانێی خێڵایەتی و جیهانگیری، هەریەک لەم دوو دونیا بینیە لە پاڵ بۆچوونەکانی تریش، تەنها دیوێکی راستیەکانیان پیشانداوە، سەرباری ئەوەش هەموویان رووبەکی گرنگ و لە راستیدا بنچینەییان لەبەر چاو نەگرتووە لە پێشبینیکردنی ئەوەی کە دونیای سیاسەت لە چەند ساڵی داهاتوو چۆن دەبێت.

گریمانەی من ئەوەیە سەرچاوەی سەرەکی ململانێ لە دونیای نوێدا ململانێی ئایدیۆلۆجی، یاخود ئابوری نابێت , بەڵکو دابەشبونی گەورەی نێوان مرۆڤایەتی و، کەلتور سەرچاوەی سەرەکی ململانێکانن. دەوڵەت نەتەوەکان وەک بەهێزترین کارەکتەر رۆڵ لە کاروبارەکانی جیهان دەگێڕن، بەڵام گرنگترین

**سەرکەوتنی ئابوریە هەرێمایەتییەکان لەلایەکەوە هێز دەداتەوە بەر ئاگایی شارستانی و، لەلایەکی تریشەوە پێدەچێت تەنها ئەو بلۆکە هەرێمایەتییانە سەربکەون کە لەسەر بنەمای هاوشارستانیبوون بنیات نراون،**



ساموێل هانتینگتۆنگ

ململانێکانی دونیای سیاسەت لە نێوان ئەو گروپ و نەتەوانە ڕوو دەدات کە سەر بە شارستانیەتیە جیاوازەکانن، وە ململانێی شارستانیەکان زاڵ دەبێت بەسەر جیهانی سیاسەتدا. هێڵەکانی سنوری (تەماس) نێوان شارستانیەتیەکان لە ئایندەدا دەگۆرێت بۆ بەرەکانی جەنگ. ململانێی نێوان شارستانیەتیەکان دەبێت بەدوا قۆناغی پەرەسەندنی ململانێ لە دونیای مۆدێرندا. پاش ڕێکەوتننامەی وێسڤێلا و, هاتنە ئارای سیستەمی نێودەوڵەتی مۆدێرن، بۆ ماوەی سەدە و نیوێک ململانێ لە دونیای خۆرئاوادا زیاتر لە نێوان, میر و, ئیمپراتۆر, شانشینی ڕەها و، شانشینی دەستوریدا بوو. کە هەر لایەکیان لە هەوڵی فراوانکردنی بیرۆکراسیەت, سوپا و, بەهێزکردنی بازرگانیەکەیاندا بوون، لە هەموو گرنگتریش فراوانکردنی ئەو ناوچانە بوو کە دەیانبردن بەڕێوە. لەم پرۆسەیەدا دەوڵەت نەتەوەیان دروستکرد و، سەرەتاش لە شۆڕشی فەرەنسیەوە دەستیپێکرد، کە هێڵی بنچینەیی ململانێکان لە نێوان نەتەوەکاندا بوو جیاواز لەوەی پێشوتر کە ململانێکان لە نێوان میر و ئیمپراتۆریەکاندا بوو، وەک ئەوەی ( ر.ر. پالمەر ) دەڵێ «شەڕی پادشاکان کۆتایی پێ هات, جەنگی گەلانیش دەستی پێکرد». ئەم شێوازەی ململانێ بەردەوام بوو تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم. دواتر و لە ئەنجامی شۆڕشی کۆمۆنیستەکانی روسیا و، کاردانەوەکان لە دژی ئەو شۆڕشە، ململانێی نێوان نەتەوەکان گۆڕا بۆ ململانێی ئایدیۆلۆجی، لە سەرەتادا لە نێوان کۆمۆنیزم، نازیزم- فاشیزم و، لیبڕال دیموکراسی، دواتریش لە کاتی جەنگی ساردا لە نێوان کۆمۆنیزم و لیبڕال دیموکراسیدا بوو. ململانێی دووەمیان لە نێوان دوو زلهێزی جیهاندا بەرجەستە بوو, کە هیچ یەکێکیان دەوڵەت نەتەوە نەبوون بە مانا ئەورپیە کلاسیکیەکەی و، هەریەکەشیان پێناسەی شوناسی خۆی بە گوێرەی بنەما ئایدیۆلۆجیەکەی دەکرد.

ئەو ململانێیانەی کە لە نێوان میرەکان و، دەوڵەت نەتەوەکان و، ئایدیۆلۆجیەکان روویدا، بە شێوەیەکی گشتی ململانێی نێوخۆیی شارستانیەتی خۆرئاوا بوو، یاخود «شەڕی ناوخۆی خۆرئاوا» بوو وەک ئەوەی [ ولیام لند] ناوی ناوە, ئەم وتەیە دروستە بۆ پۆلێنبەنکردنی ململانێکانی سەدەکانی حەڤدە و, هەژدە و, نۆزدە, بەهەمان شێوەش هەردوو جەنگی

جیهانی , بەهەمان شێوەش جەنگی سارد , بەڵام لەگەڵ کۆتای هاتنی جەنگی ساردا سیاسەتی نێودەوڵەتی بەرەو دەرەوەی قۆناغە خۆرئاواییەکەی دەجولێ و، چەقی شارستانیەتی خۆرئاوا دەبێتە جێی بەرخوردی نێوان خۆرئاوا و شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکان. لێرە بەدواوە لە سیاسەتی شارستانیەتیەکاندا گەل و، حکومەتی شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکان بابەتی مێژوو نین، وەک ئامانجێکی کۆلۆنیالیزمی خۆرئاوا، بەڵکو شانبەشانی خۆرئاوا دەست دەکەن بە جوڵاندن و نەخشاندنی مێژوو.

## [سروشتی شارستانیەتیەکان]

لە کاتی جەنگی ساردا جیهان دابەشکرابوو بۆ سێ بەش: ئەوانیش جیهانی یەکەم، جیهانی دووەم , جیهانی سێیەم، بەڵام ئەو دابەشکارییە بۆ ئێستای جیهان بێ سودە، باشتر وایە پۆلینکردنی وڵاتان بەگوێرەی کەلتور و لێکنزیکی شارستانیەتی بن , نەک بە پێوەری ئاستی گەشەی ئابوری و , سیستەمە سیاسی و، ئابورییەکان ریز بکرێن.

ئێمە مەبەستمان چیە کاتێک قسە لەسەر شارستانیەتیەکان دەکەین؟ شارستانیەت بریتییە لە قەوارەیەکی کەلتوریی، گوند , هەرێم , گروپە دینیەکان، هەموویان کەلتورێکی جیاوازیان هەیە لە ئاستە جیاجیاکانی کەلتوریدا، کەلتوری لادێیەک لە باشوری ئیتاڵیا دەکرێ جیاواز بێت لە لادێیەک لە باکوری ئیتاڵیا، بەلام هەردووکیان بەشدارن لە کەلتوری هاوبەشی وڵاتەکەیان کە جیایان دەکاتەوە لە گوند نشینەکانی ئەڵمانیا. کۆمەڵگای ئەوروپیش بە نۆبەتی خۆیان هاوبەشن لە کۆمەڵێ ئەدگاری کەلتوری کە جیایان دەکاتەوە لە عەرەبەکان، یاخود لە کۆمەڵگەی چینی. هەر بۆیە عەرەبەکان , چینیەکان , خۆرئاواییەکان بەشێک نین لە قەوارەیەکی بەرفراوانتری کەلتوری، بەڵکو بۆ خۆیان شارستانیەتێکی جیا پێکدەهێنن، هەر بۆیە شارستانیەت باڵاترین رێکخستنی کەلتوری گەلانە و بەرفراوانترین ئاستی شوناسیشە.

شارستانیەت بەهۆی کۆمەڵێ ئامرازی بابەتی هاوبەشەوە پێناس دەکرێت وەک زمان , مێژوو , دین , نەریت، دامەزراوە ( ئاینی , سیاسی , کۆمەلایەتی , هتد.... و. کوردی) و، لە لایەنی خودییەوە وەک پێناسەکردنی شوناسی خودە لەلایەن گەل یاخود تاک خۆیەوە.

مرۆڤ بە چەند ئاستێکی جیاواز شوناسی خۆی دەناسێنێت، بۆ نمونە دانیشتویەکی شاری رۆما بەم شێوەیە پێناسەی خۆی دەکات , لە پێشدا رۆماییەک، پاشان کاسۆلیکێک، مەسیحیەک , ئەوروپیەک، لە کۆتایشدا خۆرئاواییەک. ئەو شارستانیەتیەی کە ئەو تاکە ئیتاڵیەی بۆ دەگەرێتەوە فراوانترین شوناسە کە بە جدییەوە خۆی پێدەناسێنێ. سەرباری ئەمەش ئینسانەکان دەتوانن دووبارە پێناسەی شوناسی خۆیان بکەنەوە و، لە ئەنجامی ئەمەش پێکهاتە و سنوری شارستانیەتیەکان دەگۆرێن.

شارستانیەتێک دەکرێ ژمارەیەکی زۆر گەورەی خەڵک بگرێتەوە وەک ئەوەی کە لە چیندا هەیە، (لوسیان پیا) پێی دەڵێ: (شارستانیەتێک کە خۆی لە شێوەی دەوڵەتێک نمایش دەکات) و، یاخود ژمارەیەکی زۆر کەمی خەڵک بگرێتەوە، وەک ئینگلیزی زمانەکانی ناوچەی کاریبی، دەشکرێت لە چەندین دەوڵەت نەتەوە پێکبێت وەک شارستانیەتی خۆرئاوا، شارستانیەتی عەرەبی، هەروەها ئەمریکای لاتین، یاخود دەکرێت تەنها لەیەک دەوڵەت پێکبێت، بەنمونە وڵاتی یابان. ئاشکرایشە شارستانییەتەکان تێکەڵ دەبن و دەچن

بەسەر یەکتریدا، دەکرێت شارستانیەتیەکان لەناو سنوری خۆیاندا لە چەندین نیمچە شارستانیەتی بچوکتر پێکهاتبێت، لە نمونەی شارستانیەتی خۆرئاوا کە لە دوو نیمچە شارستانیەتی سەرەکی پێکدێت، ئەوانیش ئەمریکای باکور و ئەوروپایە (نوسەر زیاتر مەبەستی ناوەڕاست و خۆرئاوای ئەوروپایە , و. کوردی)، هەرچی شارستانیەتی ئیسلامیشە پێکدێت لە چەند نیمچە شارستانیەتێک، وەک عەرەبی، تورکی و، مالایی.

سەربارى ئـەوەى هێڵەکانی تەماسی نێوانیان بە دەگمەن ڕوون و بەرچاون، بەڵام واقعین و هەرچۆنێک بێت شارستانیەتیەکان کۆمەڵێ قەوارەی مانادار و بزێون، بەردەوام لە هەڵکشان و داکشان و , دابەشبون و دەرکەوتندان، ئەوانەی ئاگاداری مێژوون باش دەزانن کە شارستانیەت قابیلی لەناوچوونە، هەندێکیان وەکو جەستەیەکی مردوو لە بیابانی کاتدا دەنێژرێن. ئەوە چەندین سەدەیە کە خۆرئاواییەکان خواستیان لەسەر ئەوەیە کە دەوڵـەت نەتەوە گرنگترین کارەکتەری کاروباری نێودەوڵەتی بێت و، هەر بەم شێوەیەش بـووە. فراوانترین ئاستی دەسـتـڕەس بە مێژووی مرۆڤایەتی بریتیە لە مێژووی شارستانییەکان. ( ئارنۆلد تۆینبی) لە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویدا بیست و یەک شارستانیەتی سەرەکی دیاریدەکات کە تەنیا شەشیان لە دونیای هاوچەرخدا بونیان هەیە.

## [بـــۆچـــی شـــارســـتـــانـــیـــەتـــیـــەکـــان بـەیـەکدادەدەن؟ ]

تادێت گرنگی شوناسی شارستانیەتیی زیاتر دەبێت و, شێوەی جیهان لە ئایندەدا تا ڕادەیەکی زۆر بەهۆی بەریەککەوتنی نێوان ئـەو حـەوت یاخود هەشت شارستانیەتیە سەرەکیەوە دیاریدەکرێت کە بریتین لە شارستانیەتیەکانی: خۆرئاوا، کۆنفۆشیەس، یابانی، ئیسلامی، هیندۆیزم، سلاڤیک- ئۆرسۆدۆکس، ئەمریکای لاتین و، لەوانەیە شارستانیەتی ئەفریقیش، هەرە گرنگترین ململانێکانی ئایندەش بەدرێژایی ئەو هێڵە کەلتوریە جیاوازانە ڕوودەدات کە لەیەکتریان جیا دەکاتەوە.

## بۆ دەبـێ دۆخـەکـە بـەو شێوەیـە بێت؟

یەکەم: جیاوازیەکانی نێوان شارستانیەتیەکان بە تەنها واقعی نین، بەڵکو بنەڕەتین. شارستانیەتیەکان لە یەکتری جیادەکرێنەوە بەهۆی مێژوو، زمان، کەلتور، نەریت و، لەهەمووشی گرنگتر ئاینە. گەلانی شارستانیەتیە جیاوازەکان دید و بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربـارەی پەیوەندی نێوان خـودا و مرۆڤ، تاکو کۆمەڵگا، هاوڵاتی و دەوڵـەت، منداڵ و دایک و باوک، ژن و مێرد، ماف و بەرپرسیاریەتی، ئازادی و دەسەڵات، یەکسانی و هایەرکیەت ( هەرەمیەت )، ئەم جیاوازیانەش بەرهەمی سـەدان ساڵە بۆیە چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت بەمزوانە لەناو بچن و، لە جیاوازیە سیاسی و ئایدیۆلۆژیەکان زۆر بنچینەیی ترن. هەرچەندە بەدرێژایی چەندین سەدە جیاوازیە شارستانیتییەکان بوە بەهۆی هەڵگیرسانی هەرە توندوتیژترین و، هەرە درێژخایەنترین ململانێکان، بەڵام بونی جیاوازی بە واتای بوونی ململانێ نایەت و، بوونی ململانێش یەکسان نیە بە بوونی توندوتیژی.

دووەم: جیهان تادێت بچوکتر دەبێتەوە، ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیـاد بوونی بەریەککەوتنی نێوان شارستانیەتیە جیاوازەکان , لە ئەنجامی ئەمەشدا ئاگایی تاک بە شارستانیەتی خود و جیاوازیەکانی نێوان شارستانیەت و، کۆمەڵگا جیاوازەکان بەهێزتر دەبێت، بۆنمونە کۆچی خەڵکانی باکوری ئەفریقا بۆ فەرەنسا

بووه بەهۆی دروستبونی ڕقی فەڕەنسییەکان، بەڵام لە هەمانکاتدا بووە بەهۆی زیادبوونی ڕێز بۆ پەنابەرەکان لەلایەن جەمسەرە کاسۆلۆکیە ئەوروپیە «باشەکان»، یاخود کاردانەوەی نەرێیانەی ئەمریکییەکان بەرامبەر سەرمایەگوزاری یابان بە بەراورد لەگەڵ سەرمایەگوزاری کەنەدی و ئەوروپییەکان. بەهەمان شێوەش (دۆناڵد هرتز) ئەوەی دەستنیشان کردووە کە چۆن ئیبۆیەک کە دەکرێ ئیبۆیەکی ئۆوێری بێ، یاخود ئیبۆیەکی ئۆنتشایی لە هەرێمێکی ڕۆژهەڵاتی نەیجیریا، ئەو لە لاگۆسوەک ئیبۆیەک لێی دەرواندرێت، ( لاگۆس پایتەختی نەیجیریایە، و. کوردی) و، لە لەندەن وەک نەیجیرییەک، لە نیویۆرکیش وەک ئەفریقیەک. بەرخوردی نێوان گەلانی شارستانیەتیە جیاوازەکان دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاگایی شارستانیەتی خەڵک، ئەمەش بە نۆبەتی خۆی هێز دەدات بە جیاوازی و رکەبەرایەتیەکان کە درێژبوونەتەوە بە قوڵایی مێژوودا یاخود دەیەوێت درێژبێتەوە .

سێیەم: پرۆسەی مۆدیرنیزەکردنی ئابوری و، گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتییەکان لە تەواوی جیهان دەبێتە هۆی لێکردنەوەی مرۆڤ لەو شوناسە لۆکاڵیەی کە دەمێکە هاوەڵیەتی و، هەروەها دەبێتە هۆی لاوازبوونی شوناسی نەتەوەیی وەکو سەرچاوەیەکی تری شوناسی تاک. لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا دین کەوتوەتە بزاوت بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە بەهۆی لاوازبوونی شوناسەکانی ترەوە هاتوەتە ئاراوە، بەزۆریش لە شێوەی بزوتنەوەی جیاجیا دەردەکەون کە بە «فەندەمێنتاڵیزم» ناوزەد دەکرێن , نمونەی ئەم جۆرە بزوتنەوانە دەتوانرێت لە ناو خۆرئاوای مەسیحیەت، جودایزم، هیندۆیزم و، دونیای ئیسلامیشدا بدۆزرێنەوە. لە زۆربەی ئاین و، وڵاتەکاندا ئەوانەی لەم بزوتنەوە فەندەمێنتاڵیانە کاردەکەن و، چالاکن بەتەمەن گەنجن، کە دەرچووی زانکۆ، تەکنیککاری چینی ناوەڕاست، کەسانی پرۆفیشناڵ و، بازرگانەکانن، هاوشێوەی ئەوەی ( جۆرج ویگڵ ) پێیوایە «نا عەلمانیکردنی دونیا یەکێکە لە هەرە زاڵترین حەقیقەتە کۆمەڵایەتیەکانی ژیان لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا» و، (گلێس کێپڵ) بە « دووبارە بوژانەوەی ئاین» ناوی دەبات، کە بنچینەی شوناس و، ئیلتیزاماتێک فەراهەم دەکات بەشێوەیەک کە سنوری نەتەوە تێدەپەڕێنێت و، شارستانیەتێک یەکدەخات.

چوارەم: گەشەی ئاگایی شارستانی بەهۆی ڕۆڵی دوولایەنەیی خۆرئاواوەیە، چونکە لە لایەکەوە ئێستا خۆرئاوا لە لوتکەی دەسەڵاتدایە، لە لایەکی ترەوە، پێدەچێ بەرئەنجامی ئەم باڵادەستیەی خۆرئاوایە، ئەوەی کە ئێستا لە شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکاندا ڕوودەدات بە گەڕانەوە بۆ ڕەگی دیاردەکان، ڕۆژانە ئەو دەنگانە لە زیادبونن کە داوای گەڕانەوە دەکەن بە ناوخۆدا، لە نمونەی بە ئاسیایکردنەوەی یابان، بە هیندۆزیکردنەوەی هند و، هەروەها بەهۆی سەرنەکەوتنی ئایدیۆلۆجیا خۆرئاواییەکانی وەک ناسیۆنالیزم و، سۆسیالیزم، لێرە بەدواوە دوبارە بە ئیسلامیکردنەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و، ئێستاش مشتومڕە لەسەر بە خۆرئاوایکردن، بەرامبەر بە ڕوسیایکردنەوەی وڵاتەکەی یێلسندا.

ئێستا خۆرئاوای باڵادەست، لە ڕووبەڕوبوونەوەیەکی بەردەوامدایە لەگەڵ نا خۆرئاواییەکان کە ئارەزوو و، ویست و، سەرچاوەیان لە زیادبوندایە بۆ شەکڵدانی جیهان بە شێوەیەکی نا خۆرئاواییانە. پێشتر پێشەوا و، نوخبەی کۆمەڵگا ناخۆرئاواییەکان لە خەڵکی ئاسایی وڵاتەکانیان زیاتر کاریگەربوون بە خۆرئاوا، لە زانکۆکانی سۆربۆن، ئۆکسفۆرد، یاخود سانت

هێرست، خوێندنیان تەواو دەکرد و، بەهاو نەریتی خۆرئاوایان دەگرتە خۆ، لە هەمان کاتیشدا خەڵکانی ئاسایی ئەو وڵاتە ناخۆرئاواییانە لە ژیانێکی ئاساییدا دەژیـان، کە بە قووڵی لە ژێر کاریگەری کەلتورە خۆماڵیەکەیاندا بوون، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئیستا ئەم پەیوەندییە ئاوەژوو بوەتەوە، بە شێوەیەک کە لەلایەکەوە پرۆسەی بە خۆماڵیکردنەوە و ناخۆرئاوایکردنی نوخبەی ئەو وڵاتانە ڕوودەدات و، لە لایەکی تریشەوە کەلتوری خۆرئاوا، بە تایبەتی شێوازە ئەمریکییەکەی لە ناو کۆمەڵگای ئەو وڵاتانەدا لە پەرەسندندایە.

پێنجەم: ئەدگار و تایبەتمەندییە کەلتورییەکان کەمتر هاوبەش و، دوولایەنن، هەر بۆیە بە ئاسانی سازشیان لە سەر ناکرێت و، سەختتر چارەسەر دەکرێن بە بەراورد بە ناکۆکیە سیاسی و ئابورییەکان. دەکرێت پێشبینی ئەوە بکەین کە کۆمەنیستێک ببێت بە کە سێکی دیموکرات، یاخود هەژارێک ببێت بە دەوڵەمەند و، بە پێچەوانەشەوە ڕاستە، بەڵام ناکرێت چاوەڕێی ئەوە بکەین کە ڕوسێک ببێت بە ئەستۆنی، یاخود ئازەرییەک ببێت بە ئەرمەنی.

لە ململانێی چینایەتی و، ئایدیۆلۆجیدا پرسیاری هەرە گرنگ ئەوە بوو، تۆ لایەنگری کام تەرەفیت؟ خەڵکیش دەیتوانی لایەنی پەسەندی خۆی هەڵبژێرێت، هەندێ جار بیشیگۆڕێت، بەڵام لە ململانێی شارستانیەتیەکاندا پرسیارەکە ئەوەیە , تۆ چیت؟ کە ئەوەش پێدراوە و، ناتواندرێت بگۆڕدرێت , هەر وەکو ئەوەی ئاگادارین کە لە بۆسنە و، قەوقاز لەوێشەوە بۆ سودان، وەڵامێکی نادروستی ئەم پرسیارە لەوانەیە ببێتە فیشەکێک و بینێن بە نێو چاوانتەوە. لە جیاکردنەوەی گەلان لە یەکتری ڕۆڵی ئاین لە ڕەگەز کاریگەرترە، بۆنمونە ئەکرێ کەسێک لە یەککاتدا نیوەی عەرەب بێت و، نیوەکەی تری فەڕەنسی، یاخود هەڵگری ڕەگەزنامەی دوو وڵات بێت، بەڵام زۆر زەحمەتە بتوانیت نیوەت موسڵمان بێت و نیوەکەی ترت مەسیحی.

شەشەم: ئابورییە هەرێمایەتییەکان لە پەرەسەندندان , ڕێژەی گشتی بازرگانی هەرێمایەتی لە ئەوروپا لە نێوان ساڵانی ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٩ لە ٥١٪ بەرزبوەتەوە بۆ ٥٩٪ و، لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاش لە ٣٣٪ بەرزبووەتەوە بۆ ٣٧٪ و، ئەمریکای باکوریش لە ٣٢٪ و، بۆ ٣٦٪، وە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت گرنگی بلۆکی ئابوری هەرێمایەتی زۆر زیاتر بێت لە ئایندەدا.

سەرکەوتنی ئابوریە هەرێمایەتییەکان لەلایەکەوە هێز دەداتەوە بەر ئاگایی شارستانی و، لەلایەکی تریشەوە پێدەچێت تەنها ئەو بلۆکە هەرێمایەتییانە سەربکەون کە لەسەر بنەمای هاوشارستانیبوون بنیات نراون، بۆ نمونە سەرکەوتن و مانەوەی کۆمەڵگەی ئەوروپی بەهۆی بناغە هاوبەشە کەلتوری و مەسیحایەتیەکەی خۆرئاواوەیە , یاخود سەرکەوتنی ناوچەی بازرگانی ئـازادی ئەمریکای باکور، بەندە بەو پێککەیشتنە کەلتورییەی کە ئیستا لە نێوان مەکسیک , ئەمریکا و، کەنەدا لە ئارادایە. لە بەرامبەر ئەمەدا یابان بەهۆی جیاوازیە کەلتوریەکانەوە ڕووبەڕووی گەلێک سەختی دەبێتەوە لە بنیاتنانی قەوارەیەکی ئابوری هاوشێوە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، چونکە یابان خاوەنی کۆمەڵگا و شارستانیەتێکی تایبەت بە خۆیەتی، هەرچەندە بازرگانی و سەرمایەگوزاریەکی بەهێز یابان ببەستێتەوە بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە، بەڵام جیاوازییە کەلتوریەکەی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا ڕێگرە لە بەردەم بەرزکردنەوەی ئابورییە هەرێمایەتیەکەی بۆ ئاستی یەکخستن وەک ئەوەی کە لە ئەوروپا و ئەمریکای باکوردا هاتوەتە ئاراوە.

لە بەرامبەردا کەلتوری هاوبەش بە ڕوونی کارئاسانی

دەکات لە فراوانبوونی خێرای بازرگانی نێوان چین و، هۆنگ کۆنگ و، تایوان و، سەنگاپور، هەروەها هەموو ئەو کۆمەڵگا چینیانەی کە لە وڵاتانی تری ئاسیادا دەژین. لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی سارددا هاوبەشی کەلتوری تادێت زیاتر بەسەر جیاوازییە ئایدیۆلۆجیەکاندا زاڵ دەبێت، بۆ نمونە چین و تایوان کە لە نزیکبونەوەی بەردەوامدان لە یەکتری.
ئەگەر بڕیارە کەلتوری هاوبەش پێشمەرجی یەکخستنی ئابوری بێت، پێدەچێت چەقی گرنگترین بلۆکی ئابوری رۆژهەڵاتی ئاسیا بکەوێتە چینەوە. بێ گومان ئەو بلۆکە پێش ئەو کاتەش دێتە بوون، وەک ئەوەی ( مورای وەیدنباوم) سەرنجی داوە :
«ســـەرەڕای هـەژمـوونـی ئیستای یـابـان بەسەر ناوچەکەدا، بـەڵام ئابوری ئاسیای پشت ئەستور بە چین بەخێرایی لە دەرکەوتندایە وەک ناوەندێک بۆ پیشەسازی، بازرگانی، هەروەها دارایـی. ئەم ناوچە ستراتیجیە بڕێکی باش تەکنەلۆجیا و توانای پیشەسازی تێدایە، تایوان وڵاتێکی دەرکەوتوی پشت بەخۆبەستووە، کارامەیە لە دروستکردنی بڕیارەکانی بازاڕ و خزمەتگوزاریدا، هۆنگ کۆنگ، تۆڕێکی گەیاندنی باشە، سەنگاپور، جەمسەرێکی گەورەی سەرمایەی داراییە، هەرسێکیشیان پێدراوێکی گەورەی خاکیان هەیە لەگەڵ سەرچاوەی سروشتی و دەستی کاردا، ( وڵاتی سەرەکی چین)..... لە ناوچەی جانگزهووە وە بۆ سەنگاپور، لە کوالا لامپورەوە بۆ مانێلا، ئەم تۆڕە کاریگەرە بەزۆری لەسەر بنەمای فراوانبونی خێزانی کە وەک بڕبڕەی پشتی ئابوری خۆرهەڵاتی ئاسیا وەسف دەکرێن».
هەروەها کەلتور و، ئاین بنەمای پێکهێنانی رێکخراوە ئابورییە هاوبەشەکانن، هەرئەمەش بووە بە هۆی پێکەوە گرێدانی ١٠ وڵاتی ئیسلامی ناعەرەبی لەوانە: ئێران، پاکستان , تورکیا، ئازەربایجان، کازاغستان، قیرخزستان، تورکمەنستان، تاجیکستان، ئۆزبەکستان، هەروەها ئەفغانستان، ئەمیش وەک هەوڵێک بۆ دوبارە بوژاندنەوە و، فراوانکردنی ئەم رێکخراوە کە لە شەستەکانەوە بە دەستپێشخەری تورکیا , ئێران و , پاکستان دامەزراوە , ئەمیش لە ئەنجامی دەرککردنی سەرکردەکانی ئەم وڵاتانە بەو ڕاستیەی کە هیچ چانسێکی قبوڵکردنیان نیە لە کۆمەڵگای ئەوروپی، بە هەمان شێوەش بـازاڕی هاوبەشی ئەمریکای ناوەڕاست ( کاریکۆرم) , کە لەسەر بناغەی کەلتوری هاوبەش بنیاتنراوە. هەروەها تا ئێستا هەوڵەکان بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی ئابوری فراوانتری ناوچەی کاریبی-ئەمریکای ناوەڕاست، بۆ پێکەوەگرێدانی نێوان لاتین- ئەنگلۆ هەر چۆنێک بێت شکستی خواردووە.
کاتێک گەلان بۆ پێناسەکردنی شوناسی خۆیان پەنا بۆ دەستەواژە دینی و، ئیتنیەکان دەبـەن , ئیدی ئەوان «ئێمە»یەک دەبینن بەرامبەر «ئەوان»ێک لە پەیوەنیەکانی خۆیان لەگەڵ گەلانی سەر بە ئیتنوئاینە جیاوازەکانی تـردا. کەوتنی ئەو دەوڵەتانەی کە ئایدیۆلۆژیان کردبوو بە پێناسەی خۆیان لە خۆرهەڵاتی ئەوروپا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو هەلی ڕەخساند بۆ هاتنە پێشەوەی شوناسە نەریتیەکان و ڕکابەرایەتی ئیتنیەکان. جیاوازییە کەلتوری و دینیەکان دەبێتە هۆی دروستبونی جیاوازی لەسەر کێشە سیاسیەکان هەر لە مافی مرۆڤەوە بیگرە تا دەگاتە دیاردەی کۆچ و، بازرگانی و، ژینگە، لەگەڵ ئەویشدا نزیکایەتیە جوگرافیەکان دەبیتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی ململانێ لەسەر خاک هەر لە بۆسنەوە تادەگاتە منداناو.
لە هەمووی گرنگتر ئەو هەوڵانەی رۆژئاوایە بۆ برەودان بە بەهاکانی خۆی وەک دیموکراسی و لیبراڵیزم کە ئەیەوێت وەک بەهای گەردونی بناسرێنەوە، ئەمەش

وەکو هەوڵێکە بۆ پاراستنی باڵادەستیە سەربازیەکانی و، گەشەدان بە بەرژەوەندییە ئابوریەکانی , کە ئەمەش کاردانەوەی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە لەلایەن شارستانیەتیەکانی ترەوە .
تا چەند وڵاتان و گروپەکان توانایان کەم بێتەوە لە فەراهەمکردنی کۆمەک و دروستکردنی هاوپەیمانێتی لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆجی، هێندە هەوڵەکانیان چڕدەکەنەوە بۆ بەدەستهێنانیان لە ڕێگەی پەنابردن بۆ شارستانیەت و دینی هاوبەش. پێکدادانی شارستانیەتیەکان لەسەر دوو ئاست ڕوودەدات، لەسەر ئاستی بچوک گروپە هاوسنورییەکان بەدرێژایی هێڵە سنوریەکانی نێوان شارستانیەتیە ململانێکارەکان ڕوودەدات بە زۆری توندوتیژە ئەویش بەهۆی دەست بەسەرداگرتنی خاکی یەکتریەوە، لەسەر ئاستی باڵاش، دەوڵەتانی شارستانیەتیە جیاوازەکان کێبڕکێیان لەسەر ڕێژەی هێزی سەربازی , ئابوری , کۆنترۆڵکردنی دامەزراوە نێودەوڵەتیەکان و لایەنەکانی سێیەم دەبێت، هەروەها پەرە بە بەها تایبەتیە سیاسی و ئاینیەکانی خۆیان دەدەن.

## [هێڵە سنوریەکانی نێوان شارستانیەتیەکان ]

هێڵە سنورییەکانی نێوان شارستانیەتیەکان جێگەی سنورەکانی سەردەمی جەنگی سارد دەگرنەوە، وەک ناوچەگەلێک کە ئەگەری سەرهەڵدانی قەیران و، خوێن ڕشتن تیایاندا بوونی هەیە. جەنگی سارد کاتێک دەستی پێکرد کە پەردەیەکی ئاسنین ئەوروپای دابەشکردبوو لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و ئایدیۆلۆجی، هەر لەگەڵ لابردنی ئەو پەردەیەش کۆتایی بە جەنگی سارد هێنرا. کاتێک دابەشبوونی ئایدیۆلۆجی لە ئەوروپا کۆتایی پێهات، دابەشبوونی کەلتوری لە ئەوروپا لە نێوان مەسیحیەتی خۆرئاوا ( کاسۆلیک) لەلایەک و، مەسیحیەتی ئۆرسۆدۆکسی و ئیسلام لەلایەکی ترەوە سەریان هەڵدایەوە. گرنگترین هێڵی دابەشبوون لە ئەوروپا وەک ئەوەی (ولیام واڵس) دیاریکردووە، بریتیە لە سنوری خۆرهەڵاتی کاسۆلیکیەتی خۆرئاوا ساڵی ١٥٠٠ ز ئەم هێڵە بە درێژایی ئەوەی کە ئێستا سنوری نێوان فنلەندا و وڵاتانی بەلتیقە لەگەڵ ڕوسیا دەستپێدەکات، بە ناو بیلاروس و ئۆکراینیا تێدەپەڕێت و ئەو وڵاتە دەکات بە دوو کەرتەوە کە ئەوانیش پێکدێن لە ئۆکرانیای خۆرئاوای کاسۆلیک لەگەڵ ئۆکرانیای ڕۆژهەڵاتی ئۆرسۆدۆکس، دەسوڕێتەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و ترانسیلڤانیا لە ناوچەکانی تری ڕۆمانیا جیادەکاتەوە، پاشان بەناو یوگسلاڤیادا دەڕوات بە دیاریکراوی ئەو سنورەی کە سلۆڤینیا و کرواتیا لە بەشەکانی تری یوگسلاڤیا جیادەکاتەوە، لە ناوچەی بەلقان ئەم هێڵە هاوتایە لە تەک ئەو سنورە مێژووییەی نێوان هاپسبۆرگ و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. گەلانی باکور و خۆرئاوای ئەم هێڵە کاسۆلیک و پرۆتستانتن، هاوبەشن لە مێژووی ئەوروپا، هەر لە فیودالیزمەوە تا دەگاتە ڕێنسانس , چاکسازی ئاینی، ڕۆشنگەری، شۆڕشی فەرەنسی، شۆڕشی پیشەسازی، ئەم ناوچانە بەگشتی لە ڕووی ئابورییەوە باشترن بە بەراورد بە دیوە خۆرهەڵاتیەکەی، پێدەچێ ئەو بەشەی کە دەکەوێتە خۆرئاوای ئەم هێڵەوە خواستی زیاتریان هەبێ بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ ئابوری هاوبەشی ئەوروپا، و چەسپاندنی سیستەمێکی سیاسی دیموکرات.
ئەو گەلانەشی کە دەکەونە ڕۆژهەڵات و باشوری ئەم هێڵەوە ئۆرسۆدۆکسن یاخود موسڵمانن، لە ڕووی مێژوویشەوە لە ژێر دەسەڵاتی قەیسەری ڕوسیا و

یاخود عوسمانیەکاندا بوون، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی کە زۆر بەکەمی کاریگەری رووداوەکانی بەشەکانی تری ئەوروپایان بکەوێتە سەر، لە رووی ئابوریشەوە کەمتر گەشەیان سەندووە و، کەمتریش چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێت کە گەشە بە سیستەمێکی دیموکراتی جێگیر بدەن. پەردەی ئاسنینی ئایدیۆلۆجیا جێی خۆی چۆڵکردوە بۆ پەردەی مەخمەڵی کەلتور وەک گرنگترین هێڵی دابەشکاری ئەوروپا. هەروەک روداوەکانی یوگسلاڤیا نیشانیداین , کە ئەوە بە تەنها هێڵی جیاوازی نیە، بگرە ناوبەناو هێڵی ململانێیەکی خوێناویە.

ململانێ بەدرێژایی هێڵە سنورییەکانی نێوان خۆرئاوا و شارستانیەتی ئیسلامی بۆماوەی ۱۳۰۰ بەردەوام بووە. پاش سەرهەڵدانی ئیسلام، تەوژمی یەکەمی عەرەب و موسڵمانەکانی ئەفریقیا بە هەردوو ئاراستەی خۆرئاوا و باکور دەستی پێکرد , دواتر لە ساڵی ۷۳۰ ز جموجوڵەکانیان کۆتایی پێهێنا. لە سەدەی یازدەوە تا سیازدەهەم، خاچ پەرستەکان هەوڵیاندا مەسیحیەت و دەسەڵاتی مەسیحی بگێڕنەوە بۆ خاکی پیرۆز( فەڵەستین)، سەرباری بەدەستهێنانی چەند سەرکەوتنێکی کورتخایەن بەڵام لە کۆتاییدا نەیانتوانی بەردەوام بن. لە سەدەی چواردەهەم بۆ حەڤدەهەم تورکە عوسمانیەکان هاوکێشەکەیان پێچەوانە کردەوە , دەسەڵاتی خۆیان سەپاند بەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەلقان و، قوستەنتینەشیان داگیرکرد، هەروەها دووجار گەمارۆی ڤیەنایاندا، بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەسەڵاتی عوسمانیەکان لاوازبوو، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ ئەوەی بریتانیا، فەرەنسا و، ئیتالیا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر بەشێکی زۆری باکوری ئەفریقا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا جێگیر بکەن. لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا ئیمپراتۆریەتە ئیستعمارگەراکان ئاوابوون، خۆرئاوا بە نۆبەتی خۆی دەستی کرد بە پاشەکشێ، لە سەرەتادا عەرەبە ناسیۆنالیستەکان و پاشانیش ئیسلامییە فەندەمینتاڵەکان لە مەیدانەکەدا دەرکەوتن. بوونی ئەو سامانە گەورەیەی نەوت وای لە خۆرئاوا کرد بە جدی پشت بە وزەی وڵاتانی کەنداوی فارسی ببەستێت. دەوڵەتە ئیسلامییە بە نەوت دەوڵەمەندەکان بوون بە خاوەن سەرمایە، ئەمەش بوو بە هۆی درستبوونی خواستی دەوڵەمەندبوونیان بە چەک. ئەو ناوچەیە شەڕێکی زۆری بەخۆیەوە بینی بۆنمونە، شەڕی عەرەب – ئیسرائیل، جەنگی خوێناوی و بێ بەزەییانەی فەرەنسیەکان بەرامبەر جەزائیریەکان لە ساڵانی پەنجادا، داگیرکردنی میسر لە لایەن فەرەنسا و بریتانیاوە لە ساڵی ۱۹٥٦ز، هێزەکانی ئەمریکا لە ساڵی ۱۹٥۸ ز چوونە لوبنانەوە، هێرشی ئەمریکا بۆ سەر لیبیا و، تێوەگلانی لە چەندین رووبەڕوبونەوەی سەربازی دژ بە ئێران، هەروەها تیرۆریستە عەرەب و ئیسلامیەکان کە لانی کەم لە لایەن سێ وڵاتی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە پشتگیری دەکرێن، دەستیانکرد بە بەکارهێنانی چەک لە دژی خەڵکی بێ دیفاع و بۆمبرێژکردنی فرۆکە مەدەنی و پێگە سەربازیەکانی خۆرئاوا، هەروەها بەکارهێنانی هاوڵاتیانی خۆرئاوایی وەک بارمتە.

ئەم جەنگەی نێوان عەرەب و خۆرئاوا لە ساڵی ۱۹۹۱ ز گەیشتە لوتکەی خۆی، کاتێک ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هێزێکی گەورەی نارد بۆ کەنداوی فارس بۆ بەرگریکردن لە چەند دەوڵەتێکی تری عەرەب لە بەرامبەر بە یەکێکی دیکەیان (کوەیت). لە دوای ئەمەشەوە ناتۆ زیاتر پلانەکانی ئاراستەی ئەگەرەکانی هەڕەشە و نا ئارامیەکانی»باشورە وەڕسکەرەکەی» دەکات.

بەرخورد و ململانێی سەربازی لە نێوان ئیسلام و خۆرئاوا ئەوەندە سەدە تەمەنی بێت پێ ناچێت وا بە ئاسانی کۆتایی پێبێت، بگرە دەکرێت کوشندەتریش بێت. جەنگی کەنداو هەستی شانازی بەخۆکردنی لای هەندێک لە عەرەبەکان دروستکرد، بەو هۆیەی کە (سەدام حوسەین) هێرشی کردە سەر ئیسرائیل و رووبەرووی خۆرئاواش وەستایەوە، هەندێکی تریان ناڕازیبوون لە بوونی هێزەکانی خۆرئاوا لە کەنداو و، زاڵبونیان بەسەر ناوچەکەدا، هەروەها بێتواناییان لە دیاریکردنی چارەنوسی خۆیان وەکو سوکایەتییەک لێکدەدایەوە.

زۆرێک لە وڵاتە عەرەبییەکان بە هەناردەکارانی نەوتیشەوە خەریکە دەگەن بە قۆناغێک لە گەشەی ئابوری و کۆمەڵایەتی، کە ئیدی حکومەتە دەسەڵاتگەراکان گونجاو نین بۆ بەڕێوە بردنیان و، هەوڵەکانیش بۆ ناساندنی دیموکراسی لە پەرەسەندنایە، هەروەها پێشتر چەند کرانەوەیەکی سیاسی لە سیستەمە عەرەبییەکان هاتوەتە ئاراوە. گەورەترین سودمەندی ئەم کرانەوە سیاسیانە هێزە ئیسلامیەکان بوون. بەکورتی دیموکراسیەتی خۆرئاوا لە جیهانی عەرەبیدا دەبێتە هۆی بەهێزبونی هێزە دژە خۆرئاواییەکان، ئەکرێ بڵێین ئەمە تەنها قۆناغێکی راگوزەرە، بەڵام بە دڵنیاییەوە پەیوەندی نێوان خۆرئاوا و وڵاتانی ئیسلامی ئاڵۆزتر دەکات.

هۆکارێکی تری ئاڵۆزبوونی ئەو پەیوەندیانە، ئەو زیادبونە سەرنج راکێشەی ژمارەی دانشتوانی وڵاتانی عەرەبییە، بەتایبەتی باکوری ئەفریقا، کە ئەمەش بووە بەهۆی زیادبوونی دیاردەی کۆچ بۆ خۆرئاوای ئەوروپا.

سەرباری بەرەو پێشچوونی پرۆسەی کاڵکردنەوەی سنورە ناوخۆییەکانی خۆرئاوای ئەوروپا، بەڵام بووە بەهۆی تیژکردنەوەی حەساسیەتە سیاسیەکان، لە ساڵی ١٩٩٠ بەم لاوە لە ئەڵمانیا، فەرەنسا، هەروەها ئیتالیا رەگەز پەرستی لە پەرەسەندندایە دایە و، کاردانەوەی سیاسی و توندوتیژی بەرامبەر عەرەب و تورکە کۆچبەرەکان تادێت توندتر و فراوانتر دەبێت.

لە هەردوولاوە بەریەککەوتنی نێوان ئیسلام و خۆرئاوا وەکو پێکدادانی شارستانیەتیەکان لێی دەڕواندرێت، بۆ نمونە (م. ج. ئەکبەر)، کە نوسەرێکی موسڵمانی هندییە پێیوایە «رووبەڕووبوونەوەی داهاتوی خۆرئاوا بەرامبەر بە جیهانی ئیسلامیە و, بە بزاوتی نەتەوە موسڵمانەکان هەر لە پاکستانەوە تا مەغریب، ململانێ لەسەر یاسایەکی نوێی نێودەوڵەتی دەستپێدەکەن». (بیرنارد لویس) یش بە دەرئەنجامێکی هاوشێوە دەگات و, دەنوسێت:

ئێمە رووبەروی میزاج و بزوتنەوەیەکین کە لە ئاستێکی باڵاتردایە بە بەراورد بە کێشە و سیاسەت بگرە بەو دەوڵەتانەشی کە سوراخیان دەکەن. ئەمە هیچ نیە جگە لە پێکدادانی شارستانیەتیەکان، ئەکرێ ناعەقلانی بێت بەڵام بە دڵنیاییەوە کاردانەوەیەکی مێژووییە لە لایەن رکەبەرێکی کۆنەوە بەرامبەر بە میراتە جوو- مەسیحایەتیەکەمان، وجودی عەلمانی ئێستامان و، بڵاوبونەوەی ئەو کەلتورە بە شێوەیەکی بەرفراوان.

لە ڕووی مێژووییەوە بەریەککەوتنێکی تری دوژمنکاری شارستانیەتی عەرەبی و ئیسلامی، بەرامبەر بە بت پەرستەکان و ئامنیستەکان بوو و، ئێستاش بەرامبەر بە مەسیحیە رەشپێستەکانی سنورەکانی باشوریان. باشترین نمونەش مامەڵەی بازرگانە عەرەبەکان بوو بە کۆیلەوە، هەر ئەمەش کاریگەری هەبووە لەسەر شەڕی ناوخۆی سودان لە نێوان عەرەب و رەش پێستەکانی ئەو وڵاتە، شەڕی نێوان حکومەتی چاد و

شۆرشگێڕەکانی ئەو وڵاتە کە لەلایەن لیبیاوە هاوکاری دەکرێن، گرژی نێوان مەسیحیە ئۆرسۆدۆکسەکان و موسڵمانەکان لە هۆرنی ئەفرقیا و، ململانێی سیاسی و، دووبارە بوونەوەی سەرهەڵدانی ئاشوب و توندووتیژی کۆمەلایەتی لەنێوان موسلمان و مەسیحیەکانی نایجیریا.

مۆدێرنیزەکردنی ئەفریقا و بڵاوبونەوەی مەسیحیەت، دەکرێت ببێتە هۆی بەهێزبوونی ئەگەرەکانی توندوتیژی بەدرێژایی هێڵە سنوریەکانی نێوانیان. نیشانەی توندبوونەوەی ئەم ململانێیەش بریتیبوو لەو وتارەکەی (پاپا جۆن پاولی دووەم) کە لە مانگی دووی ١٩٩٣ ز لە خەرتوم پێشکەشی کرد، کە تیایدا هێرشی کردە سەر کارەکانی حکومەتی ئیسلامی سودان دژ بە کەمینەی مەسیحی لەو وڵاتە.

لە سنورەکانی باکوری ئیسلام، تەقیینەوەی ململانێی نێوان ئۆرسۆدۆکس و موسڵمانەکان ڕوو لە زیادبونە، بۆ نمونە کوشتارگەکانی بۆسنە و سەرایڤۆ، هاتنە جۆشی کەم کەمی نێوان ئەلبان و سربەکان، پەیوەندی ناجێگیری نێوان بولگاریەکان و کەمینە تورکیەکەی نێو وڵاتەکەیان , توندوتیژی نێوان ئۆسیتیەکان و ئەنگوشیەکان، قەسابخانەکەی نێوان ئازەری و ئەرمەنەکان کە ڕاناوەستێ، پەیوەنی ئاڵۆزی نێوان ڕوسەکان و موسڵمانەکانی ئاسیای ناوەراست و، بڵاوەپێکردنی هێزەکانی روسیا بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانی روسیا لە قەوقاز و ئاسیای ناوەراست. ئاین هێز دەداتەوە بەر بوژانەوەی شوناسی نەتەوەیی و، ئەمەش دەبێتە هۆی ترسی روسیا لە ئاسایشی سنورەکانی باشوری.

ئەم نیگەرانیە لەلایەن «ئارکی رۆسفێلتە»وە باش دەرکی پێکراوە:

«بەشی هەرە زۆری مێژووی روسیا لە ململانێی نێوان سلاڤ و تورکەکان لەسەر سنورەکانیان دەکۆڵێتەوە، کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی دروستبوونی دەوڵەتی روسیا واتا نزیکەی هەزار ساڵ پێش ئێستا. لە هەزار ساڵەی ڕووبەڕووبونەوەی سلاڤەکان لەگەڵ دراوسێ رۆژهەڵاتیەکەیانیاندا، نەک لە مێژووی روسیا تێدەگەین بگرە لە کارەکتەری روسیش تێدەگەین. بۆ ئەوەی لە واقعی ئێستای روسیا تێبگەین پێویستە لە تورکەکان تێبگەین کە بە درێژایی چەندین سەدە روسەکانی سەرقاڵ کردووە».

هەروەها ململانێی شارستانیەتیەکان لە ناوچەکانی تری کیشوەری ئاسیاش بە قوڵی ڕەگی داکوتاوە. ئێستا ململانێی نێوان موسڵمان و هیندۆسەکان لە نیمچە کیشوەری هندی تەنها لە ڕێگەی رکابەرایەتی نێوان هیند و پاکستان خۆی پیشان نادات، بەڵکو بووە بە هۆی توند بوونەوەی ململانێی ئاینی لەناو خودی هندیشدا لە نێوان کەمینەیەکی گرنگی موسڵمانی ئەو وڵاتە و , گروپە چەکدارە هیندۆسیەکان , کە ڕوو لە زیادبوونن.

رووخاندنی مزگەوتی «ئایۆدها» لە ساڵی ١٩٩٢ ئەو بابەتەی هێنایە پێشەوە کە هند وەک دەوڵەتێکی عەلمانی سێکیولار دەمینێتەوە یاخود دەبێت بە دەوڵەتێکی هیندۆسی. لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا چین کێشەی سنوری نەبڕاوەی هەیە لەگەڵ زۆربەی دراوسێکانیدا، هەروەها پەیڕەوی لە سیاسەتێکی دڵڕەقانە دەکات بەرامبەر بە بوداییەکانی تبت و کەمینەی تورکی موسڵمانی وڵاتەکەی و، لەگەڵ کۆتایی هاتنی جەنگی ساردا جیاوازیە بنچینەییەکانی نێوان چین و ئەمریکا دووبارە سەریان هەڵدایەوە، بۆ نمونە مافی مرۆڤ , بازرگانی، هەروەها خۆ پڕچەککردن. ئەم جیاوازیانەش پێ ناچێت هێوربینەوە، وەک ئەوەی «دێنگ خایۆپینگ» جەختی لەسەر ئەوە کردبووەوە

کە «جەنگێکی نوێی سارد» لە نێوان ئەمریکا و چین بەڕێوەیە.
هەمان برگەش بەکارهێندرایەوە بۆ پەیوەندیەکانی ئەمریکا و یابان، کە بەرەو ئالۆزبوون دەڕوات، لێرەدا جیاوازییە کەلتورییەکە ململانێ ئابورییەکە توندتر دەکاتەوە، هەردوو لایان یەکتری بە ڕەگەزپەرەست تۆمەتباردەکەن، بەڵام لانی کەم لەلای ئەمریکیەکانەوە ڕق لێ بوونەوەکەیان کەلتورییە وەک لەوەی ڕەگەزی بێت. جیاوازیەکانی ئەو دوو کۆمەڵگایە لە بەها بنەڕەتیەکان، هەڵوێست و، شێوازی مامەڵەیان بەزەحمەت دەکرێت لەوە زیاتر جیاواز بن.
کێشە ئابوریەکانی نێوان ئەمریکا و ئەوروپا هیچی کەمتر نیە لە کێشەکانی نێوان ئەمریکا و یابان، بەڵام هەمان دەرکەوتی سیاسی و توندبونی دەرونی لێ ناکەوێتەوە , ئەمیش بەهۆی ئەوەی جیاوازیەکانی نێوان کەلتوری ئەمریکی و، ئەوروپی زۆر کەمترە بە بەراورد بەو جیاوازیانەی کە لە نێوان شارستانیەتی ئەمریکا و شارستانیەتی یاباندا هەیە.
بەریەککەوتنی نێوان شارستانیەتیەکان چەندین شێوازی جیاجیای هەیە، وەک لەوەی کە بە تەنها بەتوندوتیژی هێمای بۆبکرێت. لەلایەک ڕکەبەرایەتی ئابوری بە ئاشکرا زاڵ بووە بەسەر پەیوەندیەکانی هەردوو نیمچە شارستانیەتی ئەمریکا و ئەوروپا لەناو شارستانیەتی خۆرئاوا و، لەلایەکی تریشەوە نێوان هەردووکیان و یابان. لە ناوچەی ئوراسیاش هەڵایسانی ململانێی نەتەوەیی زۆر بە توندی دەرکەوت کە تا ئاستی پاکتاوی ڕەگەزیی ڕۆیشت، کە بەشێکی زۆری ئەو توندوتیژیانە لە نێوان ئەو گروپانە روویدا کە سەر بە شارستانیەتیە جیاوازەکانن. لە ئوراسیا هێڵە تەماسە مێژووییەکان جارێکی تر گەرم دەبنەوە بەتایبەتی بەدرێژایی ئەو سنورە شێوە هیلالیەی بلۆکی ئیسلامی کە هەر لە ئەفریقاوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ئاسیای ناوەڕاست. وتوندو تیژی لە نێوان موسڵمانەکان و سربە ئۆرسۆدۆکسەکان لە بەلقان، جوولەکەکان لە ئیسرائیل , هیندۆسەکان لە هند، بودابیەکان لە بۆرما و، هەروەها کاسۆلیکەکانی فلیپین. ئیسلام سنورێکی خوێناویی هەیە.

## [گردبوونەوەی شارستانیەت: نیشانەکانی خزمایەتی وڵاتان]

ئەو گروپ و وڵاتانەی کە سەر بە هەمان شارستانیەتن لە کاتی تێوە گلانیان بە شەڕ لەگەڵ گەلان و گروپی شارستانیەتیەکانی تر، ئاسایی هەوڵی کۆکردنەوەی هاوکاری دەدەن لە ئەندامەکانی تری شارستانیەتیەکەیان. هەر لەگەڵ پەرەسەندنی دونیای دوای جەنگی سارد بەشدارگەی شارستانیەت، یاخود ئەوەی کە (هـ. د. س. گرینوەی) ناوی دەنێ «وڵاتە خزمەکان»، شوێنی ئایدیۆلۆجیا سیاسیەکان و بایەخی سونەتی تەرازوی هێز دەگرێتەوە وەک گرنگترین بنەمای هەمئاهەنگی و هاوپەیمانێتی.
دەرکەوتنی ئەمەش کەم کەم لە دوای جەنگی ساردا دەتوانرێت ببینرێت، هەرچەندە هیچکام لە ململانێکانی کەنداوی فارس , قەوقاز و، بۆسنە بەشێوەیەکی تەمام عەیار شەڕی نێوان شارستانیەتیەکان نەبوون، بەڵام لە هەریەکەیاندا کۆمەڵێ توخمی گردبوونەوەی شارستانیەتی تێوە گلا و، واش دەردەکەوت کە لەگەڵ بەرداوامبوونی ململانێکان بە هێزتریش بێت، کە ئەمەش دونیا بینیەکمان بۆ ئایندە پێدەدات.
یەکەم: لە جەنگی کەنداودا وڵاتێکی عەرەبی وڵاتێکی تری عەرەبی داگیرکرد، کە دواتریش شەڕی هاوپەیمانەکانی عەرەبی کرد کە پێکهاتبوون لە خۆرئاواییەکان و

هەندێ وڵاتی تر. هەرچەندە تەنها چەند وڵاتێکی کەم بە ئاشکرا پشتگیری سەدام حوسەینیان کرد، بەڵام بڕیکی زۆری نوخبە و پێشەوایانی عەرەب بە نهێنی کارەکەیان پەسەندکرد و هانیشیاندا و، کەسێکی زۆر جەماوەری بوو لەناو کەرتێکی گەورەی ڕای گشتی عەرەبیدا، تا ئەو ڕادەیـەی کە بزوتنەوە ئیسلامیە فەندەمێنتاڵەکانی جیهان پشتگیری عێراقیان کرد نەک سعودیە و کوەیت کە لەلایەن خۆرئاواوە پشتگیری دەکران. سەدام حوسەین بە هۆی شکاندنی سوێندی ناسیۆنالیستی عەرەبی بە ئاشکرا هەوڵی دەدا پەنا بباتەوە بۆ ئیسلام , خۆیی و لایەنگرەکانی هەوڵیاندەدا وەکو شەڕی نێوان شارستانیەتیەکان پێناسەی بکەن، وەکو ئەوەی (سەفەر ئەلهەوالی) کە ڕاگری زانکۆی (الام القری) یە بۆ توێژینەوەی ئیسلامی لە مەککە دەنوسێت «ئەمە تەنها جیهان نیە لە دژی عێراق بەڵکو خۆرئاوایە لە دژی ئیسلام». بەبێ گوێدانە ڕکەبەرایەتی نێوان عێراق و ئێران ڕابەری کۆماری ئیسلامی ئێران (عەلی خامنەیی) بانگەوازی بۆ شەڕێکی پیرۆز کرد دژ بە خۆرئاوا بەم شێوەیە دەربڕی «خەبات لە دژی دەستدرێژی و , چاوچنۆکی، پلان و سیاسەتەکای ئەمریکا وەکو جیهاد حیساب دەکرێت و، هەر کەسێکیش لەم ڕێیەدا بکوژردرێت شەهیدە» و، هەروەها مەلیک (حوسەینی) پادشای ئوردن پێی وابوو کە «ئەم جەنگە تەنها لەدژی عێراق نیە بەڵکو لە دژی هەموو عەرەب و موسڵمانەکانە».

گردبوونەوەی توێژێکی زۆر گەورە لە نوخبە و ڕای گشتی عەرەبی لە پشتی سەدام حوسەین، وای لەو حکومەتە عەرەبیانە کرد کە لە بەرەی هاوپەیمانێتی دژ بە عێراق بوون، چالاکیەکانیان کەم بکەنەوە و، وتە فەرمیەکانیشیان هێوربکەنەوە و , هەروەها دژایەتی یاخود خۆیان بەدوور گرت لە هەوڵە یەک لە دوای یەکەکانی خۆرئاوا بۆ بەکارهێنانی فشار لە دژی عێراق، بۆ نمونە سەپاندنی ناوچەی دژە فڕین لە هاوینی ١٩٩٢ز، بۆردومانکردنی عێراق لە مانگی دوویساڵی ١٩٩٣ز. هاوپەیمانێتی خۆرئاوا - سۆڤیەت - تورکی- عەرەبی، لە دژی عێراق لە ساڵی ١٩٩٠، زۆر کورتخایەن بوو بەجۆرێک ئەم هاوپەیمانیەتیە تا ساڵی ١٩٩٣ تەنها لە نێوان خۆرئاوا و کوەیتدا مایەوە.

موسڵمانەکان بـــەراوردی کـــردەوە و پێوەرەکانی خۆرئاوایان کرد لە دژی عێراق و لەبەرامبەریشدا ئەنجام نەدانی هیچ کارێک لە دژی سربەکان بۆ پاراستنی بۆسنەییەکان و، نەسەپاندنی سزا بەسەر ئیسرائیل لە بەرامبەر پێشێلکردنی بڕیارە نێودەوڵەتیەکان , وای لە عەرەبەکان کرد , کە بڵێن خۆرئاوا بە دوو پێوانەیی مامەڵە دەکـات (بـەو واتایەی پێوەری جیاواز بەکاردەهێنرێت لە مامەڵە کردن لەگەڵ دۆخە جیاوازەکاندا، و. کوردی). هەرچۆنێک بێت دونیای پێکدادانی شارستانیەتیەکان دونیایەکی دوو پێوانەییە، گەلان پێوەرێک بە کاردێنن بۆ ئەو وڵاتانەی کە نزیکن لە خۆیانەوە و، جیاوازە لەو پێوەرەی کە بەکاریدێنن بۆ یەکێکی دی.

دووەم: هـەروەهـا نیشانەکانی خزمایەتیەکان لە ململانێکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا دەرکەوتن. سەرکەوتنەکانی سوپای ئەرمینیا لە ساڵی ١٩٩٢ - ١٩٩٣ز هانی تورکیایدا بۆ ئەوەی زیاتر هاوکاری برا ئاینی و، نەتەوەیی و , زمانیەکانی خۆی لە ئازەربایجان بکات. هەروەک، بەرپرسێکی ڕەسمی تورکی لە ساڵی ١٩٩٢ ڕایگەیاندبوو «ئێمە و ئازەربایجانیەکان هەمان هەستی نەتەوایەتی تورکیمان هەیە»، هەم دیسانەوە (تۆرگۆت ئـۆزال) سەرۆکی تورکیا ڕایدەگەیەنێت «ئێمە لەژێر گوشارداین، ڕۆژنامەکانمان پڕن لە وێنەی هێرشە بێ بەزەییەکان، پرسیاری ئەوەمان لێ دەکەن

ئایا ئێمە تا ئێستاش جدین لەسەر پەیڕەوکردنی سیاسەتە بێ لایەنەکانمان , لەوانەیە پێویست بێ ئەوە پیشانی ئەرمەنیەکان بدەین کە تورکیایەکی مەزن لە ناوچەکەدا هەیە»، وە جارێکی تر ئاماژەی بەوەدا «تورکیا پێویستە کەمێک ئەرمەنیەکان بترسێنێت» دیسانەوەش لە ساڵی ١٩٩٣ هەڕەشەی کردەوە وتی «پێدەچێ تورکیا کەڵبەی خۆی پیشانبدات»، کار گەشتە ئەوەی فڕۆکە جەنگیەکانی تورکیا بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری دەستیان کرد بە فڕین بە درێژایی سنورەکانی ئەرمینیا , هەروەها هەناردەی خۆراک و گەشتی ئاسمانی بۆ ئەرمینیا ڕاگرت، لەگەڵ ئەوەشدا ئێران و تورکیا ڕایانگەیاند کە پارچە پارچە کردنی ئازەربایجان قەبوڵ ناکەن. یەکێتی سۆڤیەت تا دواساڵەکانی مانەوەی پشتگیری لە ئازەربایجان دەکرد چونکە حکومەتەکەی لەلایەن کۆمەنیستەکانەوە کۆنترۆڵ کرابوو , بەڵام لەگەڵ کەوتنی سۆڤیەت بایەخی سیاسی ڕێگەی کردەوە بۆ بایەخی ئاینی، هێزەکانی روسیا شان بەشانی ئەرمەنییەکان شەڕیان دەکرد و، ئازەرەکان دەیانگوت «حکومەتی ڕوسیا ١٨٠ پلە پێچی کردوەتەوە» بەلای هاوکاری بۆ ئەرمەنییە مەسیحییەکان.

سێیەم: لە بارەی شەڕەکانی ناو یوگسلاڤیای پێشوو، ڕای گشتی خۆرئاوا هاوسۆزی و هاوکاری خۆی پیشاندا بۆ موسڵمانەکانی بۆسنە بەهۆی ئەو ترس و تۆقاندنانەی کە رووبەڕووی دەبوونەوە بە دەستی سربەکان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەک بایەخێکی کەمتریان دا بە هێرشی کرواتەکان دەدا بۆسەر موسڵمانەکان و، بەشداریکردنیان لە پارچە پارچەکردنی بۆسنە – هیرزگۆڤینە!

لە سەرەتاکانی هەڵوەشاندنەوەی یوگسلاڤیا، ئەڵمانیا لە هێزپیشاندانێکی نا ئاسایی و، دەستپێشخەریەکی دیپلۆماتیدا هانی ئەندامەکانی تری کۆمەڵگای ئەوروپیدا بۆئەوەی دوای پێشڕەوی ئەو بکەون و دان بە سلۆڤینیا و کرواتیادا بنێن و، لە ئەنجامی سوربوونی پاپا بۆ پشتگیریکردنی ئەو دوو وڵاتە کاسۆلیکییە، ڤاتیکان پێش کۆمەلگەی ئەوروپی کەوت لە دانان بەو وڵاتانە، ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش دوای هەنگاوەکەی ئەوروپا کەوت و دانی نا بەو دوو وڵاتەدا , بەم شێوەیە وڵاتە پێشەواکانی خۆرئاوا لە پشتی هاو ئاینیەکەیان گردبوونەوە. دوابەدوای ئەمەش هەواڵی ئەوە درا کە کرواتیا بڕێکی زۆر چەکی پێگەیشتوە کە لە ئەورپای ناوەڕاست و وڵاتانی تری خۆرئاواوە نێردرابوون. حکومەتەکەی بروس یێڵسن (سەرۆکی روسیا پێش هاتنە سەر سەرۆکی ڤلادیمێر پۆتن، و. کوردی)، ئەیویست سیاسەتێکی میانڕەوانە بگرێتە بەر، بەوەی کە هاوسۆز بێ لەگەڵ سڕبە ئۆرسۆدۆکسەکان و، لە هەمان کاتیشدا دڵی خۆرئاواییەکان نەڕەنجێنێت، ئەمەش وایکرد کە روسە موحافیزکار و ناسیۆنالیستەکان، لەگەڵ ئەمانیشدا زۆرێک لە پەرلەمانتارەکانی ئەو وڵاتە، هێرشیان کردە سەر حکومەت بەوەی کە زۆر هاریکار نەبووە لە یارمەتیدانی سڕبەکان. تا ئەو ڕادەیەی لە سەرەتای ١٩٩٣ز سەدان کەسی روسی بە ئاشکرا لە ریزی سوپای سڕب خزمەتیان دەکرد، وە هەواڵی ئەوە بڵاو دەکرایەوە کە چەکی ڕوسی دابینکراوە بۆسڕبیا.

لە لایەکی تریشەوە حکومەت و گروپە ئیسلامیەکان ڕەخنەی ئەوەیان لە خۆرئاوا دەگرت کە نەهاتون بۆ پاراستنی بۆسنەییەکان , سەرکردەکانی ئێران لە هەموو وڵاتانی دونیا هانی موسڵمانانیان دەدا بۆ دابینکردنی یارمەتی بۆیان، ئێران بە پێشێلکردنی یاسای نێودەوڵەتی بۆ مامەڵە کردنی چەک، چەک و پیاویشی بۆ بۆسنەییەکان دابین کرد، ئەو گروپە

لوبنانیانەی کە لە لایەن ئێرانەوە پشتگیری دەکرێن چەکداریان بۆ مەشقپێکردن و ڕێکخستنی هێزەکانی بۆسنە ناردە ئەو وڵاتە. وەک ئەوەی دەگوترا لە ساڵی ١٩٩٣ز زیاتر لە چوار هەزار چەکدار کە لە نزیکی بیستو چوار وڵاتی ئیسلامیەوە هاتبوون لە بۆسنەدا دەجەنگان و، هەروەها حکومەتی سعودیە و حکومەتەکانی تری وڵاتانی ئیسلامی هەستیان دەکرد گوشارەکانی سەریان کە لەلایەن گروپە فەندەمێنتاڵیەکانی کۆمەڵگاکانیان ڕووبەڕوویان دەبوویەوە ڕوو لە زیادبونە، بۆ ئەوەی بەشێوەیکی جدیتر هاوکاری بۆسنەییەکان بکرێت، بەپێی ئەو ڕاپۆرتانەی بڵاودەبونەوە، سعودیە لە کۆتایی ١٩٩٢ز بڕێکی زۆر پارەی دابینکرد بۆ کڕینی چەک و پێداویستی بۆ بۆسنەییەکان، کە ئەمەش یارمەتیدەرێکی باشبوو بۆ بەرزکردنەوەی توانای سەربازیان دژ بە سربەکان.

لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا جەنگی ناوخۆی ئیسپانیا بوو بەهۆی دەستێوەردانی ئەو وڵاتانەی کە لە ڕووی سیاسیەوە فاشیست , کۆمیۆنیست , یاخود دیموکرات بوون، بەڵام لە نەوەدەکانی هەمان سەدەدا ململانێکانی یوگسلاڤیا بووبە هۆی ورووژاندن و دەستێوەردانی ئەو وڵاتانەی کە موسڵمان , یان ئۆرسۆدۆکس , یاخود کاسۆلیکی خۆرئاواییون، ئەم لێکچونەش دەرکی پێکرا , بۆ نموونە سەرنوسەرێکی سعودی کە ڕەچاوی ئەم خاڵەی کردبوو دەنوسێت: شەڕ لە بۆسنە و هیرزگیۆڤینا لە ڕووی دەرونییەوە هاوشێوەی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیایە کە لە دژی فاشیستەکان روویدا و , ئەوانەشی کە لەوێ کوژران بە شەهید حیساب دەکرێن چونکە ئەوان لە هەوڵی ڕزگارکردنی هاوئاینیەکانی خۆیاندا بوون.

ململانێ و توندوتیژی لە نێوان ئەو وڵات و گروپانە ڕوودەدات کە سەر بە هەمان شارستانیەتن، هەرچۆنێک بێت ئەو ململانێیانە کەمتر توندن و، کەمتریش چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێت کە گەشە بکەن تا ئاستی پێکدادانی شارستانیەتیەکان، هاوئەندامبوونیان لە شارستانیەتێکی دیاریکراودا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی ئەگەری سەرهەڵدانی توندوتیژی لە بارودۆخگەلێکی ئەوتۆدا کە گەروا نەبوایە پێدەچو ڕوویبدایە، لە ساڵی ١٩٩١ز و ١٩٩٢ زۆرێک لە خەڵک هۆشداریاندا لە ئەگەری سەرهەڵدانی ململانێی توندوتیژ لە نێوان روسیا و ئۆکرانیا لەسەر کەشتی گەلی دەریای ڕەش , چەکی ئەتۆم و ، هەروەها کیشەی ئابوری و خاک بە دیاریکراویش لەسەر ناوچەی قرم.

هەر چۆنێک بێت بە لە بەرچاوگرتنی شارستانیەت، ئەگەری سەرهەڵدانی توندوتیژی لە نێوان روسیا و ئۆکرانیا دەبێت لاواز بێ , بەهۆی ئەوەی کە هەردووکیان سلاڤین، بەزۆریش ئۆرسۆدۆکسن و سەدان ساڵە پەیوەندیەکی نزیکیان پێکەوە هەبووە و هەیە. سەرەڕای ئەو هەموو هۆکارە بۆ ململانێ، لە ساڵی ١٩٩٣ سەرکردەی هەردوو وڵات دەستیانکرد بە گفتوگۆیەکی کاریگەر بۆ کەمکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان ئەو دوو وڵاتە، لە کاتێکدا شەڕی توند هەبوو لە نێوان مەسیحی و موسڵمانەکان لە ناوچەکانی تری یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و، گرژی زۆر و، هەندێ جاریش جەنگ لە نێوان خۆرئاوای کاسۆلیک و مەسیحیە ئۆرسۆدۆکسەکان ڕوویدا لە وڵاتانی بەلتیق، بەڵام توندوتیژیەکی ئەوتۆ لە نێوان روسیا و ئۆکراینیا رووی نەدا.

گردبونەوەی شارستانیەتی تا ئەمڕۆ سنوردارە، بەڵام لە گەشەکردندایە و، توانای بەرفراوانبوونی زیاتریشی هەیە , لەو کاتەی کە ململانێکانی کەنداوی فارس، قەوقاز و، بۆسنە درێژەی کێشا، هەڵوێستی وڵاتان و لایەنگیریان زیاتر بەگوێرەی هێڵە شارستانیەتیەکان

بوو و، هەروەها سیاسیە پۆپیۆلیستەکان، پێشەوا ئاینیەکان و، میدیا شارستانیەتیان وەک ئامرازێکی کاریگەر داناوە بۆ وروژاندنی جەماوەر و، فشار خستنەسەر حکومەتە ڕاڕا و سڵکەرەوەکان. لە ساڵانی داهاتوودا، ئەو ململانێ ناوچەییانەی کە پێ دەچێت پەرە بسێنن بۆ جەنگی گەورە بریتین لە ململانێگەلێکی هاوشێوەی بۆسنە و قەوقاز، کە دەکەونە تەنیشت هێڵەکانی بە یەکگەیشتنی شارستانیەتیەکان. جەنگی جیهانی داهاتوو ئەگەر ببێت، ئەوا جەنگی نێوان شارستانیەتیەکان دەبێت.

## [خۆرئاوا بەرامبەر بە ئەوانی تر]

خۆرئاوا ئێستا بە شێوەیەکی نائاسایی لە لوتکەی دەسەڵاتدایە بە بەراورد بە شارستانیەتیەکانی تر. دوژمنە زلهێزەکەی لەسەر نەخشە سڕاوەتەوە، بە خەیاڵیشدا ناچێت ململانێی سەربازی لە نێوان وڵاتانی خۆرئاوادا ڕووبدات و، هێزی سەربازی خۆرئاوا بێ ڕکابەرە، لە ڕووی ئابوریشەوە جگە لە یابان، خۆرئاوا ڕووبەڕووی هیچ تەحەدایەک نابێتەوە و، زاڵیشبوە بەسەر دامەزراوە سیاسی و ئەمنیەکاندا، وە لەگەڵ یاباندا هەژموونی کردوە بەسەر دامەزراوە ئابورییە نێودەوڵەتیەکاندا. کێشە سیاسی و ئەمنییەکان تا ڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەریی و سەرپەرشتی ئەمریکا، فەرەنسا و، بریتانیا چارەسەر دەکرێن، کێشە ئابوریەکانیش لە ژێر سەرپەرشتی ئەمریکا، یابان و، ئەڵمانیا، هەروەها هەموویان پەیوەندیەکی زۆرباشیان هەیە پێکەوە، بۆ کەمکردنەوە یاخود نەهێشتنی کاریگەری وڵاتانی ناخۆرئاوایی.

بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش و دەزگای چاودێری دارایی نێودەوڵەتی بەشێوەیەک دەدرێت کە بەرژەوندی خۆرئاوای تیادا ڕەنگ بداتەوە، بەڵام بە شێوەیەک پیشاندەدرێت وەک ئەوەی ڕەنگدانەوەی خواست و بەرژەوەنیەکانی جیهان بێت. گوزارەی «کۆمەڵگای جیهانی» تەنها ناوێکی کۆیە و، دەربڕینێکی جوانە بۆ جێگرتنەوەی «دونیای ئازاد» (کە مەبەست لەو وڵاتانە بوو کە لە بەرەی لیبڕالیزمی سەرمایەداریدا بوون لە کاتی جەنگی سارددا، و. کوردی)، بۆ پێدانی شەرعیەتی نێودەوڵەتی بەو کارانەی کە گوزارشت لە بەرژەوەندی ئەمریکا و وڵاتانی تری خۆرئاوا دەکەن. خۆرئاوا لەڕێگەی دەزگای چاودێری دارایی نێودەوڵەتی و دامەزراوە ئابوریەکانی ترەوە پەرە بە بەرژەوەندییە ئابورییەکانی خۆی دەدات و, ئەو سیاسەتانەش دەسەپێنێت بەسەر وڵاتانی تردا کە لەبەرژەوەندی خۆرئاوادان.

لە هەر ڕاپرسیەکی گەلانی ناخۆرئاواییدا، بێ دوودڵی دەزگای چاودێری نێودەوڵەتی دەنگی وەزیری دارایی و کۆمەڵێ خەڵکی تری بەرپرسی ئەو وڵاتانە بەدەست دێنێت، بەڵام ڕێژەیەکی زۆر دەنگی دژ و نەخوازراویان دەبێت لەلایەن خەڵکانی ترەوە , کە هاوڕان لەگەڵ وەسفەکەی (جۆرج ئابتۆڤ) بۆ بەرپرسانی چاودێری دارایی نێودەوڵەتی «بەلشەفی نوێن کە ئەیانەوێ بەزۆر دەست بەسەر دارایی خەڵکدا بگرن , مامەڵەی نەگونجاوی سیاسی و یاسای ئابوری نا دیموکرات دەسەپێنن، و ئازادی ئابوری دەخنکێنن «.

هەیمەنەکردنی خۆرئاوا بەسەر ئەنجومەنی ئاسایش و بڕیارەکانی، تەنیا کاتێ سەریگرت کە چین جار بە جار خۆی ئەبوارد لە دەنگدان، کە بوو بەهۆی دەرکردنی یاسای بەکارهێنانی هێز بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت، و یاسای لەناوبردنی چەکە کۆکوژەکانی عێراق و، تواناکانی ئەو وڵاتە لە بەرهەمهێنانی ئەو جۆرە چەکەدا و، هەروەها دەرکردنی بڕیارێک بۆ داواکردنی بە دەستەوەدانی گومانلێکراوی بۆمبڕێژکردنی فڕۆکەی

(پان , ئام ١٠٣) , هەروەها سەپاندنی سزا کاتێک لیبیا ڕەتیکردەوە.

دوای شکستپێهێنانی گەورەترین سوپای عەرەبی، خۆرئاواییەکان بێ هیچ دوودڵیەک قورسایی خۆیان فڕیدایە ناوچەی عەرەبی. لەڕاستیدا خۆرئاوا دەزگا نێودەوڵەتیەکان و، هێزی سەربازی , هەروەها سەرچاوەی ئابوری بەکاردەهێنێت، بۆ بەڕێوەبردنی جیهان بە شێوەیەک کە باڵادەستی بەرژەوندی خۆرئاوا بپارێزێت و , پەرە بە سیاسەت و , بەهای خۆی بدات. ئەمە لانی کەم، ئەو شێوەیە کە ناخۆرئاواییەکان سەیری دونیای نوێ دەکەن و، تاڕادەیەکی زۆریش بۆچونەکەیان ڕاستە.

جیاوازی لە هێز , ململانێ لە پێناوی سوپا و، ئابوری، هەروەها دامەزراوە نێودەوڵەتیەکاندا , هۆیەکی ململانێیە لە نێوان خۆرئاوا و ئەوانی تر. جیاوازی لە کەلتور، کە باوەڕ و بەها بنچینەییەکانە سەرچاوەی دووەمی ململانێکانە، بۆ نمونە (ڤ. س. نایپاوڵ) پێی وابوو کە شارستانیەتی خۆرئاوا «شارستانیەتی گەردونییە»، کە بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەشێت» و بە ئاستێکی ناتەواو بە هەموو بەشەکانی تری جیهان بڵاوبووەتەوە , لە ئاستێکی جدیتردا، چەمکە خۆرئاواییەکان زۆر جیاوازن لەوانەی کە لە شارستانیەتیەکانی تر زاڵن.

دیدی خۆرئاواییەکان لەسەر تاکگەرایی، لیبراڵیزم، دیموکراسی، دەستورخوازی، مافی مرۆڤ، یەکسانی، بازاڕی ئازاد، دەسەڵاتی یاسا، جیاکردنەوەی ئاین و دەوڵەت، زۆر بەکەمی دەنگدانەوەی هەیە لە کەلتوری ئیسلامی، یابانی، هیندۆسیی، بودایی و، هەروەها ئۆرسۆدۆکسیدا.

هەوڵەکانی خۆرئاوا بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بۆچوونانە (ئایدیا) کاردانەوەی پێچەوانەی لێدەکەوێتەوە دژی «مافی مرۆڤی ئیمپیریالیزم» هەروەها دەبێتە هۆی جەختکردنەوەی زیاتر لە بەها خۆماڵییەکان، وەک ئەوەی ئیستا دەتوانرێت لە وڵاتە ناخۆرئاواییەکاندا ببینرێت لە پاڵپشتیکردنی گەنجەکان بۆ فەندەمێنتاڵیزمی ئاینی. تەنها بیرۆکەیە کە پێیوایە کە دەکرێت «شارستانیەتێکی گەردونی» هەبێت ئەمش بۆچونێکی خۆرئاواییە. ڕاستەوخۆ ناکۆکە لەگەڵ بیرۆکەی پرتکیولەریزم (بیروڕایەکی ئاینیە کە پێی وایە تەنها چەند کەسانێکی تایبەتی دەچنە بەهەشتەوە، و. کوردی، فەرهەنگی ئازادی)، کە زۆربەی کۆمەڵگا ئاسیاییەکان پەیڕەوی دەکەن و، جەختکردنی ئەوان لە سەر ئەوەی چ شتێک کەسێک لە کەسێکی تر جیادەکاتەوە.

لەڕاستیدا نوسەر لە پێداچوونەوە بە ١٠٠ لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری بەهاکان لە کۆمەڵگای جیا جیادا بەو دەرئەنجامە گەیشت کە «ئەو بەهایەی کە لە خۆرئاوا لە هەموو شت گرنگترە کەمتر گرنگن لە شوینەکانی تری دونیا». بە دڵنیایشەوە لە دونیای سیاسەتدا زۆرترین دەرکەوتنیان هەیە، بۆ نمونە هەوڵەکانی ئەمریکا و وڵاتانی تری خۆرئاوا لە هاندانی گەلانی تر بۆ لە خۆگرتنی بۆچونە خۆرئاواییەکان لە بارەی مافی مرۆڤ و دیموکراسی. حکومەتی دیموکراتی مۆدێرن لە خۆرئاوادا سەریهەڵدا، بەڵام کاتێک لە کۆمەڵگا ناخۆرئاواییەکان گەشەی پێدرا بەزۆری بەرهەمی کۆڵۆنیالیزمی خۆرئاوا بووە یاخود بەزۆر سەپێندراوە.

تەوەری سەرەکی دونیای سیاسەت لە ئایندەدا وەک ئەوەی (کشۆر مەهابوبانی) گوزارشتی لێکرد، بریتییە لە «ململانێی نێوان خۆرئاوا و ئەوانیتر» و بەرپەرچدانەوەی شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکانە بەرامبەر بە هێز و بەهاکانی ڕۆژئاوا، ئەو بەرپەرچدانەوانەش بە سێ فۆرمی جیاواز دەبێت یاخود

تێکەڵەیەک دەبێت لەو سێ فۆرمە جیاوازە، لە ئاستە توندەکەیدا وڵاتە ناخۆرئاواییەکان دەتوانن وەک کۆریای باکور و بۆرما هەوڵی پەیڕەوکردنی ڕێڕەوی گۆشەگیری زیاتری خۆیان بدەن، بۆ دابڕینی کۆمەڵگاکانیان لە هەر دزەکردنێکی «بۆگەنی» لە لایەن خۆرئاواوە، لە دەرئەنجامیشدا بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە نەبێت بە بەشێک لە کۆمەڵگەیەکی نێودەوڵەتی کە هەژموونی خۆرئاوای بەسەردا زاڵە هەرچۆنێک بێت نرخی ئەم فۆرمە زۆر گران دەکەوێت و، تەنها چەند وڵاتێک بە تەواوەتی پەیڕەویان لێکردوە. بەدیلی دووەم بریتییە لە چوونەپاڵی هێزی براوە، کە ئەویش خۆی لە هەوڵدان بۆ پەیوەندیکردن بە خۆرئاوا و قبوڵکردنی بەهاو دامەزراوەکانی دەبینێتەوە. بەدیلی سێیەمیش پێکدێت لە هەوڵدان بۆ دروستکردنی هاوسەنگیەک لە نێوان خۆرئاوا بە پەرەپێدانی هێزی ئابووری و سەربازی و, هاوکاریکردنی کۆمەڵگا ناخۆرئاواییەکانی دی دژ بە خۆرئاوا، لە هەمان کاتیشدا پارێزگاریکردنی بەها ناوخۆییەکان، بە کورتی بریتییە لە مۆدێرنیزەکردن بەبێ خۆرئاوایکردن.

## [وڵاتە دابەشبووەکان]

لە ئایندەدا گەلان بەهۆی شارستانیەتیەوە خۆیان لەوانی تر جیا دەکەنەوە، ئەو وڵاتانەی کە خاوەن ژمارەیەکی گەورەی دانیشتوانن لە شارستانیەتیە جیاوازەکان، بۆ نمونە یەکێتی سۆڤیەت و یوگسلاڤیا، ئەگەری ئەوەیان هەیە پارچە پارچە بن. هەندێکی تر لە وڵاتەکان تا ڕادەیەکی باش هارمۆنیەتی کەلتوری هەیە لە ناو دانیشتوانەکەیاندا بەڵام ناکۆکن لەسەر ئەوەی کە ئایا کۆمەڵگەکەیان سەر بەم شارستانیەتیەیە یان ئەوی تر، ئەمەیە وڵاتە دابەشبووەکان، سەرکردەکانی ئەم وڵاتانە دەیانەوێت پەیڕەوی لە ستراتیجی چونە پاڵ لایەنی براوە بکەن، وڵاتەکەیان بکەن بە ئەندامی بەرەی خۆرئاوا، بەڵام مێژوو، کەلتور و، نەریتی ئەو وڵاتانە ناخۆرئاواین، نمونەی ئاشکراو باڵای ئەم وڵاتە دابەشبوانە تورکیایە. سەرکردەکانی ئەم وڵاتە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم پشتگیری نەریتی ئەتاتورکیان کرد، تورکیایان وەک وڵاتێکی سێکیولار و، مۆدێرن، هەروەها خۆرئاوایی پێناسە کرد. تورکیایان کرد بە هاوپەیمانی خۆرئاوا لە ناتۆدا بە هەمان شێوەش لە جەنگی کەنداو و، داوای بوون بە ئەندامیش دەکەن لە کۆمەڵگای ئەوروپی. هەرچۆنێک بێت لە هەمان کاتدا بەشێکی گرنگی کۆمەڵگای تورکی یارمەتی بوژانەوەیەکی ئیسلامی دەدەن و، پێیان وایە کۆمەڵگای تورکی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە. سەرەڕای ئەوەی کە نوخبەی دەسەڵاتداری ئەو وڵاتە کۆمەڵگای تورکی یان وەک کۆمەڵگەیەکی خۆرئاوایی پێناسە کردووە، بەڵام پێشەواکانی خۆرئاوا ڕەتیانکردوەتەوە کە تورکیا بەو شێوەیە قبوڵ بکەن، تورکیا نابێت بە ئەندام لە کۆمەڵگەی ئەوروپی هۆ سەرەکیەکەشی هەروەک سەرۆکی تورکیا (ت. ئۆزەڵ) دەڵێ «ئەوەیە کە ئیمە موسڵمانین و ئەوانیش مەسیحین، بەڵام ئەوان بە ئاشکرا ئەمە ناڵێن». پێشتر لە مەککە ڕەتکرایبێتەوە و, ئیستاش لە برۆکسل (پایتەختی بەلجیکایە، کە بارەگای یەکێتی ئەوروپای لێیە، و. کوردی) , تورکیا بۆ کوێ دەڕوانێت؟ کە دەکرێ تاشقەند وەڵامی ئەم پرسیارە بێت , کەوتنی سۆڤیەت بوارێک دەدات بە تورکیا بۆ ئەوەی ببێت بە ڕابەڕی بوژاندنەوەی شارستانیەتی تورکی کە حەوت وڵات دەگرێتەوە هەر لە سنوری یۆنانەوە تا دەگاتە ئەوانەی لە چینن. بە پاڵپشتی خۆرئاوا، تورکیا ئێستا هەوڵێکی زۆر دەدات

بۆ دروستکردنی شوناسێکی نوێ بۆ خۆی.
لە دەیەی هەشتای سەدەی بیستدا مەکسیک هەڵویستێکی تا ڕادەیەک هاوشێوەی تورکیای وەرگرت، هەروەکو چۆن تورکیا دەستی هەڵگرت لە هەڵوێستی مێژوویی خۆی دژ بە ئەوروپا و، هەوڵیشیدا پەیوەندیان پێوە بکات، بە هەمان شێوەش مەکسیک وازی لەوە هێنا کە خۆی وەک بەرهەڵستکارێکی ئەمریکا بناسێنێت و، لەبری ئەوە هەوڵ دەدات لاسایی ئەمریکا بکاتەوە و پەیوەندی بکات بە ناوچەی بازاڕی ئازادی ئەمریکای باکور. سەرکردەکانی مەکسیک خۆیان بە ئەرکێکی سەختەوە سەرقاڵکردووە , کە ئەویش دووبارە پێناسەکردنەوەی شوناسی وڵاتەکەیانە و، چاکسازی ئابوری بنەڕەتیان ئەنجامداوە کە لە کۆتاییدا سەردەکێشێ بۆ چاکسازی بنەڕەتی سیاسی.
لە ساڵی ١٩٩١ ڕاوێژکارێکی باڵای سەرۆکی مەکسیک (کارلۆس سالیناس دی گۆرتاری) بە درێژی باسی ئەو گۆڕانکاریانەی بۆ کردم کە حکومەتەکەی (سالیناس) ئەنجامی دەدان , کاتێک قسەکانی تەواو بوو، من پێم گووت: «زۆر سەرنج ڕاکێشە , بۆ من وا دەردەکەوێت کە ئێوە دەتانەوێ لە بنەڕەتەوە مەکسیک لە وڵاتێکی ئەمریکای لاتینیەوە بیگۆڕن بۆ وڵاتێکی ئەمریکای باکور» بە سەرسوڕمانەوە سەیری کردم بە جۆشەوە وتی «بەڵێ ڕاستە! ئەوە ئەو شتەیە ئێمە کت و مت دەمانەوێت بیکەین، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەرگیز نەماندەتوانی بە ئاشکرا بیڵێین.»
هەروەک لێدوانەکەی ئەو ڕاوێژکارە نیشانی ئەدات، لە مەکسیکیش بە هەمان شێوەی تورکیا، بەشێکی گرنگی کۆمەڵگا بەرهەڵستی دووبارە پێناسەکردنەوەی شوناسی وڵاتەکەیان دەکەن، بۆیە ئەو سەرکردانەی کە خوازیاری شوناسێکی نوێن , دەبێت چەند ئاماژەیە بکەن کە ئەوان پابەندن بە شوناسی وڵاتەکەیانەوە , وەکو ڕۆیشتن بۆ حەجی سەرۆکی تورکیا (ئۆزێل) و، هەروەها ڕێکخستنی لوتکەی ئەمریکای لاتین لە لایەن (سالین) ی سەرۆکی مەکسیکەوە.
لە ڕووی مێژووییەوە تورکیا یەکەمین وڵاتە لە دونیادا لە ڕووی قوڵی دابەشبونییەوە، نزیکترین وڵاتی دابەشبوش لە ئەمریکاوە مەکسیکە، بەڵام گرنگترین وڵاتی دابەشبووی جیهان ڕوسیایە، ئەو پرسیارەی کە هەمیشە لە مێژووی روسیادا دووبارە دەکرێتەوە ئەوەیە کە ئایا روسیا بەشێکە لە خۆرئاوا یاخود ڕابەرایەتی شارستانیەتێکی جیای سلافی - ئۆرسۆدۆکسی دەکات؟ ئەم مەسەلەیە بەهۆی سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکانەوە لەو وڵاتە ئاڵۆز بوو، کاتێک ئایدیۆلۆجیەکی خۆرئاواییان هاوردەکرد و لەگەڵ بارودۆخی روسیا گونجاندیان، پاشان بە ناوی ئەو ئایدیۆلۆجیایەوە تەحەدای خۆرئاوایان پێکرد. زاڵبونی کۆمۆنیستەکان بوو بەهۆی ڕاوەستاندنی ئەو مشتومڕە مێژووییەی کە لەسەر بەخۆرئاوایکردن لە بەرامبەر روسیاییکردن لەئارادا بوو. سەرباری ئەوەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە کۆمۆنیست ناو بانگیان دەرکرد، بەڵام جارێکی تر روسەکان ڕووبەڕووی هەمان پرسیار دەبنەوە. سەرۆک (یێلسن) بنەما و ئامانجە خۆرئاواییەکان لەخۆ دەگرێ و، ئەیەوێ روسیا بکاتەوە بە وڵاتێکی ئاسای و بەشێک لە خۆرئاوا. تا ئیستا نوخبە و ڕای گشتی روسیا ناکۆکن لەسەرئەم مەسەلەیە، (سێرگەی ستانکێڤیچ) یەکێکە لە میانڕەوە بەرهەڵستکارەکان کە پێیوایە روسیا پێویستە ئاراستەی «ئەتڵانتیکیەکان» ڕەتبکاتەوە «کە ببێتەوە بە ئەوروپی، ببێتە بەشێک لە ئابوری جیهانی بە شێوەیەکی خێرا و ڕێکخراو , ببێت بە هەشتەمین ئەندامی گروپی ٧ و، بایەخدانانی زیاتر بۆ ئەمریکا و ئەڵمانیا وەکو دوو وڵاتی باڵادەستی ناو ناتۆ

«لە هەمان کاتیشدا سیاسەتێکی ئۆراسیایی تەواویش ڕەتدەکاتەوە , سەرەڕای ئەوەش (ستانکێڤیچ) پێی وایە پێویستە روسیا ئەولەویەت بدات بە پاراستنی روسەکان لە وڵاتانی تر، بایەخی زیاتر بدات بە پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورک و موسڵمانەکان و، پەرەدان بە «دابەشکردنەوەی بەرچاوی سەچاوەکانمان , بژاردەکانمان , پەیوەندیەکانمان، بەرژەوندیەکانمان بە سودی ئاسیا، بە ئاراستەی خۆرهەڵات». ئەو خەڵکانەی بەم جۆرە بیر دەکەنەوە , ڕەخنە لە (یێلسن) دەگرن بەوەی کە بەرژەوەندیەکانی روسیای کردوەتە پاشکۆی بەرژەوەندیەکانی خۆرئاوا، هێزی سوپای روسیای کەمکردەوە، نەیتوانیوە یارمەتی هاوڕێ سونەتیەکانی ڕوسیا بدات بە وێنەی سربیا و، ئەنجامدانی گۆڕانکاری ئابوری و سیاسی بە شێوەیەک کە بەزیانی گەلی روسیا بوو. ئەم خواستانە نیشانەی دووبارە بڵاوبونەوەی بۆچونەکانی (پیتر ساڤتسکی) یە , کە لە بیستەکانی سەدەی رابردوو پێی وابوو روسیا خاوەنی شارستانیەتییەکی تایبەتی ئۆراسیاییە، دەنگی بەرهەڵستکارە توندڕەوەکان بەشێوەیەکی زەقتر ناسیۆنالیستەکان , دیدی دژە خۆرئاواییەکان، هەروەها دژە جووەکان، داوا دەکەن روسیا دووبارە پەرە بە هێزی سوپای خۆی بداتەوە و، پەیوەندی دروستبکات لەگەڵ چین و وڵاتە ئیسلامیەکاندا. گەلی روسیا بەهەمان شێوەی نوخبەی ئەو وڵاتە ناکۆکن لە سەر ئەم بابەتە , لە ساڵی ١٩٩٢ز ڕاپرسیەک دەریخست کە ٤٠٪ ڕای گشتی هەڵوێستێکی ئەرێی هەیە بەرامبەر بە خۆرئاوا و , ٣٦٪ نەرێی بوو، هەروەکو ئەوەی کە بەشێکی زۆری مێژووەکەی وا بووە، بەڕاستی ڕوسیا لە سەرەتای نەودەکان بەم لاوە وڵاتیکی دابەشبووە.

وڵاتی دابەشبوو بۆ ئەوەی دووبارە پێناسەی شارستانیەتی خۆی بکاتەوە پێویستی بە سێ پێشمەرج هەیە. یەکەم: بەگشتی دەبێ نوخبەی سیاسی و ئابوری پشتیوانی و، پەرۆشی ئەم هەنگاوە بن. دووەم: ڕای گشتی وڵاتەکە خواستیان لەسەر دووبارە پیناسەکردنەوەکە هەبێت و , پەسەندیبکەن. سێیەم: پێویستە گروپی سەرەکی ناو شارستانیەتی وەرگر ویستی ئەوەی هەبێت کە باوەش بکاتەوە بۆ گۆڕەر. تا ڕادەیەکی زۆر هەرسێ مەرجەکە لە بارودۆخەکەی مەکسیکدا بوونی هەیە، تا ئەندازەیەکیشی دوو مەرجەکەی سەرەتا لە تورکیادا هەیە، بەڵام روون نیە کە ئایا هیچ یەک لەو مەرجانە لە دۆخی روسیادا بونیان هەیە , بۆ پەیوەنیکردنی بە خۆرئاواوە.

ململانێی نێوان لیبراڵ دیموکراسی و مارکسیزم - لینینیزم، ململانێیەکی ئایدیۆلۆجی بوو کە سەرەڕای جیاوازییە گەورەکانیان، بە ڕەواڵەتیش بێت دوا ئامانجیان ئازادی و یەکسانی و خۆشگوزەرانی بوو، بەڵام روسیایەکی نەریتگەرا، دەسەڵاتگەرا و، ناسیۆنالیست دەکرێ ئامانجی تەواو جیاوازی هەبێت. خۆرئاواییەکی دیموکرات دەتوانێ مشتومڕێکی رۆشنبیرانە ئەنجام بدات لەگەڵ سۆڤێتییەکی مارکسیدا، بەڵام لەڕاستیدا مەحاڵە کە بتوانێت لەتەک روسییەکی نەریتگەرا ئەو کارە بکات.

ئەگەر , روسەکان دەست لە مارکسیەت هەڵگرن، لە هەمان کاتیشدا لیبراڵ دیموکراسی خۆرئاوا ڕەتبکەنەوە و، بەشێوەیەکی روسیایانە ڕەفتار بکەن نەک وەک خۆرئاواییەکان، بەم شێوەیە بێ پێدەچێت دووبارە پەیوەندیەکانی نێوان روسیا و خۆرئاوا دووربکەوێتەوە و، ململانێ ئامێز بێت.

## [پەیوەندی ئیسلام و کۆنفۆشیەس]

بەربەستەکانی بەردەم وڵاتە ناخۆرئاوایەکان کە ڕێگریان لێدەکەن بۆ پەیوەندیکردن بە خۆرئاواوە تاڕادەیەکی زۆر هەمە چەشنەیە. ڕێگرییەکان کەمترن بۆ وڵاتانی ئەمریکای لاتین و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، کەمێک زیاترن بۆ وڵاتە ئۆرسۆدۆکسەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو , بەڵام ئەو بەربەستانە لە کۆمەڵگاکانی هیندۆسیی، ئیسلامی، کۆنفۆشیەس و، بودایی هێشتا زۆر گەورەن. یابان دۆخێکی تایبەتی بۆ خۆی دروستکردووە وەک ئەندامێکی هاریکاریی خۆرئاوا، یابان لەچەند روویەکەوە لە ناو خۆرئاوایە و، لە چەند روویەکی تریشەوە لە دەرەوەی. ئەو وڵاتانەی کە بە هۆکاری کەلتوری و هێزەوە نایەنەوێت یاخود ناتوانن بچنە ریزی وڵاتانی خۆرئاواوە، کێبڕکێی خۆرئاوا دەکەن بە پەرەپێدانی هێزی سیاسیی، ئابوری و، سەربازیەکانی خۆیان. ئەوان ئەم کارە بە پەرەپێدانی ناوخۆیی و، هەروەها بە هاوکاری وڵاتە ناخۆرئاواییەکانی تر ئەنجامدەدەن. دیارترین شێوازی ئەم جۆرە هاوکاریانە ئەو پەیوەندیەی نێوان ئیسلام و کۆنفۆشیەسە کە بۆ رووبەڕووبوونەوەی بەرژەوندی، هێز و، بەهاکانی خۆرئاوا هاتووەتە ئاراوە.

زۆربەی وڵاتانی خۆرئاوا بەبێ جیاوازی لە هەوڵی کەمکردنەوەی هێزی سەربازی وڵاتەکانیانن، بەڵام روسیای ژێر دەسەڵاتی (یێڵسن)، چین و، کۆریای باکور، هەروەها چەند دەوڵەتێکی تری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە هەوڵی فراوانکردنی توانا سەربازیەکانی خۆیاندان، ئەویش لەڕێی هاوردەکردنی چەک لە سەرچاوە خۆرئاوایی و ناخۆرئاواییەکان و , بەهەمان شێوەش پەرەپێدانی کارگە خۆماڵییەکانی چەک. یەکێک لە دەرئەنجامەکانی ئەم دۆخەش وەک ئەوەی (چارڵس کرۆسامر) ناوی ناوە بریتیە لە پەیدابوونی «دەوڵەتی چەک» و , دەوڵەتانی چەک خۆرئاوایی نین. دەرئەنجامێکی تری بریتییە لە دووبارە پێناسەکردنەوەی ڕێککەوتننامەی کۆنترۆڵکردنی چەک، کە چەمک و ئامانجی خۆرئاوایە. ئامانجی سەرەکی لە ڕێککەوتننامەی کۆنترۆڵکردنی چەک لە کاتی جەنگی ساردا بریتی بوو لە دروستکردنی هاوسەنگیەکی سەربازی جێگیر لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت و , هاوپەیمانەکانیاندا.

ئامانجی سەرەکی ئەم ڕێکەوتننامەیە لە دونیای دوای جەنگی ساردا بریتیە لە ڕێگە نەدان بە وڵاتە ناخۆرئاواییەکان بەوەی گەشە بە توانا سەربازیەکانیان بدەن، بەشێوەیەک کە بەرژەوەندیەکانی خۆرئاوا بخاتە مەترسییەوە. خۆرئاوا هەوڵدەدات لە ڕێگای ڕێکەوتنامە نێودەوڵەتیەکانەوە ئەم کارە ئەنجامبدات , بە بەکارهێنانی گوشاری ئابوری و، کۆنترۆڵکردنی گواستنەوەی چەک و تەکنەلۆجیای سەربازی.

ململانێی نێوان خۆرئاوا و، وڵاتانی ئیسلام – کۆنفۆشیەسی بەزۆری نەک بە تەواوەتی لەسەر چەکی ئەتۆم، چەکی کیمیایی و بایۆلۆجی، موشەکی بالستی و، ئامرازەکانی تری گەیاندنیانن , هەروەها سیخوڕیی و ڕێنمایکردن و ڕێپیشاندانیان بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەیە. خۆرئاوا کە بانگەشە بۆ کەمکردنەوەی چەک دەکات وەک نەریتێکی گەردوونی و , ڕێککەوتننامەی کەمکردنەوەی چەک و، چاودێریکردنی وەک ئامرازێک بۆ بەدیهێنانی ئەم نەریتە بەکاردەهێنێت، هەروەها هەڕەشەی سەپاندنی سزای جۆراوجۆر لەو وڵاتانە دەکات کە پەرە بە بڵاوکردنەوەی چەکە پێشکەوتووەکان دەدەن، لە هەمان کاتیشدا پێشنیاری هەندێ قازانج بۆ ئەوانەی کە پێچەوانەکەی دەکەن. بێگومان سەرنجی سەرەکی خۆرئاواش لەسەر ئەو گەلانە دەبێت کە بە کردەوە یاخود بۆی هەیە ببن بە دوژمنی خۆرئاوا.

وڵاتــە ناخۆرئاواییەکانیش لەسەر مافی خۆیان جەختدەکەنەوە بۆ بەدەستهێنان و , بڵاوکردنەوەی هــەر جــۆرە چەکێک کە بۆ ئاسایشی وڵاتەکەیان پێویست بێت. هــەروەهــا تــەواو ئــەو راستیەیان زانیوە کە لە وەڵامــی پرسیارێک کە لە وەزیــری بەرگری هند کرا , کە چ شتێک لە جەنگی کەنداو فێربوویت؟ «شەڕی ئەمریکا مەکە , مەگەر ئەوەی چەکی ئەتۆمیت هەبێت». چەکی کیمیایی , ئەتۆمی و، موشەکەکان وا بیریان لێدەکەنەوە و، ئەکرێ هەڵەشبێت، وەک هێزێک کە دەتوانێت بەرامبەر چەکە ئاساییەکانی (تەقلیدی) خۆرئاوا بوەستێت، بێ گومان چین پێشتر چەکی ئەتۆمی هەبوو , پاکستان و هند توانای بڵاوکردنەوەیان هەیە، واش دەردەکەوێت ئێران، کۆریای باکور، عێراق، لیبیا، هەروەها جەزائیر هەوڵی بەدەستهێنانی بــدەن. یەکێک لە بەرپرسە باڵاکانی ئێران رایگەیاند کە پێویستە هەموو وڵاتانی ئیسلامی چەکی ئەتۆمی بەدەستبێنن، هەروەها وەک ئەوەی دەگوترێت لە ساڵی ١٩٨٨ سەرۆکی ئێران فەرمانی دەرکرد بۆ پەرەپێدانی «چەکە کیمیایی و , بایۆلۆجی , هەروەها تیشکیەکانیش».

گرنگترین ناوەندی پەرەپێدانی توانای سەربازی دژە خۆرئاوا بریتییە لە پەرەپێدانی بەردەوامی چین بە توانا سەربازی و ئامرازەکانی دروستکردنی توانایی سەربازی، کە بە گەشەیەکی ئابوری سەرسورهێنەر پشتگیری دەکــرێــت، چین بــە خێرایی خەریکی زیادکردنی تێچونی سوپاکەیەتی و، بە توندیش لەگەڵ مۆدێرنیزەکردنی هێزە چەکدارەکانی دەچێتە پێشەوە , چەکیش لە وڵاتەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەکڕێت، سەرەڕای پەرەدانیش بە موشەکی دوور مــەودا، لە ساڵی ١٩٩٢ ئامرازێکی ئەتۆمی یەک میگاتەنی تاقیکردەوە، خەریکی گەشەپێدانی توانای دەرهاوێشتنی هێزدایە (وزەی ناوکی , و. کــوردی)، لە هەوڵی بەدەستهێنانی تەکنەلۆجیای پێدانی سوتەمەنی ئاسمانیدایە، بەهەمان شێوەش هەوڵی کڕینی کەشتی فڕۆکەهەڵگر دەدات , زیادکردنە سەربازیەکانی و، جەختکردنەوەکانی لەسەر دەریاکانی باشوری وەک بەشێک لە سەروەری وڵاتەکەی، ئەبێتە هۆی دروستبونی کێبڕکێی چەند لایەنەی هەرێمیایەتی لە رۆژهەڵاتی ئاسیا. چین هەناردەکارێکی سەرەکی چەک و، تەکنەلۆجیای سەربازییە، هەندێ ماددەی هەناردەی عێراق و لیبیا کرد کە دەکرێت بەکاربهێنرێت بۆ دروستکردنی گازی ژەهــراوی مێشک، هاوکاری جەزائیری کرد بۆ بنیاتنانی (ریئاکتەر) کە گونجاو بوو بۆ لێکۆڵینەوەی چەکی ئەتۆمی و بەرهەمهێنانی ئەو چەکە، تەکنەلۆجیای ئەتۆمی بە ئێران فرۆشت کە بەرپرسانی ئەمریکا باوەڕیان وایە کە تەنها بۆ بەرهەمهێنانی چــەک بەکاردەهێنرێت، هــەروەک ئاشکراشە کەرەسەی پێکهێنەری موشەکی مەودای ٣٠٠ میلی هەناردەی پاکستان کردووە.

کۆریای باکور بۆ مایەک بەرنامەی چەکی ئەتۆمی بەگڕخستبوو و، موشەک و، تەکنەلۆجیای پێشکەوتوی موشەکی بە سوریا و ئێران فرۆشت. ڕەوتی چەک و، تەکنەلۆجیای سەربازی بە گشتی لە رۆژهەڵاتی ئاسیاوە بۆ رۆژهەڵاتی ناوەراستە , هەرچەندە جاروبار ئاراستەکە پێچەوانە دەبێتەوە، بۆ نمونە چین کە موشەکی «ستنگەر»ی لە پاکستانەوە هــاوردە کردووە.

بەم شێوەیە پەیوەندی سەربازی ئیسلام- کۆنفۆشیەس هاتووەتە ئــاراوە، ئەوەش بۆ ئەوە دروستکراوە کە پەرە بە توانای ئەندامەکانی بدات لە بەدەستهێنانی چــەک و، تەکنەلۆجیای ســەربــازی پێویست بۆ رووبــەڕووبــونــەوەی هێزی ســەربــازی خــۆرئــاوا، کە

ئەکرێت بەردەوام بێت یاخود نەخێر. هەرچۆنێک بێت لە ئیستادا هەر وەک (دەیڤ واک کرودی) ناوی ناوە «هاوپەیمانی دوولایەنەی هەڵگەڕاوەکان , کە لەلایەن خۆ پڕچەککەرەکان و پشتگیرەکانیانەوە دەبرێت بەڕیوە» , بەم شیوەیە شێوازێکی نوێی کێبڕکێی خۆپڕچەککردن لە نێوان ئیسلام - کۆنفۆشیەس و، خۆرئاوادا ڕوودەدات. بە شێوازی کۆنی کێبڕکێی چەک، هەرلایەنە و هەوڵ دەدات گەشە بدات بە چەکەکانی خۆی بۆ دروستکردنی هاوسەنگی یاخود بە دەستهێنانی سەروەرێتی بە سەر ئەوی دی، بەڵام لەم شێوازە نوێیەی کێبڕکێی چەک، لایەنێک پەرە بە چەکەکانی خۆی دەدات و، لایەنەکەی تر لە هەوڵی هاوسەنگکردن نیە، بەڵکو ئەیەوێ سنورداری بکات و زیادکردنی چەک قەدەغە بکات، لە هەمان کاتیشدا توانا سەربازیەکانی خۆی کەمبکاتەوە.

## [کاریگەریەکانی سەر خۆرئاوا]

ئەم وتارە موشتومڕی ئەوە ناکات کە شوناسی شارستانیەتی جێگەی هەموو شوناسەکانی تر دەگرێتەوە، دەوڵەت نەتەوە نامێنێت , هەروها هەموو شارستانیەتیەک دەبێت بە تاکە قەوارەیەکی پێکەوەنوساوی سیاسی و، گروپەکانی ناو شارستانیەتیەک ململانێ بگرە شەڕی یەکدی ناکەن. هێندەی بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە گریمانەیەکە لەسەر ئەوەی جیاوازی نێوان شارستانیەتیەکان واقعی و گرنگیشن، ئاگایی شارستانیەت لە زیادبووندایە، هەروەها ململانێی نێوان شارستانیەتیەکان جێگەی ململانێ ئایدیۆلۆجی و جۆرەکانی تری ململانێش دەگریتەوە، وەکو شێوازێکی نوێی ململانێی بەسەر جیهاندا زاڵ دەبێ (پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان).

لە ڕووی مێژووییەوە ئەو گەمە سیاسیەی لە نێو شارستانیەتی خۆرئاوادا ئەنجامدراوە، بەڵام ئێستا بەردەوام بەرەو ناخۆرئاوایی هەنگاو دەنێت، کە تیایدا ناخۆرئاواییەکان گەمەکەر دەبن نەک ئامراز و بابەتی گەمەکە بن و، ئەگەری سەرکەوتنی دامەزراوە سیاسی و، ئابوری و، ئەمنییەکان زیاتر لە ناو شارستانیەتێک دەبێت وەک ئەوەی لە نێوان شارستانیەتیە جیاوازەکاندا بێت. ململانێی نێوان گروپەکانی شارستانیەتیە جیاوازەکان زیاتر و زیاتر دەبێت و، توندو تیژتر و، درێژخایەنتریش دەبێت بە بەراورد بە ململانێ ناوخۆییەکانی شارستانیەتێکی دیاریکراو , هەروەها مەترسی تەشەنەکردنی ململانێیەک بۆ جەنگێکی جیهانی زیاتر لە ململانێی نێوان گروپەکانی شارستانیەتیە جیاوازەکان چاوەڕێی دەکرێت وەک لە ململانێی ناوخۆی شارستانیەتێک. هەرە گرنگترین تەوەری دونیای سیاسەت لە ئایندەدا بریتی دەبێت لە پەیوەندی نێوان «خۆرئاوا و ئەوانیتر». سەرکردەکانی چەند وڵاتێکی دابەشبووی ناخۆرئاوایی بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدەن کە وڵاتەکەیان بکەن بە بەشێک لە خۆرئاوا، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ڕووبەڕووی ئاستەنگی گەورە دەبنەوە لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا، هەروەها سەرنجی سەرەکیش بۆ ململانێ لە داهاتویەکی نزیکدا لە نێوان خۆرئاوا و، چەند وڵاتێکی ئیسلام- کۆنفۆشیەسیدا هەیە.

ئەمە بانگەواز نیە بۆ پەسەندکردنی ململانێی نێوان شارستانیەتیەکان، هێندەی بریتییە لە بڵاوکردنەوەی گریمانەیەکی وەسفی لەسەر ئەوەی کە ئایندە چۆن دەبێت، هەرچۆنێکیش بێت ئەگەر ئەمانە کۆمەڵێک گریمانەی بەجێ بن , پێویستە بایەخ بە کاریگەریەکانی بدەین لە سەر سیاسەتی خۆرئاوا و، کاریگەریەکانیشی دابەشبکرێت لە نێوان سودی کورت مەودا لەگەڵ

گونجانی درێژ مەودادا. لە مەودای کورتدا بە ڕوونی لە بەرژەوەندی خۆرئاوادایە کە پەرە بە هەمئاهەنگی و یەکێتی نێوخۆیی شارستانیەتیەکەی خۆی بدات، بە تایبەت لە نێوان پێکهاتە ئەوروپی و ئەمریکای باکوریەکەیدا , بۆ یەکخستنی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ئەمریکای لاتین کە کەلتورەکانیان نزیکن لە کەلتوری خۆرئاوا، وە بۆ پێکهێنانی چوارچێوەیەکی گەورەتر کە ئەویش کۆمەڵگای خۆرئاوایە. بەرزکردنەوە و پاراستنی ئاستی پەیوەندی و هەئاهەنگیەکان لە گەڵ روسیا و یابان بۆ چەند مەبەستێک لەوانە: بۆ ڕێگریکردن لە پەرەسەندنی ململانێی لۆکاڵی نێوان شارستانیەتیەکان بۆ شەڕی گەورەی نێوان شارستانیەتیەکان، بۆ سنورداركردنی گەورەبوونی هێزی سەربازی وڵاتانی ئیسلام – کۆنفۆشیەسی، بۆ خاوکردنەوەی پرۆسەی کەمکردنەوەی توانا سەربازیەکانی خۆرئاوا و، پاراستنی باڵادەستی سەربازی خۆرئاوا بە سەر ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا , بۆ بەکارهێنانی جیاوازی و ململانێکانی نێوان وڵاتانی ئیسلام– کۆنفۆشیەسی، بۆ یارمەتیدانی گروپەکانی شارستانیەتیەکانی تر کە هاوسۆزن لەگەڵ بەها و بەرژەوەنیەکانی خۆرئاوا، بۆ بەهێزکردنی ئەو دامەزراوە نێودەوڵەتیانەی کە ڕەنگدانەوەی بەهاوبەرژەوەندیەکانی خۆرئاوایە و، دەشیان شەرعێنێ , وە هەوڵدان بۆ زیادکردنی بەشداری وڵاتە ناخۆرئاواییەکان لەو جۆرە دامەزراوانەدا.

لە ئاستی دوور مەودادا هەندێک پێوەری تر پێویستن. شارستانیەتی خۆرئاوا مۆدێرن و خۆرئاوایشە، بەڵام شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکان هەوڵیانداوە ببن بە مۆدێرن بەبێ ئەوەی ببن بە خۆرئاوایی. تا ئیستاش بەتەنها یابان سەرکەوتو بووە لە بە دەستهێنانی ئەم خواستەدا. شارستانیەتیە ناخۆرئاواییەکان بەردەوام دەبن لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سامان , تەکنەلۆجیا , پسپۆری , ئامێر هەروەها چەک , کە بەشێکن لە مۆدێرنە بوون، لە هەمان کاتیشدا هەوڵی گونجاندنی مۆدێرنە دەدەن لەگەڵ بەها و کەلتور و نەریتەکەیانیاندا. ڕێژەی هێزی ئابوری و سەربازیان بەراورد بە خۆرئاوا لە زیادبوندایە، لێرە بەدواوە خۆرئاوا ناچارە زیاتر خۆی لەگەڵ ئەم شارستانیەت مۆدێرنە ناخۆرئاواییانە بگونجێنێ کە هێزیان نزیک دەبێتەوە لە هێزی خۆرئاوا، بەڵام بەها و بەرژەوەندیەکی تاڕادەیەکی زۆر جیاوازە لە هی خۆرئاوا , بەمشێوەیەش پێویستە خۆرئاوا پارێزگاری لە هێزی ئابوری و سەربازی پێویست بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە پەیوەندی بەم شارستانیەتانەوە بکات، هەروەها خۆرئاوا پێویستی بە تێگەیشتنێکی زیاتر هەیە لەو بنەما ئاینی و گریمانە فەلسەفیانەی کە بنچینەی شارستانیەتیەکانی تر پێکدەهێنن و، ئەو شێوازەی کە گەلانی شارستانیەتیەکانی تر لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەڕوانن، کە ئەمەش پێویستی بە هەوڵدان هەیە بۆ ناساندنی توخمی هاوبەشی نێوان خۆرئاوا و شارستانیەتیەکانی تر، پەیوەست بە ئایندەشەوە، شتێک نابێت بە ناوی شارستانیەتی جیهانیەوە (گەردوونی)، بەڵکو لە بری ئەوە دونیایەک دەبێت کە پێکدێت لە شارستانیەتگەلێکی جیاواز , هەریەکەشیان ناچارن فێری پێکەوە ژیان بن لەگەڵ یەکتردا.

( تێبینی ئەم وتارە لە هاوینی ١٩٩٣ ز نوسراوە، بۆیە هەندێ جار نوسەر گوزارەگەلێکی هاوشێوەی «ساڵانی سیەکان» یاخود «هەشتاکان» بەکارهێناوە، بەڵام وەرگێڕ بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتنی خوێنەر گوزارەی «سەدەی رابردوو» ی خستۆتە پاڵیەوە... وەرگێڕ )

# بیرمەندانی تیۆری دیموکراسی دەستەبژێرەکان

نوسینی: د. مەلیک یەحیا سەڵاحی
و. لە فارسییەوە: کارزان محەمەد

## پێشەکی

چەمکی (دەستەبژێر) یاخود (ئیلیت) (Elit) لە وشەی لاتینی (Eligere)ەوە وەرگیراوە، ئاماژەیە بۆ گروپێک یاخود کۆمەڵە کەسێک کە خاوەنی پێگەیەکی باڵای (سیاسی، ئایینی، کۆمەڵایەتی، ڕووناکبیری، زانستی...هتد)ن لەنێو کۆمەڵگاکەیاندا، ئەم پێگەیەش زەمینەیان بۆ دەڕەخسێنێ تا لە سیستەمی دیموکراسیدا لەڕێگەی سندوقەکانی هەڵبژاردنەوە بگەنە دەسەڵات، پاشان وەک دەستەبژێرێک سیستەمی حکومڕانی بە نوێنەرایەتی جەماوەر بەڕێوەببەن.

تائەمڕۆش سێ تیۆریستی بەناوبانگ (ژۆزیف شۆمپیتەر، ڕۆبەرت داڵ، جیڤانی سارتۆری)، لەسەر ئاستی جیهان بەوە ناسراون مەسەلەی دەستەبژێرایەتی و حکومڕانی پۆلیاریشی یاخود جەماوەرییان خستۆتە ژێر شرۆڤە و ڕەخنەوە، لێرەدا بۆچوونی هەرکامیان سەبارەت بەو چەمکە خراوەتەڕوو.

***

تیۆریستە دەستەبژێرەکان لە بنەڕەتدا بڕوایان بە دیموکراسی و حکومەتی خەڵک نییە، پێیانوایە ئەو حکومەتەی دەسەڵاتەکەی لەنێو تاکەکانیدا دابەش کرابێ، لە بواری مەیدانیدا وەدینایەت.

جەماوەر بەپێچەوانەی بۆچوونی بانگەشەکارانی دیموکراسییەوە، توانستی بەڕێوەبردنی خۆیان نییە چ جای بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا، هەربۆیەشە دیموکراسی تەنها لە خەیاڵدا دێتەدی و لە پراکتیکدا نایەتەدی، چونکە سەرجەم حکومەتەکانیش وێڕای ناوە جۆراوجۆرەکانیان، هەموویان حکومڕانی تاکەکەسی یاخود گروپێکن کە لە هەندێ بارودۆخدا سیمایەکی جەماوەریی بەخۆوەدەگرن، لەکاتێکدا لە ناواخندا هەمان حکومەتە ئۆلیگارشی یاخود تاکڕەوەکانن و لە یەک گوتەدا دەشێ بڵێین دەسەڵاتخوازەکانن.

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا بەتایبەتی دوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، کۆمەڵێک وەرچەرخان لە هزر و مەیدانی کۆمەڵگاکانی جیهان بەتایبەت لە وڵاتە پیشەسازییەکانی خۆرئاوا هاتەئارا کە پەیڕەوانی (دەستەبژێرەکان)یش لە قبوڵکردنی ئەم وەرچەرخانانەدا نەچوونە پەراوێزەوە.

بەمانایەکی دیکە، پەیڕەوانی قوتابخانەی دەستەبژێرە نوێیەکان، ئەوەیان قبوڵ کرد کە بەها دیموکراسییەکان لە بواری تیۆریی دا پێگەی خۆی دەپارێزێت، بەڵام لە بواری پراکتیکدا ئەگەرچی بنچینەی پلورالیزم پێکدێنێ و پێویستی بە پشتیوانی جەماوەرە، بەڵام ڕێباز و ڕێوشوێنەکانی لەسەر بنەمای دەستەبژێرایەتییە.

ئەم بابەتەش ئەوە دەگەیەنێت لە دیموکراسیدا ناتوانرێ کۆنترۆڵی دەسەڵات هەروەک بانگخوازە کلاسیکییەکانی دیموکراسی بڕوایان پێی هەبوو، بە جەماوەر بسپێردرێت بەڵکو لە دیموکراسییە نوێیەکاندا کۆمەڵێک دەستەبژێر بەپێی پرۆسەی هەڵبژاردن لەلایەن جەماوەر و بە پشتیوانی ئەوان دەگەنە دەسەڵات، بەڵام خودی دەستەبژێرەکان حکومڕانن.

کەواتە ئەگەر بمانەوێ دیدگایەکی پراکتیکیانەتر و ژیرانەترمان بۆ مەسەلەکە هەبێت، پێویستە بابەتەکە لە دیدگای دەستەبژێرە نوێیەکانەوە بەم چەشنە واڵا بکەین کە لە سەرەتاوە هەموو کۆمەڵگا سیاسییەکان وێڕای جۆراوجۆری ناو و تەنانەت چەمکەکانیشیان، هەر بەپێی کۆنترۆڵی دەستەبژێرەکان کار دەکەن، ئەگەر ململانێیەکیش هەبێت ئەوا ئەم ململانێیە لەنێوان دەستەبژێرەکاندا دەبێت نەک لەنێوان جەماوەردا.

لەلایەکی ترەوە، لە سیستەمە دیموکراسییە نوێیەکاندا، ئەم ململانێیە خەسڵەتێکی دیموکراسیانەی هەیە و سیستەمەکە بەجۆرێ ئۆرگانیزە کراوە کە گروپێک یاخود تاکەکەسێک ناتوانێ ڕێگە لەم ململانێیە بگرێت، چونکە (دەستەبژێرە دەسەڵاتدارەکان) گەمەی هێز یاخود وەرگرتنی دەسەڵاتیان لەلایەن جەماوەر و بە پشتیوانی جەماوەرەوە وەک سیستەمێک پێبەخشراوە، بەو هۆیەوە ئەگەر بمانەوێ تیۆری نوێی دەستەبژێرەکان کە بۆ بواری پراکتیک شیاوترە، بخەینە بەردەم شرۆڤەوە ئەوا پێویستە لەژێرناوی (تیۆری دیموکراسی دەستەبژێرەکان) تاوتوێی بکەین کە تیایدا دەسەڵات نەک قۆرغ نەکراوە، بەڵکو لەنێو گروپە جۆراوجۆرە سیاسی و ئابوری و ڕۆڵگێڕەکاندا دابەش بووە و پشت بە پشتیوانی خەڵک دەبەستێت.

بەم شێوەیە بیروباوەڕی گرنگترین تیۆریستانی ئەو بوارە دەخەینەڕوو.

گرنگترین تیۆریستانی ئەم قوتابخانەیەش بریتین لە:

تا سۆشیالیزم لەنێو دیموکراسیدا بەرەوپێش بچێت، یاخود بەمانایەکی تر سیستەمێکی دیموکراسی بەدەست ڕێبەرە دەستەبژێرەکان بسپێرێت.
یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی (شۆمپیتەر) لەوەدایە کە بۆ سەلماندنی تیۆرەکەی خۆی، هاوکات سود لە هەردوو دیدگا سیاسی و بیروبۆچوونە ئابورییەکانی دەبینێت، لەپێناو گەیشتن بە تیۆرییە دروست و پراکتییەکانی خۆیدا، یارمەتی لەو دوو بازووە گرنگە ژیارییە کۆمەڵایەتییەی مرۆڤەکان وەردەگرێت.
دیموکراسی سیستەمێکە تیایدا خودی خەڵک لەنێو هەناویدا هەنگاو دەنێت، هەربۆیە هەمیشە کۆمەڵێک خاڵی سەرنجڕاکێشی لەخۆگرتووە، بەڵام کێشە سەرەکییەکەی لەوەدایە بەدرێژایی مێژوو هەر لە سەردەمی یۆنانی کۆنەوە تا ئەم سەدەیەی ئێستا (بەلایەنی کەمەوە تا سەرەتای سەدەی بیستەم) بەو چەشنەی لایەنگرانی دیموکراسی ویستویانە، لە بواری پراکتیکدا بۆیان نەهاتۆتەدی. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی (خواستەکانی مرۆڤ) هەمیشە لەگەڵ (خێرو بەرژەوەندی گشتی) لە سەرجەم مەیدانەکان و تەنانەت زۆرجار لە هەندێ بواردا نەیانتوانیوە پێکەوە بگونجێن. هەر مرۆڤێک خێروبەرژەوەندی گشتی لە دیدگا و بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی و گروپەکەیەوە دەبینێت.
لە بنەڕەتدا پرەنسیپی (بەرژەوەندخوازی) کە جەوهەری دیموکراسییە، لە بواری پراکتیکدا دەبێتەمایەی لەناوچوونی ئەو بەرژەوەندخوازییە، هەربۆیەشە هەمیشە نەیارانی ئەم سیستەمە پێیانوایە دەرەنجامی سیستەمی دیموکراسی بە ئاژاوە کۆتایی دێت.
هەروەها (شۆمپیتەر) پێی وایە دیموکراسی سیستەمێکە تیایدا هاوڵاتیان دەبنە خاوەنی سیستەمێکی ئۆرگانیزەکراو، بڕیارە سیاسییەکانیشی دەبێتەمایەی هێنانەدی ئامانجەکانیان.
بێگومان (شۆمپیتەر) لە هەموو کەس پتر خاڵە لاوازەکانی دیموکراسی ناسیوە و ئاگاداری گیروگرفتی لەیەکتر نزیککردنەوەی خواست و


١ - جۆزیف شۆمپیتەر

(شۆمپیتەر)ی ئابوریزانی بەناوبانگی ئەمریکا و بەڕەگەز نەمسایی، لە پەیڕەوانی قوتابخانەی بەرژەوەندگەراییە.
ناوبراو لە ساڵی (١٩٣٢ز) لە زانکۆکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستی دایە وانەبێژی، لە ساڵی (١٩٤٢ز) بەناوبانگترین پەرتوکی ئابوری سیاسی خۆی لەژێرناوی (سەرمایەداری، سۆشیالیزم و دیموکراسی) بڵاوکردەوە.
ئەگەرچی ناوبراو لە پەیڕەوانی دیموکراسییە، بەڵام سۆشیالیزمیش بەرز دەنرخێنێ، ئەم بیروبۆچوونەشی لە ئاستێکدا بوو کە هەندێکجار خوێنەرەکانی واهەست دەکەن (شۆمپیتەر) سۆشیالیستە و سەلماندنی گریمانەکەشی بە سەرکەوتنی سۆشیالیزم کۆتایی دێت، لەکاتێکدا ئەو نە سۆشیالیستە بەمانای ئەمڕۆ و نە دیموکراتیشە بە مانا کلاسیکییەکەی، بەڵکو (شۆمپیتەر) هەوڵ دەدات سیستەمێک وێنا بکات

بەرژەوەندییەکانی هاوڵاتیان و کۆمەڵگایە. ئەو مەسەلەکە بەم چەشنە دەخاتەڕوو کە هاوڵاتیان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان، گروپێک وەک (داڕێژەری یاسا) هەڵدەبژێرن تا ئەوانیش بەپێی ئەرکی خۆیان گروپێکی تر هەڵببژێرن و پشتیوانیان لێ بکەن ئەویش بریتین لە (دەسەڵاتی جێبەجێکردن) لە کۆمەڵگادا.

کەواتە شۆمپیتەر ئەو گروپە هەڵبژێردراوە بە ڕایەڵەی نێوان میللەت و دەسەڵاتدار دادەنێ کە هەوڵ دەدەن بەپێی ململانێی جەماوەری، زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بهێنن، ئەم پرۆسەیەش لە کەشێکی ململانێئامێزدا ئەنجام دەدرێت، چونکە مۆدیلی (دیموکراسی راستەوخۆ)ی یۆنانی کۆن، رەنگە بۆ کۆمەڵگا گچکەکان شیاو بێت، بەڵام بەهیچ شێوەیەک بۆ کۆمەڵگا مامناوەند و گەورەکان ناشێ و نایەتەدی، لەبەر ئەم فاکتەرە پێویستە لە بری ئەوە، جەماوەر گروپێکی گچکە هەڵببژێرن و کورسی دەسەڵاتیان پێببەخشن تا بەنوێنەرایەتی (جەماوەر) لەڕێگەی بڕیارە سیاسییەکانەوە، ئامانجەکانی دەنگدەران بهێننەدی.

لە ڕوانگەی شۆمپیتەرەوە، تایبەتمەندییەکانی سەرمایەداری لیبراڵە نوێیەکان لەلایەکەوە بریتیە لە (موڵکایەتی تایبەتی، ئازادی چالاکییە ئابورییە تاکەکەسییەکان و دەست وەرنەدانی دەوڵەت لە کەرتی تایبەتی) و لەلایەکی ترەوە چالاکییە ئابورییەکانی دەوڵەت وەک لایەنێکی داهێنەر و وردبین، چاودێریی گشت کۆمەڵگا دەکات لەپێناو چارەسەری کەموکوڕییەکانی کەرتی تایبەت، ئەمانەش لە خەسڵەتەکانی سیستەمی ئەمڕۆی دیموکراسین.

هەردوو تەوەرەی سەرەکی توێژینەوەکانی شۆمپیتەر کە یەکێکیان پرەنسیپی کلاسیکیانەی لیبراڵیزم و ئەویتریان سۆشیالیزمە، هاوکات لەگەڵ بیروبۆچوونە ئابورییەکانیدا، دەبێتەمایەی ئەوەی هەم (ئازادی کاری ململانێ) و هەم لایەنە دژەکەی واتا (مۆنۆپۆڵکردنی تەواوەتیانە)، بخاتە بەردەم شرۆڤەوە.

سەرەنجام بیروباوەڕەکانی شۆمپیتەر لە مۆدێلێکدا کۆدەبنەوە، ئەویش ئاوێتەیەکە لە بیری کلاسیک و بەشێک لە دیدگاکانی مارکس کە بە جۆرێک لەگەڵ یەکتردا موتوربە دەبن هەم هەلومەرجی سیستەمی ململانێی بازاڕی ئازاد و تەواوەتیانەی هاوڵاتیانی تیادا بپارێزرێت، هەم هەلومەرجی مۆنۆپۆڵکاریی و دەستوەردانی دەوڵەتیش لەخۆبگرێت.

کەواتە لە ڕوانگەی ئەوەوە، دیموکراسی سیاسی سیستەمێکە تیایدا دەسەڵات پشتیوانی لە خەڵک دەکات، بەڵام هەڕەمی دەسەڵاتی جێبەجێکاریش لە دەستی کۆمەڵێک دەستەبژێردایە.

شۆمپیتەر لە بەشی (٢٢)ی پەرتوکەکەی خۆیدا، ڕێبازی ململانێی سیاسی لەپێناو وەدەستهێنانی سەرکردایەتی سیاسی دەخاتەڕوو. لەمبارەیەوە دەڵێت: دیموکراسییە نوێیەکان لەسەروەختی ململانێدا، دەچنە بەردەم خواستی جەماوەرەوە، سەرەنجام کۆمەڵێک گروپ لەنێو ئەم کۆمەڵگایەدا چانسی ئەوە بەدەست دەهێنن کە بەپشتیوانی جەماوەر، دەسەڵاتی سیاسی بگرنەدەست و بە نوێنەرایەتی خەڵکیش بڕیار بدەن. خاڵی سەرنجڕاکێشیش لەوەدایە بڕیارەکانی دەستەی دەسەڵاتدار کە لەلایەن میللەتەوە گەیشتوونەتە دەسەڵات، هەمیشە لەگەڵ خواست و بەرژەوەندییەکانی جەماوەر و لە هەندێ کاتیشدا لەگەڵ کەمینەکانیشدا تەبا نییە، هەر لە بنەڕەتەوە دەستەی دەسەڵاتدار لە بڕیارەکانیاندا خۆیان بە بەرپرس و وەڵامدار نازانن لە بەردەم جەماوەردا.

لەوەش پتر، چینوتوێژە دەنگدەرەکان لە پرۆسەی هەڵبژاردندا (بەتایبەتی لە کۆمەڵگای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) هێندە دەچنە ژێر کاریگەری پڕوپاگەندە بە مانا سیاسییەکەی، ئیدی تائەندازەیەک ئیرادەیان لەدەست خۆیاندا نامێنێ.

لە ڕاستیدا سیاسەتمەداری حیزبی و دامودەزگا حیزبییەکەی، وەڵامی ئەو هەلومەرجانە دەدەنەوە.

سیاسەتمەداران و دەستەبژێرە حیزبییەکان،

هەوڵ دەدەن تا ململانێی هەڵبژاردن بەشێوازێکی وردەکارانە لەگەڵ گروپێکی زلهێزی ئابوری و دارایی دا ئەنجام بدەن، لەم ڕووەوە سود لە هەر جۆرە تەکنیک و ئامرازێکی سایکۆلۆژیانەی وەک دەستەی مارش و موزیک وەردەگرن تا جەماوەر بەرەو ئاقاری ئامانجەکانی سیاسەتمەدارانی حیزبی بە ئاقاردا ببەن.
بەمانایەکی وردتر، پێویستە بڵێین سیاسەتمەدارانی حیزبی و پرۆسەی فۆرمەڵەبوونی دەسەڵاتی سیاسی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، وەک یەکێک لە سیستەمە دیموکراسییە مۆدێرنەکان، بەشێک لە ژیانی سیاسی ئەم کۆمەڵگایە پێکدێنێت.
بەمشێوەیە شۆمپیتەر کۆمەڵێک دامــەزراوەی ئۆرگانیزەکراو دەخاتەڕوو کە تیایدا هاوڵاتیان و دەستەبژێرەکان لەپێناو بەدەستهێنانی بڕیار و دەسەڵاتی سیاسیدا، دەست بە ململانێی ئازادی هاوشێوەی میکانیزمی بازاڕ دەکەن تا بەمشێوەیە دەنگی خەڵک ببەنەوە و کورسییەکانی پارلەمان و وەزارەت بەدەست بهێنن.
بەپێی دەرەنجامی مۆدیلی شۆمپیتەر، ئازادی لەم چەشنە حکومەتەدا (واتا دیموکراسیزمی نوێ)، لە ڕاستیدا ئازادی ململانێی نێوان دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگایە لەپێناو بەدەستهێنانی دەســەڵات و سەرەنجام بڕیاردانی ئەم دەستەبژێرانەیە لەسەر مەسەلە سەرەکییە ئابوری و سیاسییەکانی کۆمەڵگا.
بە هیچ شێوەیەک گفتوگۆ لەسەر ئازادی تاکەکەس بە مۆدیلە کلاسیکییەکەی یۆنان یاخود ئەو دروشمە سەرەتاییانە ناکرێت کە لە سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، واتا ئەو دروشمانەی لەنێو دیدگاکانی (ئادەم سمیس)دا هەبوون یاخود تەنانەت هەروەک (ژان ژاک ڕۆسۆ) لە حکومڕانی زۆرینەی خەڵک خستوویەتەڕوو، بەڵکو هەقیقەتی کۆمەڵگا دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ و هەمەجۆری دەستەبژێرەکان بەو چەشنەیە کە پێشتر (ڤیلفیریدۆ پاریتۆ) خستویتەڕوو بەو مەرجەی ئازادی لەپێناو بەدەستهێنانی دەسەڵاتدا بۆ دەستەبژێرەکان فەراهەم کرابێت.

(سامۆیل هانتینگتۆن)یش مۆدیلەکەی شۆمپیتەری بـەرز نرخاندووە، ناواخنی دیموکراسی چەرخی ئێستای وڵاتە پیشەسازییەکانی خۆرئاوا بەهەمان ئەو شێوازەی دەزانێ کە شۆمپیتەر بەتێروتەسەلی خستویەتەڕوو .



## ب - ڕۆبـەرت داڵ

(ڕۆبەرت داڵ) هەروەک شۆمپیتەر جەخت لەسەر بارودۆخی ئەمڕۆی دیموکراسی دەکاتەوە، لەپێناو سەلماندنی تیۆرەکەی خۆیدا سەبارەت بە بواری مەیدانی و هەقیقەتی ئەمڕۆی دیموکراسی، سود لە چەمکی (پۆلیارشی) وەردەگرێت.
بەپێی بۆچوونی ئــەو، هەقیقەتی دیموکراسی لەگەڵ بارودۆخ و ئاڵۆزێتی کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا ناتەبایە، هەربۆیەشە دیموکراسی لە پێناسە کلاسیکییەکەی خۆیدا سیستەمێکی نایابە بەڵام بە

مەحاڵ دێتەبەرچاو، لەکاتێکدا هەقیقەتی کۆمەڵگا دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ هاوشێوەی سیستەمی حکومڕانی فرەگروپ یاخود پۆلیارشییە.

لە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا، ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی بە چەشنێکە کە کۆمەڵێک گروپی زیاتر حەز بە سەرکردایەتی سیاسی دەکـەن، ئـەم چانسەش لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا بەچەشنێ سازدراوە کە چەندین گروپ لەبری یەک گروپ، ململانێ لەپێناو بەدەستەوەگرتنی دەسـەڵاتـی سیاسیدا دەکـەن و لەڕێگەی بەدەستهێنانی دەنگی جەماوەرەوە سەردەکەون.

بەمانایەکی تر دیموکراسی بۆتە گۆڕەپانێکی شیاو بۆ ململانێی ئازادانەی چەند گروپێک، بەجۆرێک خەڵک تائەندازەیەک دەتوانن چاودێریی بەسەر ململانێکانی گروپە رکابەرەکاندا بکەن، هەر ئەو گروپە رکابەرانەش دەبنە گرەنتی پاراستنی سیستەم و درێژەپێدانی دیموکراسی نوێنەرایەتی.

بەبڕوای ئەو، پێشمەرج بۆ ئەو چەشنە حکومڕانییە گەشەپێدانی ئابورییە، ئەم گەشەپێدانەش پێویستی بە سەرچاوەی ئابوری بەهێز و گەیشتن بە ئاستی ژیانێکی دیاریکراو بۆ هاوڵاتیان هەیە، بەجۆرێک جەماوەر لە دەرەوەی پێداویستییە مادییەکانی خۆی، ئـازادی هەڵبژاردنی لەپێناو بڕیارەکانیدا هەبێت و پێویستی بە وابەستەبوونی ماددی نەبێت . بەمانایەکی تر، لە ڕوانگەی ئـەوەوە گۆڕەپانی گەشەپێدانی سیاسی و ئابوری کە گرنگترین بەردی بناغەی دیموکراسین، دەشێ بە پۆلیارشیش ناوزەد بکرێت.

وێڕای ئەمانەش پرۆسەی دەسەڵاتی یاسادانان و دامەزراندنی پارتە سیاسییەکان کە بە تەواوەتی هەلومەرجی ململانێیان بۆ فەراهەم کراوە، ڕۆڵیان لە هێنانەئارای پۆلیارشییەکانی ئەمڕۆدا هەبووە.

یەکێک لە خەسڵەتەکانی پۆلیارشی، چارەسەری ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکانی نێوان دامـەزراوە و گروپە جۆراوجۆرەکانی نێو کۆمەڵگایە، لەکاتێکدا لە سیستەمە ناپۆلیارشییەکاندا دەبێ بۆ چارەسەری شەڕو کێشەکانی تاکەکەس و کۆمەڵگا سود لە (ستەم) و (فشار) وەربگرن.

ئەو لەپێناو دەستنیشانکردنی پلەی دیموکراسی لە سیستەمە پۆلیارشییەکاندا، دوو خەسڵەت دەخاتەڕوو:

یەکەم: لە سیستەمی پۆلیارشیدا مافی بەشداریی لەپێناو هەڵبژاردنی سەرکردە سیاسییەکان بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگاکە بەبێ لەبەرچاوگرتنی چینە کۆمەڵایەتییەکان، فەراهەم هێنراوە.

دووەم: کاندیدەکان بۆ سەرۆکایەتی سیاسی، لە هەلومەرجێکی تـەواو ئـازاد و یەکساندا ململانێ لەپێناو بەدەستهێنانی دەنگی خەڵک و سەرەنجام بردنەوەی کورسییەکانی هەڵبژاردن و حکومەتدا دەکەن.

(داڵ) لەو بڕوایەدایە ئاستی (کۆمەڵایەتی- ئابوری) لە هەر وڵاتێکدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە یەکالاکردنەوەی ناکۆکییەکان بە ڕێگای ئاشتیخوازانە و دواجار بە پۆلیاریشیشەوە هەیە، ئەگەرچی بەرهەم و دەرامەتی میللی بەپێی ئامار و ئەزموونەکان بە تەنها ناتوانێ ببێتە فاکتەر بۆ هێنانەدی پۆلیارشی، بەڵام یەکێکە لە فاکتەرە پێویستەکانی.

لەو وڵاتانەی هێشتا لە ساتی تێپەڕیندان لە قۆناغی نەرێتییەوە بۆ قۆناغی مۆدێرن، ئەوا پۆلیارشییەکان بناغەیان تیایدا دانەکوتاوە یاخود هێشتا بەشێوازی نیمچە پۆلیارشییەک کار دەکەن.

بەمانایەکی دیکە، لەم جۆرە وڵاتانەدا دەسەڵاتەکانی یاسادانان و پارتە سیاسییەکان هێشتا بەشێوازێکی تەواو کامڵ ئۆرگانیزە نەکراون.

بەمشێوەیە (ڕۆبەرت داڵ)یش جەخت لەسەر مۆدیلی حکومڕانی دەستەبژێرەکانی (پارەتۆ) دەکاتەوە، لەمڕووەوە سەرجەم حکومەتەکان بە حکومەتی دەستەبژێر دادەنێ، تەنها ئاماژە بە یەک جیاوازیی لەنێوان حکومەتی دیموکراسی و دیکتاتۆریی دەکات و پێی وایە حکومەتی دیموکراسی سیستەمێکی واڵا و خـاوەن جوڵەیە و بەئاسانی ئاڵوگۆڕی دەستەبژێرەکانی تیایدا ئەنجام دەدرێت، لەکاتێکدا

حکومەتی دیکتاتۆری سیستەمێکی داخـراوە و بەسەختی و بەگشتی لەکاتی قەیرانەکاندا دەشێ ئەم ئاڵوگۆڕەی تیادا بێتەدی.
بەمانایەکی دیکە لە دیموکراسیزمی ئەمڕۆدا چەندین ئیلیت (دەستەبژێر یاخود گروپێکی گچکە و خاوەن ڕۆڵ) حکومڕانن و لە ململانێدان، هەر ئەم ململانێیەش دەبێتەمایەی گەرەنتی پاراستن و مانەوەی دەسەڵات، لەکاتێکدا لە سیستەمی دیکتاتۆریدا تەنها یەک کەس یاخود یەک گروپی گچکەی زەبربەدەست دەسـەڵاتـدارن و هەوڵی پاراستنی سیستەمەکە دەدەن.
لەم ڕوانگەیەوە ئەو پێی وایە تەنها بە داڕشتنی دەستورێک یاخود یاسایەک ناتوانرێ ڕێگە لە حکومەتی تـاکـڕەوی بگرین، بەڵکو پێویستە هەلومەرجێک لـە کۆمەڵگادا بهێنرێتەدی تا هاوسەنگی هێزە ئیلیتە رکابەرەکان بپارێزرێت بۆ ئەوەی پۆلیاریشی سەقامگیر ببێت.
بەهەرحاڵ بەپێی ئەو دەرئەنجامەی رۆبەرت داڵ پێی گەیشتووە، ناواخنی راستەقینەی دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ، بریتییە لە حکومەتی پۆلیارشی و پاشان حکومڕانی گروپێک. پۆلیاریشی سیستەمێکی حکومڕانییە کە تیایدا ململانێی ئازادانە لەنێوان دەستەبژێرەکان و کەمینە خـاوەن ڕۆڵەکاندا بەردەوامە. بەمانایەکی تر، لەم سیستەمەدا چەند ئیلیتێک جێگەی ئیلیتێکی تر دەگرنەوە.
لە دیدی ڕۆبـەرت داڵـەوە، مرۆڤەکان هەرچەندە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتین بەڵام مەرج نییە سیاسی بن (واتا بەپێچەوانەی دیدگای ئەرستۆوە). یاخود دەشێ بڵێین سروشت هەر لە بنچینەوە غەریزەی سیاسیبوونی بە مرۆڤەکان نەسپاردووە و زۆرینەیان ناسیاسین، واتا مرۆڤ ئەگەرچی لە کۆمەڵگادا دەژی بەڵام ناچار نین حەز بە کاری سیاسی و سیاسیبوون بکەن. چەمکی (مەرج نییە) بەو مانایەیە رۆبەرت داڵ بە پێچەوانەی ئەرستۆوە بیردەکاتەوە کە مرۆڤ بە بوونەوەرێکی سیاسی دەزانێ، ئەگەرچی مرۆڤ بەجۆرێک لە جۆرەکان تێکەڵاوی مەسەلە سیاسی و ئابورییەکان دەبـن و تەنها پلەی بەهێزی و لاوازییەکەیان شیاوی قسە لەسەر کردنە، چونکە لە سیستەمی پۆلیارشییەکاندا بەشداریی سیاسی و کات تەرخانکردنێکی زۆر بۆ ئەو بوارە، بەرژەوەندییەکی کەمتری بۆ مرۆڤ تێدایە بە بەراورد بە بەشداریی لە کاری ئابورییانە و تەنانەت خۆتەرخانکردن بۆ خزمەتی ئەندامانی خێزانیش.
لێرەدا ئاشکرایە پرۆسەی بەشداری سیاسی لەو وڵاتانەی لە قۆناغی گەشەی سیاسی و ئابوریدان، توندترە لەو کۆمەڵگایانەی پێشکەوتنێکی زیاتریان لەوڕووەوە هێناوەتەدی.
بێگومان نابێ ئـەوەش فـەرامـۆش بکەین، ئەو سەرچاوە ئابورییانەی ڕۆڵێکی هەستیار و گرنگیان لە گەشەپێدانی ئابوریدا هەیە، دەبنە گۆڕەپانێکیش بۆ ئەم جۆرە گەشە سیاسیانە.
بەمشێوەبە رۆبەرت داڵ دەگاتە ئەو دەرەنجامەی سیستەمی (پۆلیارشی) نوێنەری بەرژەوەندییە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا دەکـات، لەسەربنەمای دەنگی جەماوەر دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە و حکومەت بـەڕێـوەدەبـەن و تائەندازەیەکیش دەنگدەرەکانی خۆیان ڕەزامەند دەکەن.



ج- سارتۆری

(جیڤانی سارتـۆری) هـەروەک (رۆبـەرت داڵ) جەخت لەسەر جۆرە مۆدیلێکی تیۆری دیموکراسی دەستەبژێرەکانی شۆمپیتەر دەکاتەوە. ئەو هەوڵ دەدات لە کاملکردنی ئەم تیۆرەدا، پێکهاتە و کارکردنی مۆدیلەکە بە شێوازێکی واڵاتر و ڕۆشنتر بخاتەڕوو، لـەم ڕووەوە نـاوبـراو دیموکراسی بە سیستەمێک دەناسێنێ کە گروپێ سەرکردەی سیاسی دەستەبژێر لەنێو گروپە رکابەرەکانی تردا بەدەنگی جەماوەر دەگاتە دەسەڵات و بە نوێنەرایەتی ئەوانیش بڕیار دەدات.
ناوبراو پێی وایـە دیموکراسییە هاوچەرخەکان مۆدیلێکی پۆلیارشین، واتـا پۆلیارشییەکی هەڵبژێردراون.
لە ڕوانگەی ئـەوەوە، دیموکراسی تەنها لەساتی هەڵبژاردن یاخود لـەو ساتانەدا دەردەکـەوێت کە گروپێکی دەسەڵاتداری حکومڕان سەرلەنوێ پێویستیان بە دەنگی جەماوەر ببێتەوە، ئیدی دەستەی حکومڕان بەناوی میللەتەکەیانەوە بڕیار دەدەن و حکومڕانی دەکەن.
بەمشێوەیە لە دیدی سارتۆرییەوە، ئیدی دیموکراسی بەو چەشنەی نێو خەیاڵی خەڵک نییە کە وەک حکومەتێکی گشتی و جەماوەریی پڕوپاگەندەی بۆ دەکـرێـت، یاخود بـەو شێوەیە نییە کە لە دەوڵەتشارەکانی یۆنانی کۆندا هەبووە.
خاڵێکی دیکەی سەرنجڕاکێش لەلایەن سارتۆرییەوە خراوەتەڕوو و پێشتریش ئەفلاتوون جەختی لەسەر کردۆتەوە، گیروگرفتێکی ناواخنی دیموکراسییە، ئـەویش پشتبەستنی زیـاد لـە ئـەنـدازەیـە بە (چەندایەتی) و لەبەرچاونەگرتنی (چۆنایەتی) یە لـە ڕووە تیۆرییەکەیەوە، چونکە خـاوەن بەرژەوەندهاوبەشە دارایی و مەعنەوییەکان دواجار پێویستە جەماوەر بەهەموو چەشنێ ڕەزامەند و ڕێنما بکەن، واتا ئەو جەماوەرەی پێویستە دەنگی خۆیان بخەنە نێو سندوقەکانەوە.
بەهەرحاڵ لە دیموکراسیدا، ئامارەکان یەکەم و دواقسە دەکـەن و پێوەری سەرەکین، لەڕێگەی ئامرازی پێشکەوتووانە و وردەکارانەی پڕوپاگەندەوە جەماوەر بەئاراستەدا دەبرێت و دەخرێنە نێو ڕێڕەوی بەرژەوەندی ڕێبەرە زیرەکەکانەوە.
لە ڕوانـگـەی سارتۆرییەوە، جیـاوازی لە نێوان سیستەمی پۆلیارشی و پۆلیارشی هەڵبژێردراودا ئەمەیە کە لە سیستەمی پۆلیارشی هەڵبژێردراودا، جەماوەر لەڕێگەی نوێنەرانەکانیانەوە لە پارلەمان (وەک دەسـەڵاتـی یـاسـادانـان) بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ چاودێریی و کۆنترۆڵی دەسەڵاتی (جێبەجێکردن) دەکەن، لەکاتێکدا لە سیستەمی پۆلیارشی ناهەڵبژێردراودا ئەم کۆنترۆڵ و چاودێرییە بوونی نییە یاخود هێندە کاریگەر نییە.
لە دیموکراسییە نوێیەکاندا، دەسەڵات لەنێو گروپە جۆراوجۆرە دەستەبژێرەکاندا بەشێوەیەک دابەش دەکرێت کە هاوسەنگی دەسەڵات و کۆنترۆڵکردنی ڕادەگرێت، بەمانایەکی تر لە دیموکراسیدا (ڕۆڵ) و (هاندان) جێگەی فشار و زۆرەملێ دەگرێتەوە کە بنەمایەکی ڕێبەرایەتی سیاسی دیموکراسیانەیە.

سەرچاوە: دکتر ملک یحیی صلاحی، اندیشەهای سیاسی غرب در قرن بیستم. چاپ اول، ١٣٨١، ص (٦١-٦٩)

# رۆشنبیران لە مەنفا

نووسینی: فرانس نۆیمان

لە فارسییەوە: رێبین هەردی

"ئەگەر نیشتیمان منی نەوێت، منیش ئەوم ناوێت. جیهان فراوانە". ئەمە قسەی هۆگو گروتیوسە کە یەکێکە لە یاساناسە ناودارەکان و پسپۆری یاسای "سروشتی" و یاسای نێودەوڵەتیە کە پاش ئازادبونی لە مەترسی زیندانی مۆریس دۆ رانژ لە ١٦٢١[1]دا وای گوتوە. گروتیس بە ناچار دە ساڵ لە پاریس ژیا. لەوێش دور لە وڵات بەناوبانگترین کتێبی خۆی De jure belli (یاسای جەنگ و ئاشتی) نوسی.

بەڵام نابێت ئەم هەستەی گروتیس و چارەنوسەکەی وامان لێبکات وا بزانین کە هەست یان چارەنوسی کەسێک کە ئەمرۆش نیشتیمان جیئەهێڵێت، هەمان شتە. دوو گۆڕانی بنەڕەتی رویداوە: یەکێکیان لە ئەرکی رۆشنبیردا، ئەوی تر لە فەزای کۆمەڵایەتی رۆشنبیردا.

رۆشنبیر ویژدانی رەخنەگری کۆمەڵگایە لە هەر قۆناغێکی مێژوویدا، یان لانیکەم ئەبێت وا بێت. ئەرکی رۆشنبیر هەڵویستی رەخنەگرانەیە بەرامبەر بە کۆمەڵگا

---

١[1] Maurice of Orange (ناسراو بە مۆریس ناساو) (١٦٢٥-١٥٦٧) میری هۆڵەندا.

**رۆشنبیر پاش سەقامگیربونی مەسیحیەت لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دۆخێکی ناسکی پەیدا کرد، چونکە کەوتبوە نێوان دین و دەوڵەتەوە و باشترین سودی لە ململانێی هەمیشەیی ئەم دوانە وەرئەگرت و تا ئەوکاتەی کە کارەکەی لە لایەکەوە نەدەگەیاند بە هەڵگەڕانەوە و لە لایەکی تریشەوە بە نەیاری سیاسی**



فرانس نۆیمان

و پیشاندانی ئەوەی کۆمەڵگا تاچەند ئازادی بەدیهێناوە یان نا. جارێ لێردا دەرفەتی ئەوەم نیە بیسەلمێنم بۆچی ئەبێت وا بێت. ئەمە پێویستیەکە پەیوەندی بە وێنایەکەوە هەیە کە تەوەرەی زانستی کۆمەڵگا و سیاسەتە- واتە وێنای ئازادی-. بەڵام لەبەرئەوەی هیچ کۆمەڵگایەک- چ لە رابردو و چ لەمڕۆدا- هەرگیز نەیتوانیوە بەتەواوی ئازادی مرۆڤ دەستەبەر بکات، ئەوا ئەرکی رۆشنبیر بۆ رەخنەگرتن وهەڵسەنگاندن هەر لە جێی خۆیەتی. رۆشنبیر ویژدانی کۆمەڵگایە و لێرەوە بە دەربڕینێکی تایبەت هەمیشە دەرکراوە، چونکە ویژدان بەتایبەتی لە سیاسەتدا هەرگیز سەرچاوەی ئاسودەیی نیە. دیارترین دەرکەوتەی ئەرکی رەخنەگرانەی رۆشنبیر سوقراتە کە فەیلەسوفی بە "بێگانەیەکی ئەبەدی لەناوماندا" و کارەکەشی بە گومانکردن و پرسیار لەبارەی خەسڵەتی فەلسەفەی هەر شکڵێکی حکومەت و هەر کۆمەڵگایەک پێناس ئەکات٢ و ئەڵێت:

"هۆکەی ئەوەیە کە من هەمیشە یەکێک لەو کەسانە بوم و هەم، کە بێگومان ئەبێت ئاراستەی عەقڵ بکەمە رێنمای خۆم، بەدەر لەوەی ئەم ئاراستە عەقڵیە چی بێت کە پاش تێڕامان و بیرکردنەوە باشتر لە لایەنەکانی تر بۆ من دەرئەکەوێت، لەوڕوەشەوە کە چارەنوسی من ئەمە بووە، ناتوانم نکوڵی لە قسەکانی خۆم بکەم"٣.
لێرەدا هەرئەوەندە بە گشتی سەبارەت بە ئەرکی رۆشنبیر بەسە، چونکە مەبەست تەنها ئەوەیە کە بەمشێوەیە رێگە بۆ شیکردنەوەی چارەنوسە جیاوازەکانی رۆشنبیران لە سیستەمە سیاسیە جیاوازەکاندا هەموار بکرێت. ئاشکرایە ئەرکی رۆشنبیر لە دەوڵەتشارەکانی یۆناندا، هەم زەحمەتتر و هەم ترسناکترە لەهەر جێگەیەکی تر. لە یۆنان سیاسەت لەگەڵ کلتوردا یەک شتە، یان لانیکەم بە یەک شت پێناس ئەکرێت. شارستانیەتی

---

Plato, Republic, trans, F.M. Conford, Book VI,ch.٢٢. -٢
٣) Plato, Crilo, Trans, B. Jowett.

جیهانی ناسراو لە پنتێکدا چەقی گرتووە (کە یۆنانە) و باقی جیهان راستەوخۆ بەربەریە، یان پێدەچێت کە وابێت. لەبەرئەوەی سیاسەت لەگەڵ کلتوردا یەک شتە، ئەوا دورخستنەوە یەکسانە بە مەرگ. بەڵام لە قۆناغی ئیمپراتۆریدا، دۆخەکە گۆڕانی بەسەردا دێت. رۆشنبیر ئازادیەکی زیاتر پەیدا ئەکات، چونکە ئەبینین کە ئەگەر لەناو سیاسەتیشدا نەبێت، دیسان تەحەمولی بونی ئەکرێت. سیاسەت چیدی لەگەڵ کلتوردا یەک شت نیە، ئامانجی فەلسەفی ئەپیکۆرس رێک ئەمەیە کە رەوایەتی بە کاری رۆشنبیرێک بدات کە خۆی لە سیاسەت بەدور ئەگرێت و ئەڵێت چیدی چاوەڕوانی دادپەروەری لە دەوڵەت ناکەم و تەنها چاوەڕوانی سەقامگیری رێکخستن و ئاسایشە. بەڵام رەواقیەکان هەروا خوازیاری ئەخلاقن لە سیاسەتدا و ئەم چاوەڕوانیەشیان ئەبێتە هۆی گەلێک ناکۆکی. دورخستنەوە لەم دۆخەدا ئەگەرچی زیانە ئەخلاقیەکانی رابردوی نیە، هێشتا هەر بەهەمان ئەندازە لەڕوی فکریەوە کارەساتبارە. ناڵە و ماتەمینی ئوڤیدیوس٤ کە ئەگوستتۆس (ی ئیمپراتۆری رۆم) دوری خستەوە بۆ کەناری دەریای رەش، باشترین شایەتی تاڵی شاعیرێکە کە بەشیکی جیانەکراوەیە لە شارستانێتی رۆمی و زۆر رەنجی لەپێناوی پێشکەوتنیدا بینیووە.

دۆخی سێهەم دۆخی کلتورێکی گشتیە کە ناوەڕۆکەکەی مەسیحی و زمانەکەی لاتینیە. لەم دۆخەدا دورخستنەوە یان جێهێشتنی نیشتیمان هیچ مانایەکی نیە و لە دەربار و زانکۆکاندا پێشبرکێ بۆ راکێشانی زانایانی دورخـراوە ئەکەن، جیاوازی نەتەوەیی بێ مانایە، و بە هۆی خۆێنساردی و بێباکیی مەزهەبی بەربڵاوەوە کە دەرئەنجامی دەوری باڵادەستی و بێ رکەباری کەنیسەیە لە بواری کلتوردا، روبەری چالاکیە داهێنەرەکان لە هیچ شوێنێکدا بۆ رۆشنبیری مەنفا تەسک نابێت. کار ئەگاتە جێگەیەک کە ئیتر لە دوای ئەمەوە زانای رێبوار– بەدەر لەوەی بە خواستی خۆی رێبوار بێت یان بەناچاری– شتێکی زۆر ئاساییە.

بەڵام چەند ئاوارتنێکیش هەیە. دوو دۆخ کە حوکمە گشتیەکانی سەرەوە لەبارەیانەوە راست نیە، یەکێکیان دۆخی زانای سیاسیە و ئەوی تریان هەڵگەڕاوەکانە. لێرەدا نامەویت باسی هەڵگەڕاوەکان بکەم. بەڵام دوو نمونە بۆ گروپی یەکەم ئەهێنمەوە: دانتێ٥ و مارسیلۆس پادۆئایی. دانتێ کە بە ناچاری پاریسی بەجێهێشت، لە دەربڕینی هەستەکانیدا ئەڵێت: "چەند تامی نان لە مەنفادا تاڵە، و چەند چونە سەرەوە و هاتنە خوارەوە لە پلیکانەی بێگانەکان سەختە". دانتێ نەک هەر شاعیر و زانا، بەڵکو سیاسەتمەداریش بوو. مەنفا homo politicus (یان مرۆڤی سیاسی) لەناویدا کوشت، بەڵام شاعیر و زانای ناو ناخی بە لوتکە گەیاند. وێنا (تەسەورە) سیاسیەکانی لە غوربەتی نیشتیماندا لە بنەوە گۆڕانی بەسەردا هات. سەفەرکردن بۆ ڤیرنا و بۆلۆنیا و پاریس و ئۆکسفۆرد و لەندەن و کۆلن و شارەکانی تر، لە تەسکبینی دیدی سنورداری لۆکاڵیانە رزگاریان کرد و بە بیرکردنەوەیەکیان لە سیاسەتدا گەیاند کە ئەگەرچی لەسەدەی چواردەدا سەرنجی بۆ خۆی رانەکێشا، بەڵام دواتر بوو بە رەقیبی کورتبینی لۆکاڵی و ناسیۆنالیزم.

زانا سیاسیەکەی تر مارسیلۆس پادۆئایی بوو کە پاش دورخستنەوە لە پاریس، چووە خزمەت دەزگایەکی

---

٤- Ovidius (بە ئینگلیزی Ovid) (٤٣ پ،م تا ١٧ دوای لەدایکبون) شاعیری رۆمانی کە بە هۆی نادیارەوە بە فەرمانی ئاگۆستۆس دورخرایەوە بۆ شارێک لە پاڵ دەریای رەشدا و بە ناچار تا مردن لەوێ مایەوە).

٥- ئەلیگری دانتێ (١٢٦٥-١٣٢١) شاعیری ئیتاڵی کە لەساڵی ١٣٠٢ لە لایەن دادگای فلۆرانسەوە حوکمی دورختستنەوەی درا. (و.ک)

هۆگو گروتیوسە



سیاسی تـرەوە ، واتـە دەزگـای "لۆدڤیك باڤـاریـای" و بـە یارمەتی ئـەو هەوڵیدا نەخشەیەکی پان و بەرین جێبەجێ بکات کە بە مەبەستی دروستکردنی دەوڵەتێکی نادینی، بنەما تیوریەکانی لە کتێبەکەی خۆیدا Defensor pacis (بەرگریکاری ئاشتی) دارشتبوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەرنجدان لەو خاڵە – بەتایبەتی بۆ تێگەیشتن لە ناسیۆنالیزم– گرنگە کە قۆناغی گەشەکردنی مەسیحیەت، سەرلەنوێ دۆخی سەرەتایی تازەکردەوە کە تیایدا کلتور و سیاسەت بە تەواوی یەک شت بوو. وردبونەوە لە یەکێک لەو گۆڕانکاریانەی لە زماندا رویـدا، ئاسانتر مەبەستەکەم رون ئەکاتەوە.

رۆمیەکانیش لە رابردودا وەک یۆنانیەکان، رۆشنبیران یان هونەرماندانی ناڕازیان بە دورخستنەوە حوکم ئەدا. ئەم سزایەیان ناو نابوو extermination کە لە رووی زمانیەوە بە مانای دەرکـردن بوو بۆ ئەو دیو سنور. بەڵام لە دەوروبەری سەدەی سێهەمی زاینیدا وشەی ناوبراو ماناکەی گۆڕاو و مانای هەنوکەی وەرگرت: واتە بە مانای لەناوچون و لەناوبردنی جەستەیی (یان کوشتن)٦. هۆی ئەم گۆڕانی مانایە و گەشەکردنی مەسیحیەت و پڕبونی سیاسەت بوو بە دین. تێگەیشتن لەم گۆڕانە لەدیدی کۆمەڵناسیەوە زۆر ئاسانە: سیستەمێکی بەهای تازە بەسەر کۆمەڵگادا سەپا، ئەو سیستەمە لە سەرتاسەری کۆمەڵگادا بڵاوبۆوە و ناڕازیبونی گۆڕی بۆ هەڵگەڕانەوە. لەوە بەدواوە نەدەکرا لەگەڵ دوژمندا نەرمی بنوێنرێت، چونکە ئەو نەک هەر باوەڕی پیس ئەکرد، بەڵکو رەنگە ببوایە بە ناوەندی نەیارێتی. لەهەرجێیەک لەبری رازیبونی عەقڵانیانە باوەڕی دینی یان نیوە دینی تازە ببێتە رەگەزی یەکێتی بەخشی کۆمەڵگا، دۆخی هاوشیوەی ئەوەی دیمان دێتە پێشێ. وێنەی تازەی ئەم مەسەلەیە دوا فەسڵی کتێبی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" رۆسۆیە لەژێر ناونیشانی "دینی مەدەنی"دا، کە تیایدا جەخت لەسەر دروستبونی دینێکی مەدەنی تازە بۆ وروژاندنی رۆحی راستەقینەی

---

٦- G.G Coulton (١٩٢٤), «The death penalty for heresy from ١٨٤ to ١٩٢١ A.D, «Mediaeval Studies, No, XVIII, pp ١-١٨.

دانتی



پەیوەستبونی کۆمەڵایەتی ئەکات و ئەڵێت کەسانێک کە بنەما ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا بخەنە ژێر پێیانەوە، ئەبێت لە کۆمەڵگا دەرکرێن و کەسانێکیش کە وای پیشان بدەن کار بەو بنەمایانە ئەکەن و بەڵام لە کرداردا ئەو بنەمایانە پیشێل ئەکەن، ئەبێ لە سیدارە بدرێن. ئەو کەسەی مەبەستەکانی دوا فەسڵی کتێبەکەی رۆسۆی جێبەجێ کرد، رۆبسپێر بوو لە قۆناغی حکومەتی ترسدا. جارێکی تر باسی ئەم دۆخە ئەکەم. بەڵێ، رۆشنبیر پاش سەقامگیربونی مەسیحیەت لەسەدەکانی ناوەڕاستدا دۆخێکی ناسکی پەیدا کرد، چونکە کەوتبوە نێوان دین و دەوڵەتەوە و باشترین سودی لە ململانێی هەمیشەیی ئەم دوانە وەرئەگرت و تا ئەوکاتەی کە کارەکەی لە لایەکەوە نەدەگەیاند بە هەڵگەڕانەوە و لە لایەکی تریشەوە بە نەیاری سیاسی، ئازاد بوو دریژە بە کارەکانی خۆی بدات و، لەبەرئەوەی ئەندامی یەکێک لەو گروپانە بوو کە خاوەن مافی تایبەتی و سەربەخۆ بوون لە کۆمەڵگادا، ئەیتوانی جێگەی نیشتەجیبونی خۆی بگۆڕێت و پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی بۆ کۆی ئەوێت، ببات.

لەگەڵ دروستبونی دەوڵەتی نەتەوەییدا، دۆخێکی تازە دروست ئەبێت. ئەبێ دوو قۆناغ لەم ئاستەدا لەیەک جیابکرێتەوە: دامەزراندنی دەزگای دەوڵەتی و دەرکەوتنی خودهۆشیاری نەتەوەیی. ئەوەی ئەم دوو قۆناغە بەیەکەوە ئەبەستێتەوە، وێنای فەرمانڕەوایەتیە کە لەهەمانکاتدا ئاڵۆزیەکی سەرەکی لە پەیوەندی نیوان سیاسەت و کلتور و لە ئەنجامدا لە نێوان رۆشنبیر و دەوڵەتدا دروست ئەکات. فەرمانڕەوایەتی دەوڵەت پێویستی بە جیابونەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگا و سیاسەت لە کلتورە. دەوڵەت دەزگایەکە کە بە جیا لە کۆمەڵگا دەرکەوتووە و دروستبووە، لەبەرئەوە یەکیک لە پێویستیەکانی دەوڵەت نەرمی نواندنە بەرامبەر هەر بڕوایەک کە بەپێی یاسا قەدەغە نەبێت و بە دەربڕینێکی تر زیان بە کارەکانی ئەم "لڤیسانە"[٧] نەگەیەنێت. بەڵام لڤیسان سنورێک بۆ دەسەڵاتی خۆی نازانێت. من لە جێگەیەکی تردا کێشەی زانستی تازەی سیاسەتم بەمشێوەیە دەربری:

کێشەی فەلسەفەی سیاسی - و کێشەی بە روکەش چارەسەر نەکراوی - ئاشتکردنەوەی ئازادیە لەگەڵ

---

٧- Leviathan لە وشەی عیبری (لڤیسان). دیوێکی دەریای ئەفسانەیی کە لە تەورات و نوسینی مەسیحیەکاندا ناوی هاتووە . یەکەم کەس کە ئەم وشەیەی خستە ناو فەلسەفەی سیاسیەوە تۆماس هۆبز بوو کە کتێبێکی بەناوبانگی بەم ناوەوە نوسی و دەوڵەتی بە هاوشێوەی لڤیسان دانا، واتە بونەوەرێک کە دەسەڵاتی لە تاکەکان باڵاترە و ئەبێت هەموو هاوڵاتیان پەیڕەوی لە ئیرادەی ئەو بکەن.

ناچارکردندا. هاوکات لەگەڵ دروستبونی ئابوری پارەدا، دەوڵەت لە سەردەمی تازەدا لە بەرگی ئەو دەزگایانەدا دەرئەکەوێت کە بانگەشەی ئەوە ئەکات کە بۆ ئەوەی بازرگانی لەسەر بنەمایەکی دڵنیا بگەشێتەوە و هاوڵاتیان لە بەرهەمی کار و هەوڵەکانیان بخۆن، ئەوا ئەبێت دەسەڵاتی ناچارکردن بە تۆپزی لەدەستی ئەودا بێت. هاوڵاتی بە دروستکردنی ئەم دەزگایە و دانانان بە دەسەڵاتی فەرمارەوایکردنیدا، لەهەمانکاتدا ئامێرێکیان دروستکردووە کە ئەیتوانی لە ئەنجامی شیرینی هەوڵەکانی و لە پشتیوانی پێویست مەحرومی بکات و زۆرجاریش ئەیکرد. لێرەوە لەهەمانکاتدا کە هەوڵیئەدا پاساو بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بهێنێتەوە، بە نیازبوو پاساو بۆ سنورداربونی دەسەلاتی دەوڵەت بۆ ناچارکردنیش بهێنێتەوە. مێژووی بیرکردنەوەی سیاسی تازە، مێژووی هەوڵدانە بە مەبەستی پاساوهێنانەوە بۆ ماف و زۆرکردن، یان یاسا و دەسەڵات. هیچ تیورەیەک لە زانستی سیاسەتدا نیە کە ئەم دوو کارە بە یەکەوە نەکات. تەنانەت توندڕەوترین تیورەکانی لایەنگری دەوڵەتی رەها (وەک تیورەکانی هۆبز و سپینۆزا) کە سەرەتا بە روکەش مافە فەردیەکان لە دەرگا ئەکەنە دەرەوە، دیسان ئەو مافانە لە پەنجەرەوە ئەکەنە ژورەوە: هۆبز لەو رێگەیەوە کە فەرمانڕەوا ئەکات بە نوێنەر یان کارگوزاری بازرگانی کۆمەڵگا و ئەگەر لەکارەکەیدا سەرکەوتوو بوو، هەموو دەسەڵات و هەڵبژاردنەکانی پێ بسپێرێت و ئەگەر لە سەقامگیری رێکخستنی ئاسایشدا شکستی خوارد، هەموو دەسەڵاتەکانی لێ بسەنێتەوە، سپینۆزاش بەوجۆرەی کە بەو پێوەرەی دروستی کردووە و مافی یەکسانکردووە، بە زۆرکردن، رێگە بە هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی خاوەن دەسەڵاتی پێویست ئەدات کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی خۆی بە ماف بگۆرێت و alterius iuris (واتە نەبونی ئەهلیەت بۆ خاوەندارێتی ماف) بگۆرێت بۆ sui iuris (واتە بونی ئەهلیەت بۆ خاوەندارێتی ماف). تەنانەت لۆک کە لایەنگری ماف و یاسایە، خۆی بە ناچار ئەزانێت کە "دەسەڵاتێکی تایبەت بۆ شا دابنێت و رێگەی پێبدات هەرکاتێک ماف و یاسای بونی دەوڵەت کەوتە مەترسیەوە - و هەندیکجار بە پێچەوانەی یاساوە - دەستبەکار بێت"٨.

ئەم ئاڵۆزیە بنەرەتیە لە زانستی تازەی سیاسیدا، لە پیگەی ئاڵۆزی رۆشنبیردا دەرئەکەوێت.

لە قۆناغی یەکەمدا و بەر لە گەشەکردنی ناسیۆنالیزم، رۆشنبیر روبەڕوی هیچ کێشەیەکی گەورە نەبۆتەوە، بەتایبەتی ئەگەر کەسێک لە کاروباری سوپایی یان بەرێوبەرایەتی یان دادوەری یان داراییدا لێزانیەکی هەبێت، کە پسپۆربون لەو بوارانەدا زۆر لە لایەن دەزگای دیوانی پاشاکانەوە پێویستە. لە رووی خوێندنەوەی ئەو چۆنایەتیەی بەمشیوەیە لە دۆخی رۆشنبیردا دروست بووە و لە سنوری نەتەوەکان تێئەپەڕێت و ئەگەری ئەوە ئەرەخسینێت کە پەیرەوی هەر فەرمانڕەوایەک بکات کە ئەیەوێت و لە کوێ ویستی نیشتەجی بێت و، ئەگەر فلان سەرچاوەی دەسەڵات دوریخستەوە، ئەوی تر بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی لێبکات، قۆناغی سەرەتایی (واتە سەدەی پانزە و شانزە) و قۆناغی دوای ئەو، واتە سەردەمی دەسەڵاتە رەها رۆشنگەرەکان، لەم قۆناگەدا باشترین نمونەیە.

ناسیۆنالیزم ژێرخانی رەوایەتیدانە بە فەرمانڕەوایی دەوڵەت و، لە هەمانکاتدا بەڕاستی خوڵقێنەری کێشەی ئەمرۆی ئێمەیە. هیچ قۆناغێک هێندەی ئەم سەردەمەی باسی ئەکەین، لە دیدی ئیمەوە ئەوەندە گرنگ

---

٨- بگەڕێنەوە بۆ فەسڵی «مۆنتیسیکۆ» هەر لەم کتێبەدا.

و بابەتی نیە. چونکە نەتەوە مافی ئەوە بەخۆی ئەدات، شتی وا لە هاوڵاتی داوا بکات کە لەگەڵ بونی ئەو تیۆرانەدا کە بۆ سنوردارکردنی داڕێژراون، سنور و ئەندازەیەک ناناسێت. تەنها سنورێک وەک لۆسەر دیاریکرد، ویژدانی مرۆڤە.

لەم قۆناغەدا بوو کە گروتیوس ئەژیا و کیشەی ئەمرۆی ئێمە سەریهەڵدا. تاوتوێکردنی ئەوەی چۆن خواستەکانی نەتەوە لەهاوڵاتی زیاتر بوو، خۆی بابەتێکی سەرنجراکێشە. شانۆکە فەرەنسای سەدەی حەڤدەیە کاتێک کە دەوڵەتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە لە ململانێی کاسۆلیکەکان و هۆگنۆکانەوە٩ دروست ئەبێت. لە جەنگە مەزهەبیەکانی سەدەی شانزەدا کە بووە هۆی هاتنە سەر حوکمی هانری چوارهەم، ئەوە سەلما کە خزمایەتی دینی، باڵاترە لە شوناسی نەتەوەیی. بەڵام لە قۆناغی ریشلۆی سەرەک وەزیراندا، بارودۆخەکە گۆڕا. هێواش هێواش بێ ئەوەی هەست پیکراو بێت، وەفاداری هاوڵاتی بۆ دەوڵەتی تاک نەتەوەیی بەسەر هەر پەیوەندیەکی تردا سەرکەوت. باشترین نمونەی ئەم مەسەلەیە لە کاتی ئابلۆقەدانی بەناوبانگی شاری لارۆشلدا دەرکەوت. هاوڵاتیانی لارۆشل کالڤینست بوون و لەهەمانکاتدا کە پەیمانیان لەگەڵ چالرزی یەکەم پاشای ئینگلتەرادا ئەبەست و بێگومان خیانەتیان لە نیشتیمانەکەیان ئەکرد، رایانگەیاند کە هیچ شتێک لەو پەیمانەدا نابێت بە خیانەت بزانرێت. کەوابوو وەک ئەبینین کە لەناو گەرمەی جەنگی مەزهەبیدا – و بە پێچەوانەی هەشت جەنگی مەزهەبی سەدەی شانزەوە – ئەمجارە وا هەست ئەکرێت کە وەفاداری بۆ نەتەوە بەهیچ شێوەیەک کەمتر نیە لە وەفاداری بۆ مەزهەب.

لە مێژووی سەردەمی تازەدا ناکۆکی نێوان فەرمانڕەوایەتی و ویژدانی فەردی لە کۆمەڵگادا، بۆتە هۆی دەرکەوتنی دیاردەیەکی تازە کە دواجار ناویان ناوە "رزگاری دەرونـی"(inner emancipation). بۆ رونکردنەوەی بابەتەکە چوار نمونە ئەهێنینەوە: سپینۆزا و ئابێ ملیە و کانت و تیئۆدۆرۆ مومزن. ئەم چوار کەسە لەوەدا هاوبەش بوون کە ئەو سیستەمە سیاسیەیان رەد ئەکردەوە کە لەناویدا ئەژیان، بەڵام ئارەزوو یان توانای ئەوەیان نەبوو هێرشی بکەنە سەر. سپینۆز خۆی لە هەموو جۆرە پەیوەستبونێک بە سیستەمی سیاسیەوە دزیەوە، بۆ ئەوەی بەشێوەیەک کە شایستەی کەسێکی حەکیمە بژی. "ئابێ ملیە" لەسەدەی هەژدەدا لە سەرتاسەری تەمەنیدا کاسۆلیک بوو، بەڵام ئەو وەسیەتنامەیەی کە لە سێ بەرگدا لە خۆی بەجێی هێشت، ئاشکرای کرد کە کۆمۆنیستێکی مولحید بووە، ژیانی کانت بە روکەش ژیانی مامۆستایەکی زانکۆی پرۆسی بوو، و شانازی بەوەوە ئەکرد کە هەرگیز لە وانەکانی غائیب نەبووە، و هیچکات رێکخستن و شێوازی ئاسایی ژیانی رۆژانەی تێک نەداوە. بەڵام لە نامەکانیدا ئاشکرای کرد کە بیری شۆڕشگێڕانە بە خەیاڵیدا هاتووە کە هەرگیز جورئەتی چاپ و بڵاوکردنەوەیانی نەبووە، هەرچەند ئەوەشی وتووە کە هیچکات شتێکی دوور لە راستی بڵاونەکردۆتەوە. وەسیەتمانەی تیئۆدۆرۆ مومزن کە تەنها چەند ساڵ لەمەوپێش بڵاوکراوەتەوە١٠، بەراستی وەک کەسێکی لیبڕاڵ پیشانی ئەدات کە ناکۆک بووە لەگەڵ رژێمی سیاسی هەبودا، لە کانگای دڵەوە بێزار بووە لێی، ئارەزوی چالاکی سیاسی، هێندەی تامەزرۆی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی بووە. بەمشیوەیە رەهەندی هاوبەشی ئەو چوارکەسەی هێنامانەوە ئەوەیە کە هەموویان بەرهەمی مەزنیان لە خۆیان

٩- Huguenots ناوێک کە لە سەدەی شانزەهەمەوە بە پرۆتستانتەکانی فەرەنسا ئەگوترا.

١٠- وەرگێڕانی ئینگلیزی Theodor Mommsen, past and present, vol. I, No. I, ١٩٥٢, p. ٧١ .



ئۆڤیدیۆس

بەجێهێشت و دوانیان واتە سپینۆزا و کانت، بوون بە سەرچاوەی خزمەتی شۆڕشگێڕانە بۆ زانینی مرۆڤایەتی.
لە قۆناغی لیبرالیسمدا (کە لەچاوی ئێمەدا لەچاو رابردودا، وەک سەردەمی ئاڵتونی رۆشنبیری دەرئەکەوێت) رۆشنبیر بەرهەمهێنەرێکی ئازادە. زانکۆی ئازاد و رۆژنامەی سەربەخۆ و سیستەمی حیزبە سیاسیە رەقیبەکان، هەموویان جۆریک فەزا دروستئەکەن کە لەگەڵ ئارەزوی ئەو رۆشنبیرانەدا ئەگونجیت کە لەرێگەی فرۆشتنی بەرهەمەکانیانەوە لە بازاڕی ئازاددا ئەژین.
لە سەرتاسەری قۆناغێکدا کە لەسەدەی شانزەوە دەست پێئەکات و بە سەدەی نۆزدە کۆتایی دێت، کەسانێک کە سۆزێکیان لەسەردایە و یاخی ئەبن، هێشتا ئەتوانن "بەرەو دەرون نیشتیمان جێبهێڵن" و "بۆ مەنفای دەرون برۆن". تەنانەت گەر وڵاتی خۆشیان بەجیبهێڵن یان دەربکرێن لێی، هێشتا بە ئاسانی ئەتوانن ماڵێکی تازە بدۆزنەوە. لەسەدەکانی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا لە دەربارێکەوە بۆ دەربارێکی تر کۆچ ئەکەن و لەسەدەکانی هەژدە و نۆزدەدا رۆشنبیرانی ئازاد (یان ئاوارە) وەک هرتسن و باکۆنین و بایرۆن١١، بۆ هەرکۆی ویستیان ئەڕۆن.
لەهەمان حاڵەتدا دیاردەیەکی نوی لەناو دەوڵەتە تاک نەتەوەیەکاندا لە ئاسۆدا دەرکەوت کە بریتیە لە باڵادەستی بیرۆکراتی بەسەر کۆمەڵگادا و ئارەزوی گۆڕینی رۆشنبیرە بۆ کارمەندی کۆمەڵگا. رۆشنبیر لەجێبەجیکردنی ئەو ئەرکانەدا کە لە ئەستۆیەتی، روبەڕوی گرفتی روو لە زیاد ئەبێتەوە. ژولیان بندا رۆشنبیران تۆمەتبار ئەکات کە خیانەتیان لە پەیامەکەی خۆیان کردووە یان لەو بنەما ئەخلاقیانەی کە بونیانی مومکین کردووە دابڕاون. هەنوکە چاو لەم تۆمەتە ئەخلاقیە ئەپۆشین و دەست ئەکەین بە شیکردنەوەی کۆمەڵناسیانە و لێرەدا ئەبینین کە راستە رۆشنبیران هەرچی زیاتر ئەبنە کارمەندی کۆمەڵگا. هیچ گومانی تیا نیە کە دامێنی بیرۆکراسی رۆشنبیرانیشی گرتۆتەوە. ئەرکی سوقرات ئاسای رۆشنبیران کەوتۆتە مەترسیەوە و رۆشنبیر بووە بە بەرگریکەر لە "دۆخی هەبوو". هەر ئەم گۆڕانەش لە پایەی رۆشنبیردا و گۆرانی فەزای کۆمەڵایەتی، گواستنەوەی لە کلتوریکی نەتەوەییەوە بۆ کلتورێکی تر ئەستەم کردووە.

---

١١- Lord Byron (١٧٨٨-١٨٢٤) □شاعیری ئینگلیزی کە بەهۆی مەسەلەی شەخسی و کۆمەڵایەتیەوە نێشتیمانی بەجێهێشت و تا کۆتایی تەمەنی هەرگیز نەگەڕایەوە بۆ ئینگلتەرا. (و،ف)

لوتکەی ئەم رەوتە لە دەوڵەتە تۆتالیتاریەکاندا پێئەگات. دەوڵەتی تۆتالیتار تەنها بە کۆنترۆڵکردنی ئامێرە

تەقلیدیەکانی ناچارکردن واز ناهێنێت و ناتوانێت واز بهێنێت، و رێک لێرەداشدا جیاوازە لە حکومەتی رەها. (دەوڵەتی تۆتالیتار) ئەگەر بڕیارە وەک رژێمێکی دیکتاتۆری درێژە بە بونی بدات، ئەبێت سەرتاسەر بیرکردنەوەی مرۆڤەکان کۆنترۆڵ بکات، و لەم رێگەیەوە کلتور بگۆرێت بە پرۆپاگەندە. کەم کەس ئەتوانێت لەبەرامبەر دەزگایەکدا کە بەشیوەیەکی رێکخراو بیرورا بێنرخ و زەلیل ئەکات، تەحەمول بکات. "رزگاربونی دەرونی" لەبارودۆخێکی وادا، یەکسانە بە وازهێنان لە چالاکی فکری. وەڵامی ئەو پرسیارەی کە "داهێنانەکانی کۆچکردووان بۆ دەرون، لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیادا چی بوو؟" لەیەک وشەدا کورت ئەبێتەوە: هیچ. مێزی کۆچکردوان بۆ ناو دەرون هەمووی خاڵی بوو. هیچ دەستنوسێک نەبوو لەسەردەمی دیکتاتۆریدا نوسرا بێت، و نوسەرەکەی بە ئومێدی بڵاوکردنەوە لەپاش کەوتنی رژێمی تۆتالیتارەوە، لە چەکمەجەی مێزەکەیدا شاردبێتیەوە. مەبەست لەم قسەیە هێرشکردنە سەر رۆشنبیرانی دژ بە نازی نیە، مەبەست رونکردنەوەی ئەو مەسەلەیەیە کە بۆچی بەرهەمی فکری بونی نەبوو، و بۆچی تەنیا چارەی رۆشنبیرانی نەیاری رژێمە تۆتالیتارەکان. کۆچی فیزیاییە.



بایرۆن

لەوەی کە گوتم ئاشکرایە کە کۆچکردن لەسەردەمی ناسیۆنالیزمدا، بێ ئەندازە لەهەر کاتێکی تری رابردو دەردناکترە. ئەو رۆشنبیرەی نیشتیمان بەجێئەهێڵێ، تەنها جێگەی نیشتەجێبونی خۆی ناگۆرێت. ئەبێت لە پێشینە مێژوویی و ئەزمونە هاوبەشەکانی دابڕێت، ئەبێ زمانێکی تازە فێر بێت، ئەبێ بەم زمانە و لەرێگەی ئەم زمانەوە بیربکاتەوە و ئەزمونی شتەکان بکات، ئەبێ بە یەک وشە ژیانێکی سەرلەبەر تازە دروستبکات. ئەوەی ئەبێت خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت، لەدەستدانی کار و ماڵ و پلە و پایە نیە (کە ئەڵبەتە ئەمەش خۆی لە خۆیدا دەردناکە)، ئەبێت لەگەڵ قورسای کلتورێکی تردا بگونجێت.

تەنانەت ئەگەر کۆچ بەمانای رزگاربون بێت لە دۆخێک کە تەحەمول ناکرێت (وەک لە ئەڵمانیای نازیدا هەبوو)، دیسان ئەم گونجانە ئاسانتر نابێت. رق لە نازیسم بەهیچ شێوەیەک باری گرفتە دەرونیەکانی سوکتر نەئەکرد، تەنانەت (و بەڵکو بەتایبەتی) باری ئەو کەسانەی کە رەنگە ناویان بنێین (زانایانی سیاسی)، واتە رۆشنبیرانی وەک مێژوونوسان، کۆمەڵناسان، دەرونناسان و توێژەرانی زانستە سیاسیەکان کە سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەتدا هەیە و ناچار بوون- یان ئەبوو ناچار بن- دەستوپەنجە لەگەڵ راستیە درندە و توندەکانی سیاسەتدا نەرمبکەن. بە ئەنقەست ئەڵێین بەتایبەتی زانایانی سیاسی کە روبەڕوی گرفتی دەرونی بونەتەوە، چونکە ئەمجۆرە کەسانە چالاکانە لەرێی دروستکردنی سیستەمی سیاسی پاکتر و باشتردا ئەجەنگان-یان ئەبوو بجەنگێن- و کاتێک بەناچاری نیشتیمانەکەیان بەجێهێشت، چارەنوس لە سێ رەهەندەوە گەمارۆی دان: چونکە هەم وەک تاکێکی مرۆڤ، هەم وەک زانایەک و هەم وەک مرۆڤێکی سیاسی، ئاوارە و دەربەدەر بون.

ئەگەر بمانەوێت رێسایەکی گشتی لە کۆمەڵناسیدا دابنێین. رەنگە ئەبێت وا بڵێین کە:

"کۆچ ئاسانتر ئەبێت، ئەگەر رۆشنبیری کۆچکردوو بتوانێت پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی لەگەڵ خۆیدا ببات، واتە ئەو فەزا کۆمەڵایەتیەی بۆ ئەچێت، لەگەڵ ئەو فەزایەدا کە جێی هێشتووە، لەیەک بچێت.

کۆچکردن ئاسانتر ئەبێت ئەگەر وەرگرانی تازە جێگەی وەرگرانی کۆنی بگرنەوە کە بە بەراورد بە رابردو پێکهاتەیەکی لێکچویان هەبێت، بەجۆرێک هەم ئەو بتوانێت لەگەڵ ئەوانی دیدا قسە بکات، هەم ئەوانیش بتوانن قسەی لەگەڵ بکەن (ئەم چەمکە دوو لایەنیە هانس شپایەر لە نوسینەکانیدا هێناویەتیەوە۱۲)"

هەنوکە گەر ئەم قسە گشتیانە لەبارەی ئەو پینچ دۆخەوە بەکار بێنین کە بینیمان، بەم ئەنجامانەی خوارەوە ئەگەین:

"ئەگەر وەک یۆنان لەسەردەمی دێریندا، شارستانیەت لە خاڵێکدا چڕ بێتەوە و، ئەگەر سیاسەت و کلتور یەک شت بن، کۆچکردنی رۆشنبیران ئەبیتە هۆی وشکبونی توانا فکریەکانی و رەنگە مەرگی فکری چاوەڕوانی بکات.

لە شارستانێتی گشتی سەدەکانی ناوەڕاستدا، پێگەی کۆمەڵایەتی و وەرگران لە هەموو شوینێکدا کەمتازۆر یەک شتن. قوتابیان و مامۆستاکانی زانکۆ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەگشتی خەڵکی هەموو وڵاتەکان بون و بەیەک زمان قسەیان ئەکرد و ئەیاننوسی و لە یەک سیستەمی بەهای بنەڕەتیدا هاوبەش و شەریک بون.

لەسەردەمی دەرکەوتنی دەزگا دەوڵەتیەکاندا بە مانای تازە، کەسانێک کە خاوەن لێهاتوویی تایبەتین بەتایبەتی لە بواری سوپایی و بەرێوبردندا، مافیان بە خۆیان ئەدا پاداشی بەرزتر داوا بکەن، و لەهەموو دەربارەکاندا پێگەی کۆمەڵایەتی و وەرگرانی یەکسانیان هەبوو.

دروستبونی دەوڵەتی یەک نەتەوەیی، رزگاری رۆشنبیرانی لەبەر ئەو هۆیانەی کە وتمان ئەستەمتر کرد. بەڵام هێشتا رێگەی کۆچکردن بۆ دەرون و لەسەدەی هەژدە و نۆزدەدا، کۆچکردن بۆ وڵاتانی تر، هێشتا بە رویدا کرابۆوە.

---

۱۲- Hans Speier, «The social Conditions of the Intellectual Exile» Social Order and the Risk of War, New York, pp ۸٦-۹٤.

ئاشكرایە كە لەبارەی تۆتالیتاریسمی ئەڵمانیاوە، ئەبێت هەندێك وردەكاری دیاریكراو باسبكەین. ئەمكارەش تەنها بە شیكردنەوەی دۆخی واقعی ئەڵمانیا و پێگەی رۆشنبیری ئەڵمانی مومكینە.
زۆر پێش ساڵی ١٩٣٣، شێوەی بیركردنەوەی رۆشنبیری ئەڵمانی ئاخنراو بوو بە گومانكاری و نائومێدی و نزیك لە ناباوەڕی و گاڵتەجاڕیكردن بوو بە بنەماكان. ئەوەی بە شۆڕشی ١٩١٨ بەناوبانگە دوو قوتابخانەی سیاسی ناكۆك بەیەكی دروستكرد: یەكێكیان ویلسۆنیسم و ئەوی تریان بەلشەفیسم. لەبارەی كۆتەكی هێزە فكریە جیاوازەكانەوە بۆ سەر ئەوروپا و بەتایبەت ئەڵمانیا، هەرچی بڵێین هێشتا كەممان وتووە. تیورەی بەرزەفڕی ویڵسۆن لەبارەی مافی چارەی خۆنوسین لە چوارچێوە یان دەرەوەی نەتەوە یەكگرتوەكان، بە مەبەستی كۆتایهێنان بەجەنگ و توندوتیژی، ئاشكراكەری هیوای لیبرالەكانی ئەڵمانیا و پەیرەوانی دیموكراتی كرێكاری ئەو وڵاتە بوو. شۆڕشی لینین لە چاوی كرێكاران و هەندێك رۆشنبیردا وەك دەركەوتنی مەسیجی مژدەبەخش و كۆتایهاتنی ستەمكاری و ئازادی مرۆیی و كەوتنی دەسەڵاتی سیاسی بوو.
هەردوو تیورەكە دۆڕان. دیموكراسی تەنانەت پێشتریش دۆڕا بوو، چونكە لە نزیكەوە بە سترابوو بە شكستەوە (شكستی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانی یەكەمدا) و هەرگیز ئەو چالاكی و بڕوابونە بەخۆی بەدەستنەهێنا كە لەوڵاتە ئەنگلۆساكسۆنەكاندا بەدەستی هێنابوو. لیبراسمی ئەڵمانیا لە ئەنجامی سیاسەتەكانی بسماركەوە روی لە گەندەڵی كردبوو و ئازادیشی بە فراوانخوازی ئیمپریالانە دۆڕاندبوو. دیموكراسی ئەڵمانی وەك دەزگایەكی بیرۆكراسی پانوپۆڕ سڕابۆوە و ئازادی كۆمەڵایەتی، بە بەهای موچەی بەرز فرۆشتبوو. بەلشەڤیسم گۆڕا بوو بۆ دەزگایەكی تیرۆرستی كە خراپ سودی لە فەلسەفەی ماركس وەرئەگرت و تاكە ئامانجی زیادبونی دەسەلاتی یەكیتی سۆڤیەت بوو لە دەرەوە و بەهێزكردنی دەسەلاتی سەركوتكەری باندی فەرمانڕەواكەی لە ناوەوە.
لەم دۆخەدا دیسان تیورە كۆنەكانی ناسیۆنالیستەكان و لایەنگرانی ژیانەوەی مەزنیتی ئەڵمانیا بەسەر رۆشنبیرانی ئەڵمانی و بەتایبەتی ژیانی زانكۆییدا باڵادەست بوو. زانكۆكان بون بە ناوەندی بیركردنەوە دژ بە دیموكراسیەكان. بە هەڵە وەرنەگیرێت. من ناڵێم ئەركی زانكۆكان پڕوپاگەندەی دیموكراسیە. لەم بوارەدا بە تەواوی لەگەڵ بیروڕاكانی ماكس فیبەردام لە وتارە بەناوبانگەكەیدا بەناوی "پیشەی زانست"١٣. بەڵام گاڵتەكردن بە دیموكراسی و وروژاندنی هەستە ناسیۆنالیستیەكان و پیاهەڵدان و ستایشی رژێمەكانی رابردو و شاردنەوەی ئەمانە بە خۆپیشاندانی درۆزنانە بەوەی كە "ناسیاسین"، بیگومان و بە دڵنیای لە ئەركی زانكۆكان نیە.
رێگەم بدەن ئەزمونە شەخسیەكانی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە. كاتێك لە بەهاری ١٩١٨دا چوم بۆ زانكۆی برسلاڤ، ئابوریزانی ناوداری ئەو زانكۆیە لە یەكەم وانەی خۆیدا پەیماننامەی ئاشتی ١٩١٧ی رەدكردەوە كە تیایدا پێشنیاری ئاشتی بێ خستنەسەر زەوی ئەوانی تر و بێ پێدانی باج كرابوو و خوازیاری خستنە سەری لۆن وی و بری و گۆڕینی بەلژیكا بوو بۆ سەرزەمینێك لەژێر كۆنترۆڵی ئەڵمانیادا و كۆلۆنیالكردنی بەشێكی گەورەی ئەوروپای رۆژهەڵات و بەدەستهێنانی كۆلۆنی لە دەرەوەی ئەوروپا. تەنانەت مامۆستایەكی ناودارتری

---

١٣- Scholarship as a profession) Max Weber, Wissenschaft als Beruf)



رۆسۆ



هۆبز

ئەدەبیات، پاش ئەوەی رێزی خۆی بۆ فەلسەفەی ئایدیالیزمی کانت راگەیاند، دەستیکرد بە دەرهێنانی ئەم مەسەلە رەهایە لەو فەلسەفەیە کە ئەڵمانیا ئەبێت سەرکەوێت و ئەبێت حکومەتی سەڵتەنەتی هەبێت و ئەبیت بە هەموو ئەو مەرجانەی کە وترا ئامادەی ئاشتی بێت. کاتێک لە پایزی ١٩١٨دا چوم بۆ لایپزیک، بینیم مامۆستای ئابوری ئەو زانکۆیە - هێشتا لە ئۆکتۆبەری ١٩١٨دا- بە پێویستی ئەزانێت پشتیوانی خۆی بۆ مەرجەکانی ئاشتی یەکێتی پان ژەرمەنی و ئەنجومەنی سوپای ئەڵمانیا رابگەیەنێت و، مامۆستای مێژووش بەڵگەی براوە ئەهێنێتەوە کە خودی دیموکراسی لەگەڵ رۆحی ئەڵمانیدا ناتەبایە و گەرچی رەنگە بۆ ئەنگلۆساکسۆنەکان بگونجێت، بەڵام ناکۆکە بە ئایدیالیزمی نەژادی ژەرمەن. کاتێک لە هاوینی ١٩١٩دا گواسترامەوە بۆ رۆستۆک، بینیم بۆ روبەڕوبونەوەی پروپاگەندەی دژ بە یەهود کە بە ئاشکرا ئەنجام ئەدرا، هیچ چارەیەک نیە جگە لەوەی رێکخراوێک لەناو خوێندکاراندا دروستبکەم. سەرئەنجام کاتێک گەیشتمە فرانکفۆرت، یەکەم ئەرک کە روبەڕوم بۆوە یارمەتیدان بوو لە پاراستنی مامۆستایەکی سوسیالیستی تازە دامەزراو لە بەرامبەر ئەو هێرشە سیاسی و جەستەیەی لەلایەن خوێندکارانەوە ئەکرایە سەری، ئەو خویندکارانەی کە لەژێرەوە لە لایەن زۆرێک لە مامۆستاکانەوە پشتگیری ئەکران.

ئەبێ سەرنجی ئەوە بدەین کەسانێک کە ئەم پڕوپاگەندەیان بۆ ئەم تیورانە ئەکرد و پەنایان بۆ ئەمکارانە ئەبرد، مامۆستایانی پلە دوو نەبون، هەموویان وەک ئەوترێت ئەستێرەکانی پلە یەکی زانکۆکانی خۆیان بون. قوتابخانەی گرانبەهای ویلهلام فۆن هۆمبۆلت چیدی بونی نەبوو. مەسخبونی زانین لە ئەڵمانیادا لە کتێبێکی بچوکدا بەناوی ”خراپ سود وەرگرتن لە زانین“١٤ بە وردی و هەستیاریەوە بە جوانی وەسف کراوە.

راستە کە لە ١٩٢٤وە تا ١٩٣٠ دەوڵەتێکی خێرا دروست بوو. حکومەتی کۆماری سەقامگیر دەرئەکەوت. شۆڕش و پوچی١٥ (کودتای) ”کاپ“١٦

---

١٤- Frederic lilge, The Abuse of learning.

١٥-putch وشەی ئەلمانی پوچ لە زمانی ئەڵمانی بەمانای یاخیبون و شۆڕش دێت، لە روی زاراوەییەوە بە مانای هێڕشی خێرا و غافڵگیرانەیە، لە دەقە سیاسیەکاندا بە مانای کودتای خێرا ( بە گشتی سەرنەکەوتووە).

١٦- ولفگانگ کاپ (W. kapp) یەکیک لە سیاسەتمەدارە پارێزگارەکانی ئەڵمانی کە لە ١٩٢٠دا بە هاوکاری ژمارەیەک ئەفسەری سوپا بە هێرشێکی خێرا بینا دەوڵەتیەکانی لە بەرلین داگیرکرد و بە تەمابوو دەسەلاتی وڵات بگرێتە دەست. بەڵام کارەکەی بەهۆی بێ بەرنامەیی و مانگرتنی گشتی کریکارانەوە شکستی هێنا و کاپ و هاوکارەکانی ناچار بە راکردن بوون (و.ف)

و هەڵئاوسان و"پوچی" ساڵۆنی بیرەخواردنی هیتلەر و راپەرینی کۆمنیستەکان، پیدەچوو هەموویان زەمەنیان بەسەرچو بێت. ویلسۆنیسم بەروکەش مومکین بوو بە جێگەیەک بگات. فراوانی و رەونەق لە ئەمەریکادا کاریگەریەکی سەرسورھێنەری لەسەر ئەڵمانیا هەبوو. "فۆردیسم" (بە وتەی ئەڵمانیەکان) بە چارەسەری هەموو کێشەیەک ئەزانرا. بەڵام پاشتر ١٩٣٠ هات و قەیرانی گەورەی ئابوری و بێکاری دروستبوو و رێکخراوە سیاسیەکان کەمکەم هەڵوەشانەوە و هاوکات لەگەڵیاندا، ئاراسەتەکانی رویان لە تازەکردنەوەی مەزنێتی ئەڵمانیایە لە زانکۆکاندا توند بۆوە، و دەستکەوتە بەڕوکەش شکۆدارەکانی ئەم دەوڵەتە خێرایە بە با چوو یان بە دەربڕینێکی باشتر نازیسمی بەرهەمهێنا.

کۆچکردنی رۆشنبیران بەھۆی نازیسمەوە، لە بنەڕەتەوە جیاواز بوو لەگەڵ کۆچکردنەکانی رابردودا. ئەبێت لەم ئاستەدا چوار هۆ لەیەک جیابکەینەوە (دیارە ئەگەر ئەوە فەرامۆش نەکرێت کە رەنگە ئەم چوار هۆیانە هەمویان لەیەک کەسدا کۆببنەوە، وەک چۆن لە رابردودا بووە). هۆی سیاسی، هۆی نەژادی، هۆی دینی و هۆی ئەخلاقی. پاڵنەری سیاسی، سەرتاسەری تەوژمە سیاسیە جیاوازەکانی ئەگرتەوە - لە پارێزگاری و ناسیۆنالیسمەوە تا کۆمۆنیسم -. لەبەرئەوە لەناو کۆچکردوەکاندا هیچ جۆرە یەکێتیەکی سیاسی بونی نەبوو و مومکین نەبوو بوونی ببێت. دوهەم بەدوادا گەڕان و ئازارە نەژادیەکان بوو، کە یەهودیەکان و نیمەچە یەهودیەکان و تەنانەت چارەکە یەهودیەکانی ئەکردە ئامانج، بەدەر لەوەی ئەم کەسانە نەیاری رژێم بن یان نا. سێهەم هۆی دینی بوو، چونکە نازیسم بە ئاشکرا دژی مەسیحیەت بوو، هەرچەندە ململانێ لەگەڵ دین لەبەر هۆی تاکتیکی هەرگیز بە تەواوی جێبەجێ نەکرا. و دواجار قێزکردنەوەی ئەخلاقی بوو لە رژێم، هاوکات لەگەڵ بڕوایەکی تەواودا بەوەی گەندەڵی ئەخلاقی رژێم تەنانەت ئەگەری "کۆچکردن بۆ ناو دەرون"ی لەناوبردووە. لەبەرئەمانە ئەم کوچکردنە هیچ لێکچونی لەگەڵ کۆچەکانی ساڵی ١٨٤٨دا نەبوو، چونکە کۆچکردن لەو سەردەمەدا رەهەندیکی سیاسی هەبوو و دورخراوەکان و ئەوانەی نیشتیمانیان بەجێهێشتووە



ماکس ڤێبەر

لەبەرهەمان هۆ بە دیاردەیەکی کاتیان ئەزانی.
نازیسم هەر رژێمی سیاسی ئەڵمانیای نەگۆری، بەڵکو ئەڵمانیای گۆڕی. لەبەرئەوە زۆر کەس لە سەرەتاوە – یان لە ماوەیەکی کەمدا– جێهیشتنی نیشتیمانیان بە پچڕانی پەیوەندی کامڵ لەگەڵ ئەڵمانیادا و چاندنی درەختی ژیان لە خاکێکی تردا ئەزانی.
رێگەم بدەن جاریکی تر بگەڕێمەوە بۆ ئەزمونەکانی خۆم. من بۆ ئەوەی نزیک بم لە ئەڵمانیاوە و پەیوەندیم پێوەی نەپچڕێت، لە سێ ساڵی یەکەمدا واتە لە ١٩٣٣وە تا ١٩٣٦ لە ئینگلتەرا بردمە سەر. جگە لە خوێندنی پۆست دکتۆرا لە زانستە سیاسیەکانی زانکۆی ئابوری لەندەن، لە ناوەندە سیاسیەکانی پەنابەرانیشدا چالاکیم ئەکرد. لە ئینگلتەرا بوو کە بە باشی تێگەیشتم کە چاوەڕوانکردنی کەوتنی رژێم لە ناوەوە، ئەبێت بچێتە گۆڕەوە. سیاسەتی هێزە حوکمڕانەکانی ئینگلتەرا کەهەوڵی موجامەلەکردنی (هیتلەریان) ئەدا، و ئاشتیخوازی حیزبی کرێکاران کە لەو سەردەمەدا حیزبی نەیاری دەوڵەت بوو، هێواش هێواش من و زۆر کەسی تری بەو ئەنجامە گەیاند کە رژێمی نازی نەک لاوازتر نابێت، بەڵکو بە پشتیوانی هێزە ئەوروپایە گەورەکان بەهێزتریش ئەبێت. کەوابوو ئەبوو بە تەواوی پەرەوەندەکە لەروی دەرونی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەوە دابخرێت و ژیانێکی تازە دەست پێ بکرێت.
بەڵام ئینگلتەرا شوێنیک نەبوو کە بەکەڵکی ئەمە بێت. من و ئەوانی تر هەمومان ئینگلتەرامان خۆش ئەویست، بەڵام کۆمەڵگای ئینگلیزی زیاد لە سنور چونیەک و پێکەوە گرێدراو و ئیمکاناتەکانی (بەتایبەتی لەو سەردەمی بێ کاریەدا) زیاد لە سنور سنوردار و سیاسەتەکانی دڵگیر نەبوو. هەستمئەکرد هەرگیز ناکرێت وەک ئینگلیزەکان ببیت بە ئینگلیزی. لەبەرئەوە پێئەچوو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا تاکە وڵاتێک بێت کە ئەم جێگۆڕکێ سێ رەهەندیەی– وەک مرۆڤ، وەک رۆشنبیر و وەک زانایەکی سیاسی– تیا مومکینە.
ئەوەی کە ئەم جێگۆڕکییە– نەک هەر لەبارەی منەوە، بەڵکو لەبارەی سەدان کەسی ترەوە، بە سەرکەوتوی ئەنجامدراوە، بەر لەهەرشتێک قەرزاری ویلایەتە یەکگرتوەکان و خەڵکی ئەمەریکا و زانکۆکانی ئەم وڵاتەیە.
باشترین بەڵگەی ئەمەش ئەو راستیە سەرسوڕهێنەرەیە کە ئەگەرچی پاداشتی مادی و نا مادی لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا بەگشتی زیاترە لە ئەمەریکا، بەڵام ژمارەیەکی یەکجار کەم کە بە پەنجەی دەست ئەژمێرێن بڕیاریان داوە (پاش جەنگ) بگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا.
ئەو شتانە چیبون کە لە ١٩٣٦دا زۆرترین کاریگەریان لەو رۆشنبیرانە ئەکرد کە نیشتیمانیان بەجێهێشتووە؟
بە بڕوای من سێ شت: بەرنامەی رۆزفێلت و خووڕەوشتی خەڵک و دەوری زانکۆکان.
جارێ لێرەدا دەرفەتی ئەوەم نیە کە بەرنامەی رۆزفێلت و خووڕەوشتی خەڵکی ئەمریکا، لەروانگەی ئێمەی کۆچبەرانەوە لەو رۆژانەدا شیبکەمەوە. لە روانگەی ئەڵمانیەکی گومانکارەوە بەرنامەی رۆزفێلت بەو مانایە بوو کە ئەو ویلسونیسمەی لە ١٩١٧وە ئامۆژگاری ئەکرا، راست بوو، نەک دروشم و پڕوپاگەندە، ئەیسەلمێنێت کە رژێمێکی دیموکراسی خەباتکار، تواناى چارەسەری ئەو کێشانەی هەیە کە بە هۆیەوە کۆماری ئەڵمانیا روخاوە.
خووڕەوشتی خەڵکی ئەمەریکا و میهرەبانی و دراوسی دۆستی و رۆحی هاوڕێیەتی تیایاندا بەهەمان ئەندازە – و بگرە زیاتر– کاریگەر و سەرنجڕاکیش بوو. زۆر کەس ئەم خەسڵەتانەی ئەوانی شیکردۆتەوە و ستایشی

کردووە و لەمڕووەوە پێویست ناکات من دوبارەی بکەمەوە. هەر ئەوەندەی کەسێک بەراستی لە ئەورووپا بەتایبەتی لە ئەڵمانیا وازی هێنا، کرانەوەی کۆمەڵگای ئەمەریکی و جێکردنەوەی خۆی لە ناویدا، زۆر بە ئاسانی ئەبینێت.
بەڵام لە روی کەسایەتی زانستیەوە ئەوەی لە هەموو شتیکی تر گرنگترە، ژیانی زانکۆییە. پێشتر وتم ئەگەر زانایەک بەر دۆخیکی کۆمەڵایەتی هاوشێوە بکەوێت، جیگۆڕکێ لە کلتورێکەوە بۆ کلتورێکی تر بە روکەش ئاسانتر ئەبێت. بەڵام ئەبێت ئەوە ببینین کە لە روی کاروباری زانکۆوە، دۆخی ئەڵمانیا هاوشیوەی ئەمەریکایە؟ یان جیاوازیەکان بەسەر لیکچونەکاندا زاڵە؟
زانای ئەڵمانی بە گشتی لە روی فکریەوە لەژێر کاریگەری سێ شتدا بووە: ئایدیالیسمی ئەڵمانی، مارکسیسم و مێژووگەری. ئەم سیانەش ئەو خەسلەتە هاوبەشەیان هەبووە کە قوتابخانەی فکری تۆتاڵ بون و لایەنگرانی بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە ئەتوانن هەر دیاردەیەک لەو سیستەمانەدا بگونجێنن. لەمە تێپەڕێت لەهەر سێکیاندا قورسایی لە رادەبەدەری ئەزمونەکانی رابردو و نەریتە مێژووییە تایبەتیەکان ئاشکرایە. لێرەوە زانای ئەڵمانی بەشێوەیەکی سەرەکی ئەهلی تیورە و مێژوو- و بە دەگمەن لایەنگری رێبازی ئەزمونگەری و پراکتیکی - بووە. هەموو ئەمانە رێگە بۆ گومانکاری ئەکاتەوە. زانایەک کە بیرکردنەوەی میژوویی هەبێت، پرۆسەی مێژوو بە دوبارەکردنەوەی نمونەکانی رابردو ئەزانێت و سوکایەتی بە تازەگەری و داهێنان بە بەهای زیادکردنی قەدەر و "رەوتی مەزنی مێژوو" ئەکات. ئەگەر بڕواکە لەسەر ئەوە بێت مێژوو بە ئاراستەیەکی دیاریکراودا کار ئەکات، شیوەی بیرکردنەوەی ناوبراو- وەک لە مارکسیسمدا ئەیبینین- روو لە توندرەوی ئەکات، بەڵام بەهەرحاڵ هەمیشە وشکی و سەختگیریەکی نزیک لە دەمارگیریەوە لە بیریارەکەدا دروست ئەکات.
ئەم هەڵویستە تیوری و مێژووییە، هاوکاتە لەگەڵ جۆرێک سوکایەتی بە فەلسەفەی ئینگلیز و ئەمەریکا (یان لانیکەم لە رابردودا وابوو). هێشتا ئاوازی گاڵتەجارانەی مامۆستاکەی خۆم لە فەلسەفەدا لە گوێمدایە کاتێک باسی لۆک و کۆندیاک و دیڤیی ئەکرد، و لە یادمە کە بیروڕاکانی وایتهاید لەو رۆژگارەشدا وەک ئەمڕۆ، چۆن بە بێدەنگی جێبەجێ ئەکرا.
لەبەرئەوە ئەڵمانیەکی کۆچکردوو کە خوی بە حورمەتدانان بۆ مێژوو و تیورە و بە سوک تەماشاکردنی ئەزمونگەری و پراگماتیسمەوە گرتووە، ئەڕۆیشتە ناو فەزایەکی خۆشبینی فکری و روو لە ئەزمون و نامێژوویی کە خاڵی بەرانبەر بە رابردوە، بەڵام دیارە بڕوابون بە راستی بونی خۆی، بە هەمان ئەندازە باڵادەست بوو.
ئەم جیاوازیە بنەڕەتیە نەک هەر لە نەریتی فکری، بەڵکو لە دۆخی زانکۆکانیشدا ئاشکرا بوو. زانکۆکانی ئەڵمانیا وەک جێگەی پەروەردەکردنی خەڵکی تایبەت و دەستەبژێرەکان تەماشای خۆیان ئەکرد، وەک ئەوەی ئەم کۆمەڵە لە خەڵکی تایبەت و دەستەبژێرەکان بە پێوەری کومەڵایەتی- ئابوری دروست بوبێت، نەک بە سەرنجدان لە سەرکەوتنە زانستی و فکریەکان. زانکۆکانی ئەمەریکا بازوی بنەمایەکی پەروەردەی بون کە بریتیە لە بەهرەمەند بونی هەرچی زیاتری خەڵک لە ئیمتیازەکانی خوێندن و پەروەردە. پەروەردەکردنی خەڵکی تایبەت، بەشێکی بچوک بوو لە کۆی چالاکیەکانی پەروەردە.
زانکۆ لەئەڵمانیا بانگەشەی ئەوەی ئەکرد کە universitas ە، واتە ئەبێت بنەماکانی زانستە مرۆییەکان بڵێتەوە، بەڵام لە ماوەیەکی زۆر لە پێشەوە بوو بوو بە کۆمەڵیک کۆلێجی پسپۆری بۆ ئەو کەسانەی ئەیانویست



## کارل مارکس

ببن بە یاسازان، یان دکتۆر یان بەڕێوەبەری ئامادەیی. ئەو جێگەیەی بەراستی بنەماکانی هۆمبۆڵتی تیا ژیابۆوە، لە وانە گشتیەکانی کۆلیجە ئەمریکیەکاندا بوو.

مامۆستای زانکۆ لە ئەڵمانیادا ئەندامی "کاستێکی" کۆمەڵایەتیە کە ئیمتیازی تایبەتی هەبوو، و موچەیەکی تاڕادەیەک زۆری وەرئەگرت و لەکۆمەڵگادا خاوەنی پایە و پلەیەکی تایبەت بوو. مامۆستای کۆلێجی ئەمەریکی هیچ یەک لەم ئیمتیازاتانەی نەبوو.

مامۆستای زانکۆی ئەڵمانیا سەیری خوێندکارانی وەک کۆمەڵێک کەسی ڕێگر ئەکرد کە ڕێ لە پەیامە راستەقینەکەی خۆی وەک Forsdher یان وەک زانایەکی لێکۆڵەرەوە ئەگرن. مامۆستای کۆلێج لە ئەمەریکا مامۆستا و زۆرجار نهێنی هەڵگری خوێندکارەکانی خۆیەتی.

کەوابوو هەم لەروی فکری زانستیەوە و هەم لەروی دەزگاییەوە، لە رابردودا وەک ئێستا جیاوازی زۆر هەبوو. و رەنگە جیاوازیەکان لە لێکچونەکان زیاتر بوو بیت. کاریگەری ئەم ئەزمونە تازەیە (کە روبەڕوی زانای ئەڵمانی ئەبێتەوە) رەنگە لە سێ لایەنی جیاوازەوە دەرکەوێت (وەک کردوێتی):

زانای کۆچکردوو رەنگە دەست لە هەڵوێستی فکری رابردو هەڵبگرێت و بێ قەید و شەرت ئاراستە تازەکە قەبوڵبکات (وەک چۆن هەندێکجار کردوێتی).

هەروەها رەنگە (وەک رویداووە) بەتەواوی بونیادی فکری رابردو بپارێزێت یان بڕوای وابێت کە خاوەن پەیامێکە بۆ بونیادنانەوەی سەرلەبەری نمونەی ئەمەریکی، یان (بە هەستکردن بە سوکایەتی) بکشێتەوە و لە گوشەیەکدا دابنیشێت.

دواجار رەنگە لە هەوڵی گونجاندن و گرێدانی ئەزمونی تازە لەگەڵ نەریتی کۆندا بن، کە بە بڕوای من ئەستەمترین و لەهەمانکاتدا شایستەترین رێگەچارەیە.

باشترین رێگە بۆ لێکۆڵینەوەی شێوە هەڵوێستی دوایی، شیکردنەوەی دەوری زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەرکەکانی زانایانی ئەم لقانەیە، واتە بابەتێک کە من لە هەموو شتێک زیاتر لێی ئەزانم.

وەک پێشتر وتم زانین لە ئەڵمانیا بەو خەسلەتە ئەناسرێتەوە کە لەژێر کاریگەری قوتابخانە فەلسەفیە گەورەکانی سەدەی نۆزدە و هەروەها رەخنە و هەڵسەنگاندنی ئەم قوتابخانەیەیە: واتە کانت و مارکس و هیگڵ لە لایەک و نیتچە و فرۆید لەلایەکی ترەوە. راکانی کانت و هیگڵ بە خێرایی لە قاڵبی وشکدا بەستیان و ئەو کاریگەریە راستەوخۆیەی لەسەر بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەجێیان هێشت کارەساتبار بوو.

کاریگەری هیگڵ لە ناوەندە زانستی و زانکۆییەکاندا تێکەڵ بە پاریزگاری بوو و لە دەرەوەی ئەو ناوەندانەش



بسمارک

(لە ڕێگەی مارکسەوە) شۆڕشگێڕانە بوو. کانتیسم زۆربەیجار سەرپۆشێکی مەعنەوی (یان ئایدیالیستی) بۆ مەبەستی زۆر مادی (یان ماتریالیستی) بەکار ئەهێنرا. بەڵام ئەم ئاراستەیە بەروکەش لە خودی تیورەکانیەوە لە باسی زانین و ئەخلاقەوە سەردەردێنی. لە ئەبستمۆلۆجیای کانتدا درزی نێوان عەقڵ و بوون (یان واقع) هەرگیز پڕ نەبۆتەوە. لە فەلسەفەی کانتدا بۆ ئەخلاق، جەختکردنەوە لەسەر شێوە و قاڵبی بابەتی ڕەها، ئەو ئەگەرە دروست ئەکات کە هەر مەیل و خواستێکی تایبەت، هەرچەند خۆبەخۆیانەش بێت، بە پلەی یەکێک لە یاسا گشتیەکان بگەیەنرێت. لەبەرئەوە هیچ جۆرە ڕوداوێکی فکری پێشڕەو لە سەرچاوەی هیگلیسم یان کاتنیزمەوە هەڵنەقوڵا. مارکس و فروید لە زانکۆ ئەڵمانیەکان دەرکرابون. ڕەخنەی نیتچە لە فەزیلەت (یان بە دەربڕینێکی باشتر ڕەزیلەتەکانی) بۆرژوازی ئەڵمانیا، بە پێچەوانەوە مەسخ بوو.

سەرکەوتنە گەورەکان هەموویان لە بواری مێژوو و یاسادا بەدەستهاتبوو، بەڵام نە مێژوو بە هیچ شێوەیەک ئەتوانێت لەگەڵ واقعە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا دەست و پەنجە نەرم بکات، نە یاساکان. لەبەرئەوە لیکۆڵینەوە لەو واقعیاتانە لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا جێگەی نیە. لێکۆڵینەوەی زانستی بە شێوەیەکی سەرەکی بریتی بوو لە تیورەداڕشتن و زانیاری نوسراو. ئەوەی لای ئێمە بە زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان ناسڕاوە، پێشتر لە دەرەوەی زانکۆکان ئەخوێنرا.

تەنها یەک ئاوارتن هەبوو ئەویش ماکس فیبەر بوو کە لە هەر جێیەک زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بخوێنرێت، ناوی ماکس فیبەر ناسراو و جێگەی ڕێز و ستایشە. مەزنێتی فیبەر لەوەدایە کە بە شیوەیەکی بێهاوتا چوارچێوەیەکی تیوری (ئەگەرچی لە ڕوانگەی منەوە بێ بەها) و خاوەنداریێتی بڕێکی سەرسوڕهێنەری زانیاری و دیاردەکان و هەستی بەرپرسیارێتی سیاسی شایستەی زانایەکی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا کاریگەری و نفوزی فیبەر لە ئەڵمانیا زۆر سنوردار بوو. زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەڵمانیا، بە پەیڕەوی لەو خەسڵەتەی خاوەنی بوو و بە سنوردارکردنی سەرنج لەسەر ڕەهەندی میتۆدۆلۆجی لە فیبەردا، بەگشتی لەناوی برد. نە سەرنج لە جەختکردنی

فیبەر لەسەر پێویستی لێکۆڵینەوە ئەزمونگەریەکان کرا و نە پێداگرتنی لەسەر زەرورەتی هەستی بەرپرسیاریتی زانا بەرامبەر بە کۆمەڵگا. ئەو جێگەیەی بەراستی فیبەر تیایدا ژیایەوە، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا بوو.

دیارە ئەڵمانیا هەمیشە وا نەبووە. رۆژگارێک پێش ١٨٧٠، لە ئەڵمانیا و زانکۆکانی ئەڵمانیادا زانستە سیاسیەکان هەبوو و وە کاری پێئەکرا. ئەوەی سەرنج رائەکێشیت برجس١٧ کۆلێجی زانستە سیاسیەکانی زانکۆی کۆلۆمبیای (لە شاری نیویۆرک) لەسەر بناغەی نمونەی Staatswissenschaft (زانستە سیاسیەکان) ئەڵمانیا بونیاد نا. روتک١٨ و ولکر١٩ و روبرت فون مۆڵ و بلونچلی٢٠ و دالمان٢١ و بە تایبەتی لۆرنتس فۆن شتاین هەمویان لە زانا سەنگینەکانی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بون و لە بەڕێوبەرایەتی دەوڵەتی و شیکردنەوەی حیزبە سیاسی و لیکۆڵینەوەی مەیدانی دەزگا سیاسیەکان و بونیادی کۆمەڵگادا، لیکۆڵینەوە و خوێندنەوەیان ئەکرد.

بە دامەزراندن و سەقامگیری ئیمپراتۆری ئەڵمانیا، هەموو ئەمانە کۆتاییان هات، ئەمەش خۆی رەنگدانەوەی کەنارگیری لیبرالیسم بوو لە سیاسەت، لیبرالەکانی ئەڵمانیا هەموو هۆش و هەستی خۆیان ئاراستەی تیورەی Rechtsstaat (واتە (دەوڵەتی یاسایی یا) دەوڵەتی بونیادنراو لەسەر یاسا) کرد. لایەنگرانی ئەم تیورەیە گرنگیان بە سەرچاوە و دروستبونی یاسا نەئەدا و تەنها گرنگیان بە پێناسکردنی مافەکانی هاوڵاتی بە تایبەتی مافی موڵکایەتی لەبەرامبەر دەوڵەتدا ئەدا. بەمشێوەیە مافە یاساییەکان جێگەی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی گرتەوە. و ئەشبێ دان بەوەدا بنێین کە بەڕاستی سەرکەوتنی گەورە لەو بوارەدا بەدەستهات.

لە ١٨٧٥ بە دواوە Obrigkeitsstaat (دەوڵەتی دەسەڵاتدار)- یان رەگەزی دەسەڵاتداری- و Rochtsstaat - یا رەگەزی یاسایی- کە ئامانج لێیان تەنها بریتی بوو لە بەرگریکردن لە مافی موڵکایەتی، بە خێرایی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی لەناوبرد. زانکۆکان یاساناس پەروەردە ئەکەن بۆ بەرگریکردن لە مافی موڵکایەتی، مامۆستا پەروەردە ئەکەن بۆ پروپاگەندەکردن بۆ هونەرەکان و باشیەکانی رەگەزی جەرمەنی، تەکنیکی و تیورەزان و مێژونوس پەروەردە ئەکەن، بەڵام چیتر زانای زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بۆ ریفۆرمی کۆمەڵگا و سیاسەت پەروەردە ناکەن. گەورەترین جیاوازیەک کە زانای سیاسی روبەڕوی ئەبێتەوە، هەر ئەم جیاوازیە بنەڕەتیە بوو لە دەوری خەڵکانی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا.

ناکرێت ئەوە هەڵسەنگێنرێت ئایا ئەو ئەڵمانیانەی وڵاتیان بەجێ هێشتووە، سەرچاوەی چ خزمەتێک بون بۆ زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان. وەک پێشتر جەختم لێکرد خەسڵەتی رژێمی نازی هۆی کۆچکردنی زانایانێک بوو کە دیدی سیاسی و تیوری لە بنەرەتەوە جیاوازیان هەبوو. لەبەرئەوە ناکرێت کۆچکردنی ئەمان بە کۆچکردنی زانایانی یۆنانی لە ئیمپراتۆریەتی بیزانس لەسەدەی پانزەهەمدا بەراورد بکرێت. زانایانی پەنابەری ئەورووپی بەرادەیەک لەیەک جیاواز بون، کە دیاریکردنی وردی خزمەتەکانیان بە تایبەتی بۆ زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان

١٧- J.W. Burgess (١٩٣١-١٨٤٤) مامۆستای زانستە سیاسیەکان لە کۆلۆمبیا. (و،ف)

١٨- K. W, von Rotteck (١٨٤٥-١٧٧٥) سیاسەتمەدار و مێژونوسی ئەڵمانی.

١٩- K. T, Welcker (١٨٦٩-١٧٩٥) سیاسەتمەدار و زانای ئەڵمانی.

٢٠- K. Blunntschli (١٨٨١-١٨٥٨) یاساناس و دەوڵەتمەداری سویسری و یەکێک لە نونیادنەرانی دەزگای یاسایی نێونەتەوەیی لە شاری گنت.

٢١- F. C. Dahlmann (١٨٦٥-١٧٨٥) سیاسەتمەدار و میژونوسی ئەڵمانی و یەکیک لە نوسەرانی دەستوری ئەڵمانیا لە ١٨٤٨.

- و لەبەرامبەر زانستە سروشتیەکان و هەندێکجار هەندێک لقی پسپۆری وەک مێژووی هونەر و میژووی ئەدەبیات و ئەم شتانە، بە گشتی نامومکینە. کاریگەریەکانیان ئەوندە ناسک و باریک و پەرشوبڵاو بووە کە دیاریکردن و ئەندازەکردنی بەهیچ شێوەیەک کارێکی ئاسان نیە.

بەدەرلەمەش تەنانەت پیش ١٩٣٣ لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا پەیوەستبونی دوو لایەنە لە نیوان ئەوروپا و ئەمەریکادا هەبوو. ڕۆیشتنی کەسانی وەک ڕۆبرت میکلس٢٢ و ویلفردۆ پارەتۆ و گائیتانۆ مۆسکا٢٣ (بۆ ئەمەریکا) پەیوەندی بە کۆچکردنەکانی دوای ١٩٣٣وە نەبوو. ڕەونەقی قوتابخانەی پۆزەتڤیسمی لۆژیکی ڤینا لە ئەمەریکا، بە روکەش سەربەخۆ لە گۆرانکاریە سیاسیەکانی ئەڵمانیا و نەمسا روی ئەدا.



نیچە

به بڕوای من هیچ یەک لەم دوو روداوە سودمەند نەبوون و هەردوکیان یارمەتی بەهێزبونی ئاراستە نامێژوییەکان (و تەنانەت دژ بە مێژوییەکان) و دژ بە تیوریان لە زانستە کۆمەلایەتیەکانی ئەمەریکادا کرد.

باوەری من و کەسانی وەک من کە لە قوتابخانە فەلسەفی و مێژوییە گەورەکانی ئەوروپادا لەدایک بون ئەوەیە کە ئێمە دوو شتمان بۆ زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ئەوروپا زیاد کردووە.

یەکەم و گرنگتر جۆرێک گومانکاری بووە. من و زۆرێکی تر لەو خۆشبینیەدا هاوبەش نین کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان بە زەبر ئەتوانێت دنیا بگۆڕێت. چاوەروانیەکانی ئێمە زۆر لە خوارترە، چونکە بڕوامان وایە ئەو سنورەی پرۆسەی مێژوو بۆ زانستە کۆمەڵایەتیەکانی بەرهەمدینێت، سنوریکی بچوکتر لەوەی چاوەروان ئەکرێت، دروست ئەکات.

دوهەم هەوڵەکانی ئێمە بووە بۆ دانانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لەناو چوارچێوەیەکی تیۆریدا. بە بڕوای زۆرێک لە

---

٢٢- R. Michels (١٩٣٦-١٨٧٦) ئابوریناس و کۆمەڵناسی ئەڵمانی.

٢٣- G. Mosca (١٩٤١-١٨٥٨) زانای ئیتاڵی زانستە سیاسیەکان.

ئێمە وا پێدەچو و تا ئێستاش وا پێدەچێت کە زیادەڕەوی لە گرنگی و مانای پێدراوە ئەزمونیە کۆکراوەکان- لە بەرامبەر ئەو چوارچیوە تیوریەدا- کراوە و، سەرنجی زیاد لە سنور لەسەر لێکۆڵینەوەی ئەزمونی، دیاریکردنی مانا و گرنگی مێژوویی مەسەلەکان ئەستەم ئەکات. و پێداگری لەسەر پێویستی کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری پێدراوەکان، کەم کەم لیکۆڵەرەوە ئەکات بە بەکارهینەرێک، پێویستی بە پارەیەکی زۆر بۆ دابینکردنی ئەمجۆرە لیکۆڵینەوانە، هێواش هێواش وابەستەییەک دروست ئەکات کە بە بڕوای من دەوری رۆشنبیر ئەخاتە مەترسیەوە.
رەنگە زیادەڕەویم لە جەختکردن لەو چوار مەترسیە کردبێت، بەڵام مەترسی لەجێی خۆیدایە: زانایەکی پەناهەندە کە لە نەریتێکی تردا لەدایک بووە، ئەبی بە سودوەرگرتن لە زانینی میژووی خۆی و ئاگاداربون لەو پەیوەندیە مێژویانەی هەیە، تا ئەوپەڕی مومکین ئەم مەترسیانە کەم ئەکاتەوە.
بەڵام خاڵێک کە رەنگە زۆرترین گرنگی هەبوو بێ ئەوەیە کە ئێمەش بە نۆبەتی خۆمان بە بینینی ئەم سەرقاڵیانەی زانایانی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەمەریکا، سەرنجمان بۆ ئەوە راکێشراوە کە لێکۆڵینەوە نابێت تەنها تیۆری و مێژووی بێت و ئەرکی زانای زانستە کۆمەڵایەتیەکان دروستکردنی پەیوەندیە لە نیوان تیورە و پراکتیکدا و ئەم پەیوەندیەش پێویستی بە تێبینیکردنی واقعیەتە توندەکانی ژیان و شیکردنەوەیانە.
بەهەرەیەک کە من لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وەرمگرت، هەر ئەم تێگەیشتنە قوڵترەی ئەرکی زانای زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بووە.
زانای ئەڵمانی کە بۆ دیدار ئەگەڕیتەوە بۆ ئەڵمانیا، بە بێ ئاوارتن سەرنجی بۆ بەرکەوتنی گەورەی بۆچون و بیروڕاکان لەبارەی ریفۆرمی زانکۆکانی ئەو وڵاتەوە ئەچێت. بە گشتی هیچ کارێکی گرنگ بە مەبەستی ریفۆرمی رۆحی باڵادەست بەسەر زانکۆ ئەڵمانیەکان و بونیادی دەزگایی و گۆڕانی بەرنامەکانی خوێندن نەکراوە. دوری قوڵی نێوان خوێندکاران و مامۆستاکان هێشتا هەیە، هێشتا خوێندنی بەراستی گشتی لە زانستە مرۆییەکاندا بونی نیە، و هیشتا زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان نەمامێکی زۆر ناسک و نوێن.
بەڵام هەر ئەو چەند کارە بچوکەی ئەنجامدراوە، بە شێوەی سەرەکی بە بەرەکەتی سەرمەشقێک کە پەنابەرە گەڕاوەکان و میوانە ئەمریکیەکان داویانە - واتە بێ تەکەلوفی و گرنگیدان بە خوێندکاران و گرنگیدانی زیاتر بە واقعیەتی سیاسی و کۆمەلایەتی- بەدەستهاتووە، نەک بە هۆی نویخوازی و نوێ دەوڵەتی ئەوانەوە.
زانای گەڕاوە خۆی لە دۆخێکی سەرسوڕهێنەردا ئەبینێت. لە ئەمەریکادا ئەبێ ململانێ لەگەڵ ئەوانەدا بکات کە زیاد لە سنور حەزیان لە لێکۆڵینەوەی مەیدانی و ئەزمونی هەیە و جەخت لەسەر گرنگی رەهەندی تیوری و مێژووی بکات، لە ئەڵمانیادا ئەبی دوبارە ببێتەوە بە لایەنگری لیکۆڵینەوەی مەیدانی. من ئەمڕۆ گرنگی و پایەی راستەقینەی زانای ئەڵمانی کە سەردەمێک لەبەر هۆێ سیاسی نیشتیمانی بەجێ هێشتبوو، لەم دەورە دو لایەندا ئەبینم .

سەرچاوە:
فرانس نویمان: ازادی و قدرت و قانون. ترجمە: عزت الله فولادوند. چاپ اول ١٣٧٣. تهران. شرکت سهامی انتشارات خوارزمی.

# شۆڕش و دەوڵەت... ململانێی دژەکان

نووسینی: وسام الربيعی
و. لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانع

شۆڕشگێڕەکان، بەدرێژایی مێژوو، مەشخەڵی تێکۆشانیان لەپێناو ئازادیدا بەرزکردوەتەوە، خەون و حەز و ویستی چەوساوەکان و بێدەرەتانەکانیان هەڵگرتووە و لە دژی چەوسێنەرەکانیان ڕاوەستاون و داوای مافەکانیان بۆ کردوون. بەڵام زۆرجار شۆڕشەکانیان شکستی هێناوە و ژمارەیەکی کەمیان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە. ئەگەر شۆڕشێک شکستی هێنابێت، ئەوا بووەتە ئەو پزیسکەی کە لە دوای خۆیەوە شۆڕشی دیکەی هەڵگیرساندووە. بەڵام ئەگەر شۆڕشێک سەرکەوتنی بەدەستهێنابێت، ئەوا سەرکەوتنی حەق و چەوساوەکان بووە، ئەگەرچی ئەو سەرکەوتنە تا ماوەیەک بووە، دەڵێم تا ماوەیەک، چونکە شۆڕشگێڕەکان هەر

**ئیسلام سەرەتا وەك شۆڕشێك دژ بە ستەم و گەندەڵی بەرپابوو، ئیسلام لە کۆمەڵگای عەرەبیدا وەك بزوتنەوەیەکی چاکسازی دەرکەوت، بەشی هەرە زۆری شۆڕشگێڕە بەراییەکان لە خەڵکە چەوساوە و بێدەرەتانەکان بوون**

هێندەی لە شۆڕشەکەدا سەردەکەون، دەسەڵات و حوکمڕانی بۆ خۆیان قۆرخ دەکەن و ئەوانی دیکە وەلادەنێن، وەک چۆن پێشتر وەلانرابوون.
لێرەوە شۆڕشگێڕان دەکەونە ناو لەزەت و چێژی حوکمڕانی و دەسەڵات و سەروەت و سامان کۆکردنەوە و دەوڵەمەندی و دەیان شتی دیکە. ئیدی لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، ئەو شۆڕشگێڕە دەبێت بە ستەمگەر، ئەو ریفۆرمخوازە دەبێت بە گەندەڵ. ستەمگەرەکانی ئەمڕۆ شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ بوون، شۆڕشگێڕەکانی ئەمڕۆ بێ چەندوچوون، دەبنە ستەمگەرەکانی سبەینێ. کەواتە سڵاو لەو شۆڕشگێڕانەی لە پێناو ئازادیدا شەهیدبوون، پێش ئەوەی بکەونە ناو لەزەتی حوکم و دەسەڵاتەوە.
مادام ئێمە لەمڕۆدا ئەوە دەژین کە پێی دەوترێت بەهاری عەرەبی، ئەوا خراپ نییە باس لەم مەسەلەیە و ئەگەری چارەنوسەکەی بکەین، چونکە پێناچێت چارەنوسی ئەم شۆڕشانە، لە چارەنوسی ئەوانی پێش خۆی، جیاوازتربێت کە لە شوێن و زەمەنی دیکەدا رویانداوە. مێژوو تەنها چەند نمونەیەکی زۆر کەم و دەگمەنمان لەو شۆڕشگێڕانە بۆ باس دەکات کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکانیان، نەکەوتونەتە ناو لەزەت و خۆشی حوکم و دەسەڵاتەوە، بە دەستپاکی و دادپەروەری ماونەتەوە، وەک عەلی و عومەر و گاندی و ماندێلا. گەرچی ئەم جۆرە نمونانە دەگمەن و ناوازەن و لە قاعیدە گشتییەکە لایانداوە، بەڵام مرۆڤایەتی ئازاردراو، تا ئێستاش دەستی بەو نمونە و سمبولانەوە گرتووە و هیوادارە قەدەر، شۆڕشگێڕی لەو جۆرەی بۆ بێنێتەدی.
ئیسلام سەرەتا وەک شۆڕشێک دژ بە ستەم و گەندەڵی بەرپابوو، ئیسلام لە کۆمەڵگای عەرەبیدا وەک بزوتنەوەیەکی چاکسازی دەرکەوت، بەشی هەرە زۆری شۆڕشگێڕە بەراییەکان لە خەڵکە چەوساوە و بێدەرەتانەکان بوون. بەڵام ئەوەی ئەم شۆڕشە لەسەرەتاوە لە پێناویدا بەرپابوو،

ئەوە نییە کە لە کۆتایدا پێیگەیشت. چونکە هەر هێندەی کاروباری موسڵمانەکان جێگیربوو، هەر هێندەی ئاوەدانی و وڵاتەکانی دیکەیان داگیرکرد، هەر هێندەی بوونە خاوەنی سەروەت و سامان و لێرە و لەوێ پارە و پولێکی زۆر رژا بەسەریاندا، وایانلێهات پێویستیان بەوە بوو کە خەڵکانێک دژیان شۆڕش بەرپابکەن، تاکو بیانهێننەوە سەر رێگای راست.

یەکێک لە رۆژهەڵاتناسەکان، سەبارەت بەو مەسەلەیە، دوای ئەوەی بە کۆشک و تەلارە گەورە و فراوانەکانی ئەمەوی و عەباسییەکانی زانی و دوای ئەوەی برِی ئەو تەخشان و پەخشانکردنەی سەروەت و سامانی وڵاتی لەلایەن سوڵتانەکانەوە بۆ دەرکەوت و گەندەڵییەکانی بۆ ئاشکرا بوو، رەخنە لە موسڵمانەکان دەگرێت و دەڵێ:

(موسڵمانەکان قەیسەرێکیان بە قەیسەرێکی دیکە و کیسرایەکیان بە کیسرایەکی دیکە گۆڕییەوە)، من لە قسەی ئەم رۆژهەڵاتناسەدا شتێکی وا نابینم تا وەڵامی بدەمەوە. بە دروستی حەقیقەتە تاڵەکە بریتییە لەوەی دەسەڵات و ستمگەری بەنی ئومەیە لە شام، زۆر زیاتر بوو لە دەسەڵات و ستەمگەری شازادەی قەیسەرەکان لە شام. هەروەها ستەمگەری بەنی عەباس، زۆر لەوە زیاتر بوو کە کیسرا لە عێراقدا ئەنجامیدا.

لەزەت و خۆشی دەسەڵات و حوکمڕانی، بەسە بۆ ئەوەی هەر شۆڕشگێڕێک و هەر شۆڕشێک، چەند گەورە و مەزنیش بێت، گەندەڵ بکات. ئەوە سروشتی ژیانە و کەس لێی دەربازنابێت، تەنها ژمارەیەکی هێجگار کەمی مرۆڤ نەبێت. ئاخر کێ هەیە سێ بە سێ دونیا تەڵاق بدات، دوای ئەوەی دەرگاکانی سەرکەوتن و نەمری بۆ دەکرێتەوە؟

وەک ئاماژەیەک بۆ ئەو دژایەتیەی کە حوکمڕانی و دەسەڵاتدارێتی، لەبەرامبەر بەهای شۆڕش و شۆڕشگێڕەکاندا دەیهێنێتە ئاراوە، ئەم چەند دێڕە لە دکتۆر «عەلی وەردی» وەردەگرم کە دەڵێ:



ماندێلا

(هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، دەیانەوێ بە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆ زەمی ئیسلام بکەن، ئەوان هەمیشە ئاماژە بۆ ئەو داڕزانە دەکەن کە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا، بە ماوەیەکی کەم دوای مردنی پێغەمبەرەکەیان، ڕوویدا. ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئەوە بەراورد دەکەن بە بارودۆخی مەسیحییەکان کە دوای مردنی مەسیح، بە پاکژی مایەوە. ئەوان بۆ نمونە باس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر دەکەن و لەبارەیانەوە دەڵێن: ئەو هاوەڵانە لەناوخۆیاندا تێکبەربوون، نەفرەتیان لەیەک دەکرد، لەگەڵ یەک کەوتنە شەڕکردن، هەندێکیان ئەوانی دیکەیان بە کافر دادەنا، وەلێ هاوەڵانی مەسیح شتی وایان نەکرد. بەڵام ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە لەوەدا نەزانبوون ئەگەر هاوەڵەکانی مەسیح، بەو شێوەیەی هاوەڵەکانی محەمەد، سەرکەوتنیان بەدەستبهێنایە و بەو خێراییە گەورەیە وڵاتانیان داگیربکردایە، ئەوا ئەوانیش تێکبەردەبون و لەگەڵ یەک شەڕیان دەکرد و نەفرەتیان لەیەکتر دەکرد، تەواو وەک ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر کردیان. ئەوە سروشتی مرۆڤە لە هەر ڕۆژگار و سەردەمێکدا بێت).

من پێموایە ئەو شیکردنەوەیەی «عەلی وەردی» تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە و جەختکردنەوەیەکیشە لەسەر ئەو دژایەتیانەی کە حوکمڕانی و دەسەڵاتداریێتی، لە بەها شۆڕشگێڕییەکاندا دەیهێننە ئاراوە. لە کاتێکدا مەسیح هیچی بۆ هاوەڵەکانی جێنەهێشت تەنها وشە نەبێت، بەڵام محەمەد دەوڵەت و وشەی بۆ هاوەڵەکانی بەجێهێشت، ئیدی هاوەڵەکانی مەسیح کەوتنە بڵاوکردنەوەی وشە، لەکاتێکدا هاوەڵانی محەمەد کەوتنە فراوانکردنی دەوڵەتەکەیان بۆ بڵاوکردنەوەی وشە. هاوەڵانی پێغەمبەر لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا، کاروباری دەوڵەت سەرقاڵی کردن و وشە-یان لەبیرچووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، شوێنکەوتوانی مەسیح، نەیانتوانی خۆیان لە هەمان چارەنوس بپارێزن، ئەگەرچی ئەوە، بە بەراورد بە موسڵمانەکان، دوای ماوەیەکی زۆر



گیڤارا

درێژتر رویدا.
بۆ نمونە هەر هێندەی رۆما بە مەزنی و دەسەڵاتە پان و فراوانەکەیەوە، چووە سەر ئاینی مەسیحی، مەسیحییەکان حوکمڕانی رۆمایان گرتە دەست، ئەمە لە کاتێکدا بوو پێشتر رۆما حوکمڕانی مەسیحییەکانی دەکرد، ئیدی لەو ساتەوە ململانێ و دژایەتییەکان سەریانهەڵدا و لە تەنیشت خاچەکەوە شمشێر و رمەکان بەرزکرانەوە و لە پێناو بڵاوکردنەوەی وشەی (خۆشەویستی و ئاشتی) چەندین جەنگ و شەڕ و شۆڕ بەرپابوون و خوێنێکی زۆری تێدا رژا.
جیاوازی نێوان شۆڕش و دەوڵەت، جیاوازی نێوان خەون و واقیعە، ئەو شۆڕشەی بە گرتنە دەستی دەسەڵات کۆتایدێت، وەک ئەو خۆشەویستییە وایە کە بە هاوسەرگیری کۆتایدێت. ئەو دوانە (شۆڕش و هاوسەرگیری)، بە کۆمەڵێ بەهاو پرنسیپ و دروشمی ئایدیالی دەستپێدەکەن کە دەکەونە دەرەوەی زەمەن و زۆر دوورن لە واقیعەوە. دوای سەرکەوتن، زۆر بەخێرایی مانگی هەنگوینی شۆڕش کۆتایدێت. هەر هێندەی ئەو پرنسیپ و بەهایانە دەکەونە سەر ئەرزی واقیع، ژماردنی سەعاتی راستەقینەی زەمەن دەستپێدەکات و چەندین کێشە و قەیران و ناکۆکی دێنەئاراوە، کە رستێک لە ئاڵۆزی و گۆڕانکارییەکان ئەو کێشە و قەیران و ناکۆکیانە دەسەپێنن. لەوانە کێشەی ئەمنی و ئابوری و ململانێ سیاسییەکانی ناوخۆ و دەرەوە...هتد. ئەو کێشانە شۆڕش لەسەر سەنگی مەحەک دادەنێت و زۆرجار تێیدا سەرکەوتونابێت و شکستدەهێنێت. چونکە شۆڕش ناچاردەبێت – کە ئێستا بووەتە دەوڵەت – دەستبەرداری بەهاکانی و پرنسیپەکانی ببێت کە لێیانەوە دەستپێکرد، تاکو ئەو دەستکەوتانە بپارێزێت کە بەدەستیهێناون. بە دڵنیاییەوە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی، دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک، شۆڕشگێڕی تازە و شۆڕشی نوێ سەرهەڵبدەنەوە، تا هەمان شت دووبارە بکەنەوە.
بە درێژایی تێپەڕبوونی سەدەکان، ئەوە سونەتی ژیان بووە، حوکمڕانان کۆنەپارێزەکانن و هیوادارن زەمەن بۆ هەتاهەتایە راوەستێت. شۆڕشگێڕان پێشکەوخوازەکانن و چالاکی و جموجوڵیان ناوەستێت و راناوەستن تا دەگەنە شوێن و بارودۆخە تازەکە. ئیتر رۆژەکان لەنێوان خەڵکیدا ئاوایە. تەنها شتێکی جێگیر لە ژیاندا، بریتییە لە گۆڕان.
لەبەرئەوە، شۆڕشی راستەقینە ئەگەر بیەوێت پارێزگاری لەو پرنسیپانە بکات کە لە پێناویدا بەرپابووە، دەبێ ئەوەی لا روونبێت کە شۆڕشەکەی تەنها قۆناغێکە و چەندین قۆناغی دیکەی بەدوادا دێت و لەسەریەتی ڕازیبێت بەوانەی کە تازە دێن، ئەم رازیبوونە بەرژەوەندی وڵات و پێشکەوتنی میللەتی تێدایە. هەر ئەمەشە کە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان پێی گەیشتوون کە لە ئێستادا لە نازونیعمەت و ژیانێکی خۆشدا دەژین، هۆکارەکەشی بۆ ئیستقراری هەمیشەی وڵات دەگەڕێتەوە کە لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات هاتووەتەئارا. ئەمە مانای ئەوە نییە ئەو کۆمەڵگایانە ئاگری شۆڕش تێیاندا کوژاوەتەوە، بگرە ئەو ئاگرە یەک رۆژ چییە، لە هیچ زەمەن و شوێنێکدا نەکوژاوەتەوە، ئەو ئاگرە وەک ئاگری خۆر وایە و ئەبەدییە. بەڵام شۆڕشەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان، لەنێو سندوقەکانی دەنگداندا بەرپادەبێت، نەک لەسەر شەقام و گۆڕەپانەکان. ئەو جۆرە شۆڕشە ئاشتیخوازانەیە، وڵات لەدانی ئەو باجە

گەورەیە دوور دەخاتەوە کە لە ئەنجامی شۆڕشی چەکدارییەوە دەبێت بیدات.

بەڵام تەواوی مێژوومان، لە سەردەمی خەلیفەکانەوە تا هاتنەئارای سیستمی کۆمارییە تازەکان، زۆر بە دەگمەن، باس لەوە دەکات کە حکومەتێ یان دەسەڵاتێک، بە ئاشتیانە دەسەڵاتی خۆی، رادەستی کەسە تازەکانی دوای خۆی کردبێت. حوکمڕانان و دەسەڵاتدارانی لای ئێمە ناڕۆن، تەنها بە کودەتا یان تیرۆر یان شۆڕشێکی خوێناوی نەبێت کە لە دوایدا لاشەی دەسەڵاتداران بە شەقامەکاندا رادەکێشرێن. یان لە باشترین حاڵەتدا دەسەڵاتدارەکە دەمرێت و کوڕەکەی جێگەی دەگرێتەوە.

ئێمە پێویستمان بە نەوەیەکی تازەیە لە شۆڕشگێڕان، دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکەیان، لە کەلتوری ئاڵوگۆڕی ئاشتیانەی دەسەڵات تێبگەن و بەرژەوەندی میللەت و وڵات لە پێش هەموو شتێکەوە دابنێن. شۆڕشگێڕی راستەقینە بۆیە شۆڕش دەکات تا دەسەڵات بگۆڕێت، نەک خۆی دەسەڵات بگرێتە دەست و حوکم بکات و بۆخۆی پاوانی بکات. ئێمە پێویستیمان بەو شۆڕشگێڕانەیە، دوای شۆڕش لەسەر قوربانیدان بەردەوام دەبن، نەک تەنها لەکاتی شۆڕشدا. ئێمە پێویستیمان بەو شۆڕشگێڕانەیە، وەک پاداشت و وەک ئیستیحقاقی شۆڕشگێڕی لە حوکمڕانی و دەسەڵات نەڕوانن. وا تەماشای بەڕێوەبردنی وڵات ناکەن ئەمە لەبەرامبەر ئەو ماندوبوونەیاندایە کە لە میانەی کاروانی تێکۆشانیان بەخشیویانە، یان پێیانوابێ گرتنەدەستی دەسەڵات، پاداشت و خەڵاتی کۆتایی کارەکەیە، واتە کۆتایی شۆڕش.

ئێمە پێویستمان بەو جۆرە شۆڕشگێڕانەیە کە لە سەردەستەی شۆڕشگێڕان (نیلسۆن ماندێلا) بچن، کە بەشێکی زۆر لە ساڵانی تەمەنی لە زیندان و گرتوخانەکاندا بەسەر برد، کاتێک دەسەڵاتی گرتەدەست، رازی نەبوو بۆ دوو جاری یەک لە دوای یەک حوکمڕانی وڵاتەکەی بکات، تەنها بە یەکجار حوکمڕانی رازیبوو، گەرچی رەزامەندییەکی میللی گەورەشی هەبوو تا بۆ جاری دووەم دەسەڵات بگرێتەوە دەست. ماندێلا تەواوی جیهانی دوچاری حەپەسان کرد، کاتێ وتی: (من ئەو پیاوە نیم کە ناکرێ دەستبەرداری نەبن)، ئەم مرۆڤە نمونەی ئەو تێکۆشەرەیە رازینەبوو بە وەرگرتنی چەند ساڵێکی دیکەی حوکمڕانی، قەرەبووی ساڵانی دوور درێژی ئەشکەنجەدانی لە زیندانەکاندا بکرێتەوە.

شۆڕشگێڕان، نمونەیەکی دیکەی جوانتر و مەزنتر بۆ ئێوە کە بە دەگمەن دووبارە دەبێتەوە، بریتییە لە «گیڤارا»، ئەو شۆڕشگێڕە نێونەتەوەییە کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکەی لە کوبا، رازی نەبوو دەسەڵات بگرێتە دەست و حوکمڕانی بکات و وتی: (کاتێ شۆڕشگێڕان لەسەر کورسییەکان دادەنیشن، هەم شۆڕش دەیبەستێ و هەم شۆڕشگێڕان سەرمایان دەبێت، من ناتوانم بژیم و خوێنی شۆڕش لە ناوەوەمدا بەستبێتی). بۆیە وازی لە پلەی وەزیری و روتبە سەربازییەکەی و سەرکردایەتی حیزب هێنا و رۆشت لە شوێنێکی دیکە بە دوای شۆڕشێکی دیکەدا دەگەڕا، تا ئەو کاتەی وەک شۆڕشگێڕێ لەپێناو ئازادیدا شەهید کرا و نەکەوتە ناو لەزەت و خۆشی حوکمڕانی و دەسەڵاتەوە.

سەرچاوە: الاوان، چوارشەمە، ١٢ ئەیلول، ٢٠١٢

# بەشی هەشتەم لە کتێبی گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکمدا

## پاڵەوان Heroes


سازدانی: نینار

لە سویدییەوە: هیوا قادر


**نینار**: من ئەمەوێت ئەو پرسیارەت لێ بکەم کە زۆرینەی جار خەڵکی لە منی ئەکەن: "ئایا چی لە باوکتەوە فێربوویت؟" پێموایە کاتی ئەوە هاتووە وەڵامی ئەم پرسیارەم هەر ئێستا و لێرەدا دەستبکەوێت. پێویستە وابکەم بۆ ئەوەی لەو شتانە تێبگەم کە بینیومن و لە تۆوە فێریان بووم، بۆئەوەی بتوانم سودیان لێ ببینم و وابکەم "بیانکەم بە هی خۆم". من شکم لەو هۆکارە هەیە کە بۆچی تا ئێستا نەمویستووە لە پوختەی هەموو ئەو شتانە تێبگەم کە لە تۆوە فێریان بووم، ئایە هی ئەوەیە کە ئەمەوێت تۆ بەردەوام شوێنێکی گەورەت لە ژیانی مندا هەبێت. پێویستبوونم بە تۆ پێویستییەکە بۆ ژیانی خۆم! چاوەڕێکردنم بۆ پەرچەکردارێک لە تۆوە وێنەیەکی ئەوتۆی

**ئەگەر هات و سیستەمێکی سیاسی کراوە و پێشکەوتوخواز ڕێ بەبیرکردنەوە و بیروڕای جیاواز بدات، هەروەها تێکستە دینییەکان بەپێی ڕۆژگار و ئەو کێشانەی کە خەڵکی هەیانە خوێندنەوەیان بۆ بکرێت، ئەوکات ئەتوانرێت خوێندنەوەی تازەش بۆ قورئان بکرێت**



ئەدۆنیس

وام ئەداتێ کە تۆ لە پێناوی مندا هەمیشە لێرەیت. بەڵام ئەگەر من دەستبکەم بە گەڵاڵەکردن و سودوەرگرتن لەو شتانەی کە تۆ فێرت کردووم مانای وایە قبوڵی ئەو دابڕانەی نێوانمان کردووە، هەروەها ئەبێت هەستیش بکەم کە ئیتر بەڕاستی گەورەبووم.

من لە زۆر زووەوە ڕقم لە کتێبە. لەماڵەکەمان لە بەیروت هەموو دیوارەکان بەڕەفەی پڕ لە کتێب داپۆشرابوون. کاتێک تۆ لە ماڵ ئەبوویت هەمیشە کتێبێکت بەدەستەوە بوو. کاتێکیش لە ماڵ نەئەبوویت کتێبەکان تۆیان بیرئەهێنامەوە کە تۆ لەوێ نیت. لەو کاتانەوە پەیوەندی من لەگەڵ کتێبدا گۆڕدرا. لە ڕۆژانی جەنگ و تۆپ باراندا ئەچوینە دالانەکە و خۆمان ئەدایە پاڵ ئەو ڕەفە پڕ لە کتێبانەی کە هەر لە ئەرزەکەوە تا سەقفەکە لەسەر یەک هەڵچنرابوون. لەو دالانـەدا من ئەزمونێکی نوێ ژیـام. کتێبی وا لەویادا هەبوون کە هەر لە تەمەنی هەشت ساڵیمەوە تا پانزە ساڵیم لە شوێنی خۆیاندا بەو بەرزاییانەوە لەبەرچاومدا مابوونەوە، هەر لە ساڵی ١٩٧٩ ـەوە تاکو ساڵی ١٩٨٦ لەویادا من هەمیشە ئەو کتێبانەم ئەبینی. کتێبەکان سەنگەرەکانی ئێمە بوون و لە تۆپەکان ئەیانپاراستین. من ڕۆژ و شەوم لەگەڵ ئەم کتێبانەدا ئەبردەسەر "دانی پیائەنێم کە ژیام"ی پاپلۆ نیرۆدا، "س/ز" ی ڕۆڵان پارت، "لیترامۆند و ساد"ی مۆریس بلانشۆت، "زەردەشـت وەهـای وت"ی نیچە، "عەرەبەکان"ی مەکسیم ڕۆدینسون، "کەمی کلتور"ی هانا ئەرێن، بێ لەو کتێبە شەش بەرگییە ئەستورەی "ڕۆبـێـرت" کـە سـاڵی ١٩٥٧ دەرچـووبـوون. دوای خوێندنەوەی ئەو کتێبانە پەیوەندی من لەگەڵ کتێبدا گۆڕا. لە دوژمنەوە بوون بە هاوڕێ و پاسەوانم. هەمیشە من ئەوانم خۆشئەوێت. ئەوان تەنها نەبوون بە دۆستێکی نزیکم بەڵکە بوون بە سەرچاوەیەکی بەسودیش بۆم؛ لە

نزیکی ئەوانەوە هەستم بە ئاسودەیی ئەکرد. ئا بەڕاست من ئەو کتێبانەم لەگەڵ خۆمدا هێنا بۆ ئێرە بۆ پاریس. ڕەنگە ڕۆژێک بیانخوێنمەوە، بەڵام ئێستا ئەوان بۆ من تەنها تەلیسمێکن.

**ئەدۆنیس**: ئایا تۆ پێتوایە بۆچی ئەو کتێبانە وازیان لە دوژمنایەتی تۆ هێنا و بوون بە دۆستت؟ ئایە تۆ بڵێی ئەو گۆڕانانە چی بووبن کە لە تۆدا دروستیان کردووە؟

**نینار**: ڕەنگە هۆی ئەوەبێت کە من هەرگیز نەمتوانیوە بەچاوێکی بێ مەترسی سەیریان بکەم. کتێبەکان خۆیان ئەمەیان کرد. من ئەو کاتە نەمئەتوانی لەگەڵیاندا بێ لایەن بم، تەنانەت نەم ئەتوانی بیشیان کەمەوە، تا وردە وردە دەستمکرد بە خوێندنەوەیان. من بەو شێوەیە ملکەچی دەسەڵاتیان بووم، بەڵام هێدی هێدی ئەوانیش دەستیان کرد بە پیشاندانی ڕووی باشی خۆیان بۆ من. بەبێدەنگ ژیانی ئەوان کارێکی کرد ناچاربووم لە کۆتایدا قبوڵیان بکەم.

**ئەدۆنیس**: تۆ نەتویستووە ئەو کتێبانە قبوڵبکەیت، بەڵام لە کۆتایدا تەنانەت بێ ئەوەی بیشیان خوێنیتەوە قبوڵت کردوون. تۆ کتێبەکانت وەک بیرۆکە قبوڵ بووە، بەڵام ناوەڕۆکەکانیانت نەویستووە. ئەی باشە بۆچی وەک دیدگایەک یان هەڵوێستێک نەتویستووە لە کتێبەکان تێبگەیت؟

نینار: لەبەرئەوەی ئەمە بۆ من دەستی نەئەدا. گەر منیش گەورەبوومایە ڕەنگبوو بمتوانیایە پەیوەندییەکی باشم لەگەڵیاندا هەبێت، بەڵام ئەو پەیوەندییەی من لەگەڵیان هەمبوو پەیوەندییەکی ناخۆش بوو. من قەت حەزم نەکردووە بچم بۆ قوتابخانە کەچی یەکەم بەریەکەوتنم لەوێ لەگەڵ ئەواندا بوو. بۆیە کتێب بۆ من بریتی بوو لە جۆرە ناچارییەک. بۆ ئەوەشی بتوانم فەرامۆشیان بکەم، بەچاوێک سەیرم ئەکردن کە ئەوانە هی ئەوە نین بکەونە کێبەرکێ لەگەڵ مندا، وەک بابەت پڕبوون لە زانیاری بەڵام ئەگەری ئەوەیان تیادابوو کە خەفە و چاوبەستم بکەن، سەربارى ئەوەی ئەوان هێزێکی ناحەز بوون، لە خەیاڵی خۆمدا ئەمگۆڕین بە شتێک لە شتەکانی ناو ماڵ، بەڵام شتێکی حەتاڵ و بەتاڵ. زۆر بە ئاسانی بوون بە شتێک، شتێک کە ئەبێت بخرێنە ڕەفەوە و هەڵگیرێن و ببن بە دیکۆر. هەستم ئەکرد مەجبورم شتانێک بدۆزمەوە تا بەو هۆیەوە بەها و مانایان کەمبکەمەوە و بتوانم وەک هەر کورسی و دۆڵابێک کە هەیە بیانبینم. ئەم کارەش منی دڵنیاتر ئەکردەوە. کتێبەکان وەک بابەت بونەوەرێکی زیندوو نەبوون بەڵکە تەنها شتێک بوون هەروەک مۆبیلەیەک. هەندێک جاریش هەستم ئەکرد ئەوان خوشک و برای منن، چونکە تۆ هەندێکیانت نووسیبوو - بەراست تۆ چەند کتێبت نووسیوە؟ سەرباری ئەوەی ئەوەندەی تۆ کاتت بەوان ئەدا ئەوەندەت کات بە من نەئەدا. بەوە ڕازیبووم کە شاپێکیان لێ دەم و ئەرکێکی تریان پێ بسپێرم؛ ناویشان لێبنێم "سەنگەرەکان".

**ئەدۆنیس**: کەواتە ئەتوانرێت بوترێت کتێبەکان بۆ تۆ بە سیمایەکی باوکانەوە گرێدرابوون؟

**نینار**: بەڵێ، پێموایە وابوو. کتێبەکان شتێکبوون من نەمتوانی تێیان بگەم، تەنانەت ئەوانیش نەیانتوانی ئەو کلیلانەم بدەنێ کە پێویستم پێیان بوو تا تێیان بگەم.

**ئەدۆنیس**: هەموو جارێک تۆ باوکت بینیوە کتێبێکی بەدەستەوە بووە، هەرچ کاتێکیش لە ماڵ نەبووە کتێبەکان بیریان هێناویتەتەوە کە لەوێ نییە، وایە؟ کتێب و باوکت پێکەوە گرێدراوبوون. ئایە ئەکرێت سوپاسی کتێبەکان بکەم وایان لێکردیت لە کۆتایدا باوکت لە بەیروت قبوڵبکەیت؟

**نینار**: وایە، چونکە بەجۆرێک لە جۆرەکان کتێب منی پاراست.

**ئەدۆنیس**: کتێبەکان وایانکرد لە کۆتایدا تۆ قبوڵیان بکەیت؟

**نینار**: ئەوان جیاواز لەو ڕۆڵەی سەرەتا کە من پێمدابوون ڕۆڵێکی تریان بینی. پێموایە ئەوان هەموو ڕۆژێک زیاتر و زیاتر منیان ئارامتر ئەکردەوە. کە بەلای ڕەفەکاندا ئەڕۆیشتم و ئەمبینی کتێبەکان وەک هەمیشە لە جێگای

خۆیاندان ئارام ئەبوومەوە، ناڕەحەتیش ئەبووم گەر کەسێک بهاتایە و جێگاکانی بگۆڕینایە.

**ئەدۆنیس**: هەست ئەکرێت شتێک لە ناو تۆدا شێوابێ؟

**نینار**: هەتا کتێبەکان لە شوێنەکانی خۆیاندا وەک خۆیان ئەمانەوە هەستم بە دڵنیایی ئەکرد، نەشم ئەویست کەسێک بێت و جێگۆڕکێیان پێ بکات. ئەبوو لەهەمان ئەو جێگایانەدا بوونایە کە تیایاندا دانرابوون. ئەوە بۆ من زۆر گرنگ بوو بۆیە کاتێک بەیروتمان بەجێهێشت هەندێک لەو کتێبانەم لەگەڵ خۆم هێنا بۆ ئێرە بۆ پاریس. ئەو کتێبانەش زۆرینەی ئەوانە بوون کە ناونیشانەکانیانم لەبەر بوون.

**ئەدۆنیس**: ئەتوانرێت بوترێت کتێب و ژیان هەردووکیان پێکەوە بووبوون بەیەک بۆ تۆ، دواتریش کتێبەکان بۆ تۆ بوون بە بەشێکی زۆر گرنگی ژیانت؟

**نینار**: بەڵێ بەراستی ئەتوانیت وابڵێیت.

**ئەدۆنیس**: هەمان هەست ئەمڕۆش هەتە؟

**نینار**: کە منداڵبووم ڕقم لە کتێب بوو. تەنانەت لەلای هاوپۆلەکانی قوتابخانەم هەستم بە شەرم ئەکرد کە ئێمە ئەوەندە کتێبمان لە ماڵەوە هەیە. کاتێک هاورێکانم داوەت ئەکرد بۆ ماڵەوە حەزم ئەکرد کاتێک دێینە ماڵەوە کتێبەکان و تابلۆکانی دیوارەکان هیچیان نەمێنن، چونکە لە ماڵی هاوپۆلەکانم هیچ کتێبێک نەبوو، بەهەرحاڵێک هێندەی ئێمە کتێبیان لە ماڵەوە نەبوو. لەچاوی ئەواندا من کەسێکی جیاوازبووم ئەمەش هەستی خۆبەکەمزانی تیادا دروست ئەکردم، بەچەشنێک ئەمە هێندە ئەیخرۆشاندم وای لێ ئەکردم جیاوازبم. بەڵام ئێستا بە هیچ شێوەیەک وانیم. ئێستا کتێب ئەکڕم و لە ڕەفەی کتێبخانەکەمدا ڕیزیان ئەکەم. تا ئێستاش نایان خوێنمەوە، بەڵام پێویستم پێیانە تا لەلام بن و بیانبینم. کاتێک بەلای کتێبخانەکەمدا ئەڕۆم ناونیشانی کتێبەکان ئەخوێنمەوە و هەستێک لە ئارامیم پێ ئەبەخشێت. ئایە ئەمە جێی پێکەنین نییە؟ من ئێستا حورمەتێکی گەورەی کتێب ئەگرم، بەڵام پێموایە پەیوەندی من بەوانەوە تا ئێستاش پەیوەندییەکی زەحمەتە. من ناڵێم هاوشانی ئەوانم، چونکە تائێستاش ئاسان نییە بۆ من کتێبێک لە ڕەفەیەک دەربکەم و یەکسەر دەستبکەم بە خوێندنەوەی. بەڵام زۆر لەخۆم ئەکەم ئەو جۆرە کتێبانە بخوێنمەوە کە پەیوەندیان بەکاری منەوە هەیە وەک هونەرمەندێک، دەنا لەوە زیاتر ناتوانم. کاتێک کتێبێک ئەکەمەوە و ئەمەوێت دەست بکەم بە خوێندنەوەی هەست ئەکەم ناتوانم تێی بگەم. ئەم پەیوەندییەی من بە کتێبەوە تا ڕادەیەک پەیوەندییەکی تۆقێنەرانەیە چونکە هەر لەسەرەتاوە بۆ من بەکەڵک نەئەهات. کتێب کارم تێئەکات. من پێشتر کتێبێکم ئەکردەوە و تەنها چەند کۆپلەیەکی یان بەشێکیم ئەخوێندەوە کە پەیوەندی بەو کارەی خۆمەوە هەبوو، قەناعەتم بەخۆشم ئەکرد کە هەقی خۆمە تەنها ئەو بەشەی بخوێنمەوە کە ئەمەوێت. خۆ لەو کاتەدا ئەگەر بهاتایە هەموو کتێبەکەشم بخوێندایەتەوە ڕەنگبوو هیچی لێ تێنەگەیشتمایە.

**ئەدۆنیس**: هەموو ئەو شتانەی دەوروبەرت ئەو کاتانە زیاتر فشاریان بۆ هێناویت کاتێک ویستوتە هاوڕێکانت داوەتبکەیت بۆ ماڵەوە، تەریقیش بویتەتەوە لەبەردەمیاندا لەبەرئەوەی لە ماڵەکەتدا کتێبی زۆر هەبووە، لەوەش زیاتر فشارت بۆ خۆت هێناوە بۆ ئەوەی ئەوان ئەو دنیایەی تۆ قبوڵبکەن بۆ ئەوەی ببینن تۆ لە چ دنیایەکەوە هاتوویت و لە چ دنیایەکدا ئەژیت.

**نینار**: لەڕاستیدا من ئەمویست ئەوان قبوڵی ماڵەکەم بکەن، بەڵام پێشم وانەبوو ئەم ماڵە ئەوە پیشان بدات کە بەتەواوەتی من کێم.

**ئەدۆنیس**: بەڵام تۆ خۆت وتت کە لە منداڵییەکی هەر زۆر زووەوە حەزت لە کتێب بووە. بەهەرحاڵێک من لە تۆ ئەپرسم کە بۆچی تەواو بەرەو کلتوری وێنە، ڤیدیۆ، فلم، فۆتۆ، ئەنستەلەیشن و نمایشت چوویت؟ تۆ ئەم گۆڕانە چۆن ئەبینیت ـ کە ئاوا کلتوری وێنە بەو ڕادە زۆرە گیرۆدەی کردیت.

**نینار**: ئاخر ناچاربووم من شوناسی خۆم دروست بکەم،

جێگەیەک بۆ خۆم بدۆزمەوە، دنیایەک دروستبکەم کە هی خۆم بێت و جیاوازبێت لە هی تۆ. بۆیە من شەیدای وێنە بووم، ڕەنگە هۆی ئەوەش بێت من لە زەمەنێکدا ئەژیم کە وێنە لە بەرزترین پلە و چەقدایە. بێ لەوەش من پێموایە وێنە ئامرازیکە زیاتر گونجاو و ئاسانترە بۆ تێگەیشتن.

**ئەدۆنیس**: تۆ بە ئاگاییەوە کتێبت بەجێهیشت، ڕەنگە هۆی ئەوەش بێت بەجۆرێک لە جۆرەکان وێنەت خستبێتە بری وشە؟

**نینار**: من زۆر حەزم لە وشە نییە. هەتا دواتریش کە هاتم بۆ فەرەنسا گوێم نەئەدا بەوەرگرتنی کۆرسی زمان. بەڵام کاتێک چوومە قوتابخانە نمرەی زۆر باشم لە فەرەنسی و ئینگلیزی و عەرەبیدا هێنا ـ کەچی لە ماتماتیکدا زۆر خراپ بووم. بەڵام ئێستا زۆر سەیرە حەزم بە بەکارهێنانی ژمارەیە لە کارە هونەرییەکانمدا، بۆ نموونە ئەو ئەنستەلەیشنەی ساڵی ٢٠٠٣ کە ناوم لێنا ئەلگوریسم. ژمارەیەکی زۆری تیایە و تێگەیشتنێکی وەهـات لـەلا دروسـت ئەکات هەستبکەیت خەریکی حەلکردنی هاوکێشەیەکیت. بەڵام لەبەرئەوەی هاتنم بۆ فەرەنسا دەستپێکردنەوە بوو لە سفرەوە، دەرفەتێک بوو بۆ سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەم، من ئەوەم قۆستەوە و یەکسەر بەرەو ئەو شتە چووم کە حەزم لێی بوو، ئەویش هونەر بوو بە گشتی.

من چیتر گوێ نادەم بەوەی زیاتر هەوڵی پێشخستنی زمانەکەم بدەم، تاقەتی ئەوەم نەماوە. ئەو زانیارییە سەرەتاییەشی هەمە نوقسانی زۆرە. هەموو ئەو شیعرە نایابانەشی کە تۆ نووسیوتە و شیعری ئەدەبیاتی دنیا و بەتایبەتیش شیعری عەرەبی، وایان لێ کردم هۆشیاربم بەوەی کە من دۆستایەتییەکی هێندە گەرموگوڕم لەگەڵ زماندا نییە تا هەوڵی پیشاندانی بدەم.

خەم بۆ زمان و بۆ ئەو قەناعەتەم ئەخۆم کە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئەمتوانی ببمە کەسێکی شارەزا لە زمانی عەرەبیدا یان لە هەر زمانێکی تردا. من ئێستا ئەزانم کە کاری هەرە گرنگی من زمان نییە. ئەمەشم قبوڵکردووە ئەگەرچی زۆر قورسە! ئەوە ڕاستە کە ئەڵێن منداڵ شۆڕش بەسەر دایک و باوکیدا ئەکات و هەمیشە ئەیەوێت دنیای ئەوان بخاتە ژێر پرسیارەوە، بەڵام پێموایە منداڵ لەناخەوە ئەیەوێت و حەزئەکات وەک دایک و باوکی بکات.

تەنها شتێک کە توانیومە سەرکەوتووبم تیایدا و لە کارەکانی خۆمدا بەکاری بهێنم ئەو شتانە بوون کە تۆ پێت بەخشیوم، مەبەستم توانای تۆیە لە عەرەبیدا و ئەو شێوازەی تۆ لەکارکردنت و خۆتەرخانکردنتا بۆ زمان ـ دواتر زیاتر قسە لەسەر توانای نووسینی شیعر و گێڕانەوەی مێژوو ئەکەم لەلای تۆ. بەڵام من توانای خۆم جیاواز لە توانای تۆ بەکارئەهێنم. من سود لە وێنە و نمایشت و ئەنستەلەیشن وەرئەگرم. هەندێک جار تێکست بەکارئەهێنم، بۆ نموونە تێکستی ئیرۆتیکی عەرەبی ساڵانی ١٠٠٠کان، ١٢٠٠کان، ١٤٠٠کان. تەنانەت پێموایە کە لە دواڕۆژدا تێکستیش بەکاربهێنم. ئەم سەرکیشییەی کە من ئێستا لەگەڵ تۆدا ئەیکەم و تەمەنائەکەم ببێت بە کتێبێک، نیشانەیەکە بۆ ئەو جۆرە کارکردنە. من کەرەستەم پێیە بۆ ئەم کارە، بەڵام پێموایە کە پێویست بکات پێکەوە دەستپێبکەین. گرنگترین شتێکیش کات بەخشینە بەم پرۆژەیە و دانیشتنە لە بەرامبەر یەکتریدا ئەمەش وائەکات یەکتری باشتر بناسین. من زمانی فەرەنسیم هەڵبژاردووە بۆ ئەم پرۆژەیە، چونکە من لە فەرەنسیدا ئازادییەکی گەورەم هەیە. لە زمانی عەرەبیدا ئەوە تۆیت بڕیارئەدەیت! من تەواو خەنی ئەبم گەربێت و بتوانم بگەمە مەبەستی وشە ترسناکەکەنم. من لەکارەکانمدا ئەتوانم ڕستەی بچووک لە وشە بەکاربهێنم، بەڵام پێویستە لە ڕێی پیشاندانی وێنە و جەستەوەبێت لە فلمی ڤیدیۆ و نمایشت و ئەنستەلەیشن و تەن و سەما و ئەم جۆرە شتانەوە. کاتێک کارەکەش پەیوەندی بەو حەز و بیرۆکانەوە هەیە کە ئەتوانم تیایاندا ئازادبم ئەوا ئەو ئامرازانە هەڵئەبژێرم کە زیاتر لەگەڵ خۆمدا گونجاوە.

**ئەدۆنیس**: بەڵام ئەو پەیوەندییە دوو فاقییەی تۆ هەتە

لەگەڵ زمان و وشەدا، پەیوەندی بەوەوە هەیە کە تۆ بەباشی فێرنەبوویت لە قوتابخانە یاخود هۆی ئەوەیە کە تۆ هەڵگری دوو زمان بوویت؟

**نینار**: ئەگەر بمەوێت وەڵامێکی بە پەلەت بدەمەوە هەڵگری دوو زمانی کارەکەی بۆ من ئاسان نەکردووە. وەک ئەوەی ئەیبینم ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من هەر لە منداڵییەوە بە دوو زمان قسەکردنم گەیاندوومی بە دوو ئەنجام: یەکێکیان ئەوەیە کە لە هەردوو زمانەکەدا لە ئاستێکی مامناوەندیدابم، ئەوی تریشتان ئەوەیە کە ئەبێت من هەمیشە یەکێکیان لەسەر حسابی ئەوی تریان هەڵبژێرم. بەڵام دوای ئەوەی بیرم لەمە کردەوە پێموایە کە عەرەبی جوانترین زمانی دنیایە. هـەردوو زمانی کلاسیکی و نوێی شیعریی عەرەبی زمانێکی فرە شیرینە. بەڵام من خوێندنێکی خراپی عەرەبیم خوێندووە. تەنها شتێک لە قوتابخانەدا فێری بووین ڕێزمانێکی ڕەق و تەق بووە. بەڵام لە فەرەنسیدا ئەدەبیاتمان خوێند، لێ ئەویش لەڕووی تەلەفوز و تۆنی ڕۆژنامەوانییەوە. بۆیە فەرەنسی بۆ من زۆر زیندووتر بوو زیاتریش هەستم بەوە ئەکرد لەگەڵ زەمەندا ئەڕۆم. بەڵام ئینگلیزی لە هەموویان زیاتر چونکە هەموو ئەو کەسانەی نمونەی بەرزبوون بۆ من یان بەریتانی بوون یاخود ئەمەریکی. کاتێکیش ئینسان باوک و دایکێکی وەکو ئێوەی هەبێت، کە لە زمانی عەرەبیدا ناتوانیت بۆڕیان بەیتەوە و تابێت زمانیان جوانتر و جوانتر ئەبێت، ئەوا زەحمەتە بتوانیت فریا بکەویت. من پێموایە بەهیچ جۆرێک شانسێکی ئەوتۆم نەهاتۆتە بەردەم تا بتوانم ئاسان مامەڵە لەگەڵ عەرەبی و ئەو زانیاریانەیدا بکەم. ئێستاش لێرەدا دوور لە ماڵ لەگەڵ تۆ و هاورێکانمدا تەنها هەر بە فەرەنسی قسەئەکەم، تەنانەت لەگەڵ هاورێ عەرەبەکانیشمدا، لەبەرئەوەی فەرەنسی بۆ من ئاسانترە. بەڵام سەرباری هەموو ئەم شتانەش حەزم لە قسەکردن بووە بە دوو زمان چونکە من خۆم لە حاڵ و بارێکی بە دوو زمان قسەکردندام. بەدوو زمان قسەکردن پەیوەندی بە شوناسی منەوە هەیە. من خۆم بە هەموو شێوەیەک بە عەرەب و لوبنانی و فەرەنسی ئەزانم. لە ناو زمانی فەرەنسی و عەرەبیدا کارئەکەم. من لە ناو دوو زمانی تێکەڵ و پێکەڵی "ناڕەسەن"دا دێم و ئەچم وەک "کریۆلیسک"ێکی نەدیوبدیی. (کریۆلیسک بەو خەڵک و ئەتنییە بچوکانەیان وتووە کە وەک خەڵکانی ئەوروپی خۆیان گۆڕیوە و هەڵسوکەوتیان کردووە. هـ.ق). ئەو زمانەی کە من دەسەڵاتم زۆر باش بەسەریدا ئەشکێت ئەو زمانە تێکەڵوپێکەڵەیە. چونکە یاسایەکی داسەپاوی ئەوتۆی نییە کە هەر ڕۆژە و شتێکی نوێی تیابدۆزمەوە و ئەوانی تر فەرامۆش بکەم. من زۆر حەز ئەکەم فلمێک دروست بکەم دیالۆگەکانی تێکەڵەیەک بێت لە فەرنسی ـ لوبنانی ـ ئینگلیزی وەک ئەو زمانەی لە لوبنان و هەموو وڵاتانی عەرەبیدا گوێت لێی ئەبێت. من دەستپێشکەریم کردووە و هەوڵێکی بچووکم لەو جۆرە بە فلمێکی ڤیدیۆیی چل دەقەیی داوە و ناوم ناوە "عبادەت". من لە دیمەنێکی کراوەدا گەڕاومەتەوە بۆ تێکستێکی عبادەی جان لوک گودارتی دەرهێنەری فەرەنسی: کە بەو جەستە جوان و عاشقانەی برجید باردۆ و میشایل پیکۆلیدا هەڵیداوە. من ڕێمداوە ئەمە بە زمانێکی نەدیوبدیانە و تێکەڵوپێکەڵی نێوان فەرنسی و دیالێکتی لوبنانی بوترێت. ئەمە زیاتر جەستە لای ئەو فەرەنسیانە لەت لەت ئەکات کە تەنها لە "بەشێکی جەستە" تێ ئەگات، هەروەها لای ئەو بینەرە عەرەبانەش کە لە بەشەکەی تری جەستە تێ ئەگەن.

ئەم پارچەیە بەشێکی کەمە لە بەشی دە هەمی کتێبی گفتوگۆیەک لەگەڵ ئەدۆنیسی باوکم.

**سەرچاوە:**

NINAR ESBER
SAMTAL MED MIN FAR , ADONIS
Alhambera 2007

# ڕووناكیەك وەك ئاو

نوسینی: گابرێل گارسیا ماركیز
و. لە عەرەبییەوە: دڵنیا عەبدوڵڵا

لە جەژنی لەدایک بووندا، دیسانەوە دوو منداڵەکە، داوای بەلەمی سەوڵ لێدانیان کردەوە.
باوکەکە وتی: باشە، کە گەڕاینەوە بۆ کاتارخینا دەیکڕین.
بەڵام توتو کە تەمەنی نۆ ساڵ و جوێل کە تەمەنی شەش ساڵ بوو، پێکەوە سورتر بوون لەوەی باوکیان باوەڕی پێی بوو. بۆیە هەردوکیان پێکەوە وتیان:
– نەخێر، ئێمە ئێستا پێویستمان پێیەتی و هەر لێرەیش .
دایکەکە وتی: یەکەمینیان ئاو نییە بۆ دەریاوانی تەنها ئەو ئاوە نەبێت  کە لە دوشەکەوە دێتە خوارەوە.
ژنەکە و مێردەکە ڕاستیان دەکرد، لە ماڵەکەیاندا لە کاتارخینا دی ئەندیاس، هەیوانێک هەیە، ڕاڕەوێکی تێدایە کە دەڕوانێت بەسەر کەنداوەکەدا , هەروەها شوێنێکیشی لێیە بەشی دوو یەختی گەورە دەکات , بەڵام لێرە لە مەدرید خزاونەتە شوقەیەکەوە و تێیدا دەژین کە لە قاتی پێنجەمی بینای ژمارە (٤٧)ە لە شەقامی باسیودی لاکاستینا.
بەڵام لە کۆتاییدا هەردووکیان، پیاوەکە یان ژنەکە، نەیانتوانی ئەو داواکاریە ڕەت بکەنەوە، چونکە پەیمانی کڕینی بەلەمێک و دووربینێک و قیبلەنمایەکیان بە دوو منداڵەکە دابوو، ئەگەر لە پۆلی سێیەمی سەرەتاییدا خەڵاتی (تاجە گوڵینە) بەدەست بێنن، لە ڕاستیدا دوو منداڵەکە ئەو خەڵاتەیان بەدەستهێنابوو. بەمشێوەیە باوکەکە، بێ ئەوەی بە ژنەکەی بڵێ، هەمو شتێکی کڕی، ژنەکەی بە توندی ناڕازیبوو لەوەی لە پێناو کڕینی یاری، خۆیان قەرزاربار بکەن. بەڵام باوکەکە بەلەمێکی ئەلەمەنیۆمی جوانی بۆ کڕین، بەلەمەکە لەو شوێنەی دەکەوتە ناو ئاوەکەوە، بەهێڵێکی ئاڵتونی ڕازێنرابووەوە، باوکەکە لەکاتی نانی



گابریێل گارسیا مارکیز

نیوەڕۆدا نهێنیەکەی ئاشکرا کرد و وتی:

- بەلەمەکە لە گەراجەکەیە.

کێشەکە لەوەدایە کە ناتوانرێت بەلەمەکە بە ئاسانسۆر یان بە پلیکانەکاندا سەربخرێت، لە گەراجەکەشدا شوێنی پێویست بۆ دانانی بەلەمەکە نەبوو. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دوو منداڵەکە، ڕۆژی شەممەی داهاتوو، هاوڕێکانیان بانگ کرد بۆ ئەوەی بەلەمەکە لە پلیکانەکانەوە سەربخەن و بیبەنە ژوری گەنجینەکەوە، لەمەشدا سەرکەوتوبوون.

باوکەکە پێی وتن:

- پیرۆزتانبێت... باشە ئێستا چی ترتان دەوێ؟

منداڵەکان وتیان: لە ئێستادا هیچی ترمان ناوێت، ئەوەی ویستمان بردنی بەلەمەکە بوو بۆ ژوورەکە، ئەوەتا لێرەیە.

ڕۆژی چوارشەممە، شەوەکەی، دایک و باوکەکە، وەک هەموو چوارشەممەکانی دیکە، چوون بۆ سینەما، بەڵام دوو منداڵەکە، کە خاوەن و گەورەی ماڵەکە بوون، دەرگا و پەنجەرەکانیان داخست، گڵۆپێکی داگیرساوی ساڵۆنەکەیان شکاند، شەپۆلێک ڕووناکی ئاڵتونی و سارد لە گڵۆپە شکاوەکەوە دەرپەڕی، وازیان لێهێنا بڕژێت تا بەرزیەکەی گەیشتە چوار بست، ئینجا شەپۆلی ڕووناکیەکەیان کوژاندەوە، بەلەمەکەیان هێنایە دەرەوە و بەشادومانیەوە بەناو دورگەکانی ماڵەکەدا لێیان خوڕی.

ئەم سەرکێشیە خورافیە لە ئاکامی هەڵەشەیی منەوە بوو، کاتێک لە کۆڕێکدا دەربارەی شیعری کەرەسەکانی ناو ماڵ بەشداریم کرد، توتو پرسیاری لێکردم چۆن هەر کە پەنجەت بە پلاکەکەدا نا، گڵۆپەکە دادەگیرسێت، من بە خێرایی وەڵامم دایەوە و بیرم لە مەسەلەکە نەکردەوە و وتم:

- ڕووناکی وەک ئاو وایە: هەر هێندەی یەکێکمان بەلووعەکەی کردەوە، خوڕە دەکات .

بەمشێوەیە هەموو شەوێکی چوار شەممان،

دەریاوانیان دەکرد، فێری بەکارهێنانی دووربین و قیبلەنما بوون، کاتێک دایک و باوکەکە لەسینەما دەگەڕانەوە، هەردوو منداڵەکەیان دەبینی وەک دوو فریشتە لەسەر زەویەکە نوستوون. پاش چەند مانگێک، دوو منداڵەکە دەیانویست شتی زیاتر لەوە ئەنجامبدەن و عەوداڵی شتیتربوون. بۆیە داوای کەلوپەلی ڕاوکردنی ژێر ئاویان کرد، داوای کۆمەڵێک کەلوپەلی تەواویان کرد، لەوانە دەمامک، پەڕەکەی پێ، بوتڵی ئۆکسجین، تفەنگی هەوای پەستێنراو.

باوکەکە وتی: کارێکی خراپە، لەژووری گەنجینەدا بەلەمێکی سەوڵتان هەبێت و بۆ هیچ شتێک بەکارنەیەت. بەڵام لەوە خراپتر ئەوەیە داوای کەرەسەی نقووم بوون بکەن.

جوێل وتی : ئەی ئەگەر لە وەرزی یەکەمی ئەم ساڵدا، خەڵاتی تاجە گوڵینەمان بەدەست هێنا؟

دایکەکە بە ترسەوە وتی :نەخێر- نەخێر- نا بۆ هیچ شتێکی تر.

باوکەکە سەرزەنشتی ژنەکەی کرد لەبەرئەوەی بە توندی وەڵامی دانەوە و نەرم و نیان نەبوو.

دایکەکە وتی: کێشە لەوەدایە ئەم دوو کوڕە لەبەر جێبەجێکردنی ئەرکەکانیان تاقە نینۆک بڕێک بەدەست ناهێنن، کەچی لەپێناوی ئارەزووەکانیاندا ئامادەن کورسیی مامۆستایەتی بەدەست بێنن .

لە کۆتاییدا دایک و باوکەکە نە وتیان (بەڵێ) نە وتیان (نەخێر). بەڵام توتو و جوێل کە ڕیزبەندییان لە ساڵانی پێشودا لە دواوە بوو، لە مانگی ئابدا دوو خەڵاتی گارۆنی ئاڵتونی و سوپاسی ئاشکرای بەڕێوبەریان بەدەستهێنا.

لەو ئێوارەیەدا بێئەوەی داوا بکەن، لەژووری نووستنەکەیاندا کەل و پەلی ژێر ئاوکەوتنیان لە پاکەتە تایبەتیەکەیدا بینی. ڕۆژی چوار شەممەی دوایی، لە کاتێکدا دایک و باوکەکە سەیری فیلمی (دواهەمیین تانگۆ لە پاریس) دەکرد، دوو منداڵەکە شوقەکەیان بە بەرزایی دوو قۆڵ پڕ کرد لە ئاو، وەک دوو قرشی جوان، لەژێر کەل و پەل و ڕاخەرەکەدا نوقمبوون.

لەقوڵایی ڕووناکیەکەوە، ئەو شتانەیان دەرهێنا کە ماوەی چەند ساڵێکە لە تاریکیدا ونیان کردبوو. لەکاتی بەخشینی خەڵاتەکانی کۆتاییدا، دوو براکە لە قوتابخانە وەک دوو قوتابی نموونەیی هەڵبژێردران، بڕوانامەی (نایاب) یان پێشکەش کرا. ئەم جارە داوای هیچیان نەکرد، چونکە دایک و باوکەکە پرسیاریان کرد چیان دەوێت، ئەوان ئەوەندە ژیر بوون بە ڕادەیەک کە تەنها ئارەزووی سازدانی ئاهەنگێکیان کرد لە ماڵدا بۆ ڕێزلێنان لە هاوڕێیانی ناو پۆلەکەیان.

باوکەکە کاتێک بەتەنیا قسەی لەگەڵ ژنەکەیدا دەکرد، گەشابوەوە و دڵخۆشبوو:

- ئەوە بەڵگەی پێگەیشتنیانە.

دایکەکە وتی:

- یاخوا وابێت.

لە ڕۆژی چوارشەممەی دواییدا، لەکاتێکدا باوک و دایکەکە سەیری فیلمی (جەنگی جەزائیر) یان دەکرد، ئەو خەڵکەی بە شەقامی کاستیانادا تێپەڕ دەبوون، تاڤگەیەکی ڕووناکییان بینی، لە تەلارێکی کۆنەوە کە لەنێو درەختەکاندا ونبوبوو، دەڕژایە خوارەوە. ڕووناکیەکە لە بەلەکۆنەکانەوە بە لێشاو بە ڕووکاری بیناکەدا دەهاتە خوارەوە، بەشەقامە پانەکەدا وەک لافاوێکی ئاڵتونی دەڕۆیشت و تاکو

گوادارما شارەکەی ڕووناک کردبووەوە.
پیاوانی ئاگر کوژێنەوە کە بەپەلە بانگ کرابوون، دەرگای نهۆمی پێنجەمیان شکاند.
بینییان ماڵەکە تا بنمیچەکەی نوقمی ڕووناکی بووە، ئەو قەنەفە و کورسیانەی بە چەرم تەغلیفکرابوون، لە سالۆنەکەدا و لەنێو شووشەی ساردیەکان و ئەو پیانۆیەی کە چەرچەفەکەی لە مانیلا دروستکرابوو، بە چەند ئاستێکی جیاواز جیاواز، سەر ئاو کەوتبوون. پیانۆکە وەک ماسی مانتاریای ئاڵتونی لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا دەهاتودەچوو، کەلوپەلەکانی ناوماڵ لە لوتکەی ڕۆمانسیەتدا بوون، بە باڵە تایبەتەکانیان بە ئاسمانی چێشتخانەکەدا دەفڕین، کەلوپەلەکانی تیمی مۆسیقای جەنگ کە دوو منداڵەکە بۆ سەما کردن بەکاریان دەهێنان، بە شێوەیەکی ناسروشتی لەنێو ئەو ماسیە ڕەنگاوڕەنگانەدا سەرئاو کەوتبوون کە لەو حەوزە ڕزگاریان ببوو کە دایکیان تیایدا بەندی کردبوون. لەو زۆنگاوە فراوان و ڕۆشنەدا تەنیا ئەو ماسیە ڕەنگاوڕەنگانە بە زیندوێتی و شادیەوە سەرئاو کەوتبوون. لە حەمامەکەدا فڵچەکانی ددانی هەمووان و لاستیکی ڕێگری لە سک پڕی کە بابە بەکاریدەهێنا، قوتوی کرێم و تاقمی ددانە دەستکردەکەی دایە سەرئاو کەوتبوون. تەلەفزیۆنی سالۆنەکە بەداگیرساوی و بەلاری سەرئاوکەوتبوو، دوا ئەڵقەی لە فیلمی (نیوەی شەو) پەخش دەکرد کە لە منداڵان قەدەغە کرابوو.
لە کۆتایی ڕاڕەوەکەدا، دوو منداڵەکە لە نێو دوو ئاودا، سەر ئاو کەوتبوون. توتو لەپێشەوەی بەلەمەکەدا دانیشتبوو، دوو سەوڵەکەی گرتبوو، دەمامکی لە دەموچاودا بوو، بەدوای کەناری بەندەرەکەدا دەگەڕا، هەتا ئەو هەوایەی ناو بوتڵەکە ڕێی پێدەدا هەناسە بدات.
جوێل لە کۆتایی بەلەمەکەدا هێشتا بە دووربینەکە، بە دوای ئەستێرەی جەمسەردا دەگەڕا.
هاوڕێیانی پۆلەکەی کە ژمارەیان ۳۷ قوتابی بوو، لەگشت بەشەکانی ماڵەکەدا سەرئاوکەوتبوون، بە نەمری مابوونەوە لە ساتی میز کردنیان لە ئینجانەی گرانیۆمدا و چڕینی سرودی قوتابخانەیان بەو وشانەی کە گاڵتە بە بەڕێوبەر دەکەن یان خواردنەوەی جامێک براندی بە دزیەوە لە شووشەی بابەوە. چونکە ئەوان لە یەک کاتدا زۆر گڵۆپیان هەڵکردبوو وای لە ماڵەکە کردبوو سەرئاو بکەوێت و گشت قوتابیەکان نوقم بوون. قوتابیەکانی پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە قوتابخانەی سان خولیان لە نهۆمی پێنجەمی بینای (٤٧) لە باسیودی کاستیانا لە مەدرید لە ئیسپانیا، ئەو شارەی دوورە لە هاوینە گڕسەندوەکان و با بەستەڵەکیەکان کە نە دەریا و نە ڕووباری تێدایە و دانیشتوانەکەشی هەرگیز ڕۆژێک لە ڕۆژان شارەزا نەبوون لە هونەری دەریاوانی لە ڕووناکیدا.

وەرگێرانی بۆ عەرەبی :سەلاح عەلمانی
**سەرچاوە:** منتدى الروايات والمسرحيات العالميه.

# ژاکووی چەوساوە

نووسینی: یوجین لی ڕۆی
و. لە فەرەنسییەوە: میران محەمەد

ساڵی ١٨١٥یە و دایک و باوکم جوتیارن لە (کۆمبێنێگغ) کە موڵکی (تۆنساکە) , لە (پێغیگۆغ) کە یەکێکە لە هەرێمەکانی فەڕەنسا , جەژنی لەدایک بوونی مەسیحە , دانیشتووم لەسەر کورسییەک لە نزیک ئاگردانەکە چاوەڕێم تا کاتی ئەوە بێت کە لەگەڵ دایکم بڕۆم بۆ ئاهەنگی لەدایک بوونی مەسح لە کەنیسەی کۆشکی (ئێغم) , پاش کەمێک کەوتینە ڕێ , کەشوهەوا سساردە و بەفر بارین دەستی پێکرد , بە بەردەم کێڵگەیەکی تردا تێپەڕین و چاومان بە هاوڕێیەکی دایکم کەوت.

– (ژاکوو) ش دەبەی لەگەڵ خۆت؟ ئەو ژنە لە دایکمی پرسی.

– زۆر ئارەزوو دەکات بێت و پاشان مێردەکەشم لە ماڵەوە نییە , ناتوانم ژاکوو بە تەنها لە ماڵەوە جێ بهێڵم.

لە کۆتاییدا گەیشتینە کەنیسەکەی کۆشک , ئەو هەموو گڵۆپە ! چەندە خۆشە !

پاش ئەوەی بۆنەکە تەواو بوو لە کەنیسە هاتینە دەرەوە و دایکم چوو تا چراکەمان داگیرسێنێت لە چێشتخانەکەی کۆشک , منیش دوای کەوتم , چ چێشتخانەیەکە! لەناو ئاگردانەکەدا ئاگرێکی گەورە دەسوتێت و قەلێکی گەورەش بەرامبەر ئاگرەکە خەریکە دەبرژێت لەسەر مێزی نان خواردنەکەش هەموو جۆرە دەفرێکی خواردنی لەسەرە: دەفری گۆشت , دەفری میوە , دەفری کێک... من هەرگیز شتی ئاوا جوانم نەبینیوە.

دایکم سوپاسی چێشتلێنەرەکە دەکات بۆ ئاگرەکە و پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە , لەوێ بە غەمبارییەوە بیر لەو هەموو شتە جوانانە دەکەمەوە کە لە چێشتخانەکەی کۆشک بینیم , ماڵەکەمان ساردە چونکە کە ئێمە لە ماڵەوە نەبووین ئاگرەکە کوژابۆوە , دایکم دایگیرساندەوە و هەندێ شتی دامێ بۆ خواردن: نانی گەنمەشامیی کوڵاو لەگەڵ چەند گەڵا کەلەرمێک. ساردە و تامی خۆش نییە , بۆچی لە کۆشک ئەو هەموو خواردنە خۆشەی لێیە بەڵام لێرە هیچی لێ نییە؟

لە بیری منداڵیمدا ئەم شتانە ڕوون نین , بەڵام سەرەڕای ئەوەش تێدەگەم کە شتێکی ناتەواو هەیە.
– دەبێت بچین بخەوین , دایکم گووتی.
یەکسەر ڕاکشام و خەوم لێکەوت.
بۆ بەیانییەکەی کە هەڵدەستم لەخەو دەبینم دایکم خەریکی سوپ ئامادە کردنە و باوکیشم ئەو باڵندانە ڕیز دەکات کە شەو ڕاوی کردووە و ڕێکیان دەخات. سوپەکەمان خوارد و پاشان باوکم چوو بۆ (مۆنتینیاک) تا ئەو باڵندانە بفرۆشێت کە ڕاوی کردبوون.
سەرەڕای ئەوەی کە بەفر دەباری و سەرما بوو چوومە دەرەوە تا پیاسەیەک بکەم , چاووم بە کۆشکەکەی ئێغم کەوتەوە و دووبارە بیرم لە چێشتخانە جوانەکەی دەکردەوە , پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوە , بێزار بووم , ڕۆژی لەدایک بوونی مەسیح ڕۆژێکی ناخۆش تێپەڕی لای من.
بەم شێوەیە زستان کۆتایی دێت , باوکم سەرقاڵی ئاژەڵەکانی کێڵگەیە , پاشان ڕاویش دەکات تا هەندێک پارە پەیدا بکات.
لە کۆتاییدا سەرما کەمێک کەم دەبێتەوە و دایکم ڕۆژێک بڕیار دەدات مەڕەکان ببات و بیانلەوەڕێنێت چونکە لە کێڵگەکەدا ئالیکی زۆری تێدا نەمابوو.
ئەو دوا نیوەڕۆیە ڕەشەبایەکی سارد بۆ ماوەیەک هەڵدەکات , بەڵام سەرەڕای ئەوە کەشوهەوا هەر خۆشە , من و دایکم لە کەناری کێڵگەیەک دانیشتووین کە مەڕەکان لێی دەلەوەڕێن , لە ناکاو , کاتێک من خەریکی خواردنی پارچە نانێکی ڕەش بووم بە هێمنی , یەکێک لە پاسەوانەکانی کۆشکی ئێغم گەیشتە ئەوێ کە ناوی (ماسکخێ) بوو بە دایکمی گووت کە دەست بەجێ بچێت بۆ کۆشک لەبەر ئەوەی سەرۆک کار دەیەوێ قسەی لەگەڵدا بکات.
مەڕەکانمان بردەوە بۆ ماڵەوەو دایکم چوو بۆ کۆشک , ئێوارە کاتێک دایکم دەگەڕێتەوە باوکم لێی دەپرسێت :
– چییان دەویست؟
– پێی گووتم کە مێردەکەت بە دزییەوە ڕاو زۆر دەکات وە جەنابی کۆنت چیتر چاوی بە کەروێشکە کێوی ناکەوێ لە دارستانەکە , وە پێشنیاری ئەوە دەکات کە واز لە ڕاو کردن بهێنیت و سەگەکەشت بەڕەڵا بکەیت , پاشان زیاتری گووت و گووتی کە ئێمە دابونەریت ناگۆڕین و ئەگەر واز نەهێنێت ئەوا ئاوارەتان دەکەین و دەتانکەینە دەرەوە.
– هیچی تری پێ گووتی؟
– بەڵێ , هەر هەمان بابەتی پێشوو: گووتی کە تۆ لێرە نیشتەجێ نیت بۆ ئەوەی کە ئەو شتانە بکەیت , وە دەبێت ئەوە بکەیت کە فەرمانت پێدەکرێت و دەبێت سوپاسگوزاریش بێت...
– ئاە! چەپەڵی پیس! ئەگەر ڕۆژێک لە دارستانەکە چاووم پێ دەکەوێ !...
– ئارام بە , دایکم گووتی , من نامەوێ بەڵایەکمان بەسەر بهێنن.
دوای ١٥ ڕۆژ , کاتێک دایکم سەرقاڵی خواردن ئامادە کردنە , بەڕێز (لابۆغی)ی سەرۆک کار دێت , هاتە چێشتخانەکەوە و سڵاوی کرد و پاشان پرسیاری کرد کە باوکم لە کوێیە.
– چووە دار ببڕێت , دایکم وەڵامی دایەوە.
– دەتەوێ بڵێیت ڕاو دەکات بە دزیەوە و , با سەیری هێلکەکان بکەین بزانین باش خەریکیان دەبێت.
پاشان چووە دەرەوە بۆ سەیر کردنی مەڕو ماڵاتەکە , دایکم بە توندی دەستی منی گرت و دوای کەوت.
لابۆغی سەیری هێلکەکان دەکات پاشان مەڕەکان و بە دەنگێکی نزم بە دایکمی گووت :
– بۆ نایەیت بۆلام چاووت پێم بکەوێ؟ ملپێچێکی

جوانم بۆ کڕیویت...
دایکم وەڵامی نەدایەوە.
لابۆغی ڕۆیشت و هاواری بۆ دایکم کرد :
- پەشیمان دەبیتەوە , ئاە بیرم چوو پێت بڵێم , هەر ئەمڕۆ سەگەکە بەرەڵا دەکەن , ئەگەر جەنابی کۆنت بیبینێتەوە بە کوشتی دەدات.
کاتێک باوکم گەڕایەوە بۆ ماڵەوە دایکم هەموو ئەوانەی بۆ گێڕایەوە کە ڕووی دابوو.
- ئای (ماتیسو)ی داماو , دایکم گووتی , باوەڕم وایە سەگەکە بفرۆشین باشترە , ئەگەر نا تووشی کێشە دەبین.
- نامەوێ بیفرۆشم , باوکم وەڵامی دایەوە , ئەو زۆر باشە بۆ ڕاو.
- کەواتە بیبە لای ئامۆزاکەت داینی تا کارێکی نوێمان دەست دەکەوێت ئەو کاتە دەیهێنینەوە لای خۆمان , چونکە پێم وایە دەبێت لێرە بڕۆین.
- تۆ ڕاست دەکەیت , باوکم گووتی , یەک شەممە دەیبەم.
ڕۆژیک پیاوێک هاتە ناو حەوشەکەمان و لە باوکمی پرسی کە لە دەرەوە وەستباوو :
- تۆ (ماتیسو لو کخۆکان)یت؟ جوتیارەکەی بەڕێز نۆنساک؟
- بەڵێ منم.
پیاوەکە لاپەڕەیەکی بۆ باوکم ڕاگرت و پیی گووت :
- ئەم لاپەڕەیە فەرمانت پێدەکات کە کێڵگە جێ بهێڵیت.
باوکم لاپەڕەکەی لێ وەرگرت و پارچە پارچەی کرد و دای بە سەروچاوی پیاوەکەدا.
- ئەمە بە گران لەسەرت دەکەوێت! پیاوەکە بە هاوارەوە بە باوکمی گووت.
لەوکاتەوەی کە دەزانین دەڕۆین لەم شوێنە و سەگەکەش لە لای ئامۆزاکەی باوکمە دایکم زۆر دڵی ئارامە , بەڵام شتەکان بەردەوام بەو شێوەیە ناڕوات کە ئێمە دەمانەوێ.
شەوێکیان گوێمان لە کرە کرِی دەرگاکەیە کە دەکرێنرێت.
- ئەوە سەگەکەیە , باوکم گووتی و دەرگاکەی کردەوە , سەرەڕای ئەوەی کە بە ئامۆزاکەم گووتبوو کە باش بیبەستێتەوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک.
سەگەکە دێتە ژوورەوە و باز دەداتە سەر شان و ملی باوکم و دەوەڕێنێ بە دڵخۆشییەوە , دایکیشم بە درێژایی شەو ناخەوێت , نائارامە و دەزانێ شتێکی ترسناک ڕوو دەدات.
بۆ سبەی بەیانی دەوروبەری کاتژمێر ٩ دوای ئەوەی لە خواردنی سوپ دەبینەوە , سەگەکە دەچێتە حەوشەکە و دەوەڕێنێ , چەند چرکەیەک دوای ئەوە , گوێمان لە دەنگی تفەنگ دەبێت , چەند پارچە ساچمەیەک بەر دەرگای چێشتخانەکە دەکەوێت و یەکێک لەو پارچانە بەر نێو چاوانی دایکم دەکەوێت و برینداریی دەکات , بە بینینی ئەوە باوکم دەست دەداتە تفەنگەکەی و زۆر بە خێرایی دەچێتە دەرەوە , لە ناو حەوشەکە سەگەکەی بە مردویی بینی و لەلاشیەوە لابۆغی وەستابوو کە تفەنگەکەی دابوو بە ماسکخێ.
- هەی زۆڵ! چیتر لەمەودوا ئازاری کەس نادەی.
فیشەکێک دەنێت بە سەرۆک کارەکەوە و بە مردویی دەکەوێتە سەر زەوی , پاشان دەچێتە ژورەوە و بە خێرایی دێتەوە دەرەوە و تورەکەیەک بە دەستییەوەیەتی کە هەندێک خۆراک و پۆشاکی تێکردبوو , ماچێکی منی کرد و دەستی دایە تفەنگەکەی و بەرەو دارستانەکە هەڵهات.
بۆ بەیانییەکەی پۆلیسەکان هاتن و لەسەر ئەو ڕووداوە زۆریان پرسیار لە دایکم کرد , یەکێک لەوان پرسی :

- پیاوەکەت لە کوێیە؟
- نازانم , دایکم وەڵامی دایەوە , ئەگەر بشزانم پێتان ناڵێم.
بۆ ماوەی یەک مانگ , باوکم توانی بە شاراوەیی بژی لە دارستانەکە و لە دەست پۆلیسەکان هەڵبێت بە هاوکاری (ژان)ی خەڵوزچی کە یارمەتیی باوکمی دەدا و هاوڕێی باوکم بوو جارجارە دەهات و چاوی پێمان دەکەوت , هەندێ جار باوکم بە شەوان دەهات و سەردانێکی بچووکی دەکردین و دەگەڕایەوە تا دەستگیر نەکرێت.
ڕۆژێک نۆنساک بە پاسەوانەکانی گووت کە دوو پارچە زێڕ دەدات بەو کەسەی کە باوکمی بۆ بەرێت , لەو وڵاتەدا ژیان سەختە و خەڵکەکە پێویستیان بە پارەیە , پێشنیارەکەی نۆنساکیش زۆر سەرنج ڕاکێشە و (ژانسو)ی داماویش کە بە ڕۆژانە کار دەکات و ٥ منداڵی بچکۆلەی هەیە , نەیتوانی ماوەیەکی زۆر بە فریودان بمێنێتەوە و ڕۆژێک دەچێت بۆلای نۆنساک و پێی دەڵێت کە چۆن بتوانن ماختیسو دەستگیر بکەن , چونکە دەچێت بۆ ماڵی (غێی) بۆ ئێوارەی کەرنەڤاڵی ساڵانە کە لە (گفانڤال) دەژی.
ئەو ئێوارەیە کاتژمێر ١١ , لە کاتێکدا کە هەموو خەریکی خواردن و خواردنەوە و ڕابواردن بوون لە ماڵی غێی , دەرگاکە لە ناکاو کرایەوە و دوو پۆلیس خۆیان کرد بە ژووردا.
ئەوە جێی سەرسوڕمانە , باوکم چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە ئەوە ڕووبدات , هەڵدەستێت و بەرەو پەنجەرەکە ڕادەکات و خۆی فڕێ دەداتە دەرەوە , بەڵام لەوێ لە لایەن دوو پۆلیسی ترەوە دەستگیر دەکرێت و یەکسەر دەبرێت.
ئەوەی کە دەبوو ڕووبدات ڕوویدا , بۆ بەیانی کاتێک دایکم دەبیستێ کە باوکم دەستگیر کراوە , دەست دەکات بە ئاە هەڵکێشان بە دەنگێکی پڕ لە غەمبارییەوە.
- ئای ماتیسوە داماوەکەم دەبێ چیت بەسەر بێت؟
من دەگریم و بە درێژایی ڕۆژ بەرامبەر بە یەک دانیشتوین و بیر لە باوکم و لەوە دەکەینەوە کە چاوەڕێی باوکم دەکات.
بۆ بەیانی خزمەتکارێکی کۆشک هات و پێی گوتین کە دەبێت دەست بەجێ کێڵگەگە چۆڵ بکەین , دایکم بیر دەکاتەوە تا بزانێ دەتوانین چی بکەین و چی نەکەین , بە بیری دێتەوە کە لە ناو دارستانەکە خانوویەکی کۆنی چوڵی لێیە دەچین لەوێ نیشتەجێ دەبین.
دەست بەجێ دەچێت بۆلای ئەو پیاوەی کە خاوەنی ئەو خانووەیە و ئەویش لە نەهامەتیی دایکم تێدەگات و دەزانێت لە چی بارودۆخێکدایە بۆیە خانووەکەمان دەداتێ بە بێ کرێ و ئیدی لەو خانووەدا دەژیاین.
خانووەکە زۆر پیسترە لەوەی کێڵگەکە و زۆر ساردترە , وە لە لایەکی تریشەوە تەنها کەمێک پارەمان ماوە و دایکم پێویستە کارێک بدۆزێتەوە , ڕۆژێک پیی دەڵێن کە گوندنشینێک هەیە لە (پوی پۆتیێ) بە ناوی (ژێغال) بۆ ئافرەتێک دەگەڕێ کە لە کێڵگەکانیدا کار بکات , دایکم دەچێتە لای پیاوەکە خۆی دەناسێنێت و پیاوەکەش یەکسەر وەریدەگرێت.
هەموو بەیانییەک من و دایکم دەچووین بۆ کێڵگەکەی ژێغال بۆ کار و لە کاتەدا کە دایکم سەرقاڵی کار کردن بوو منیش لەگەڵ کچی خزمەتکارەکە کە ناوی (لینا) بوو یاریم دەکرد.
بەڵام پاش ١٢ ڕۆژ ژێغال بە دایکم دەڵێت کە بۆ ماوەیەک کار بۆ ئەو نییە , دایکم زۆر نیگەرانە بۆ داهاتوومان و منیش دڵتەنگم بە جێ هێشتنی لینا.
ڕۆژێک سەرۆک شارەوانی پێمان ڕادەگەیەنێ کە دەبێت بچین بۆ دادگای (پێغیگۆ) چونکە باوکم خەریکە دادگایی دەکرێت.

ڕێگامان گرتە بەر و پاش گەشتێکی درێژ گەیشتینە شارەکە , ڕۆژی دادگاییەکە کاتژمێر ١٠ دەچینە ناو دادگاوە , لە ناکاو باوکم دەگات کە بە پۆلیس دەوری گیراوە و دەستەکانی بە کەلەپچە بەستراونەتەوە , بە بینینی باوکم , دایکم هاوار دەکات و ڕادەکات بەرەو ڕووی و باوەشی پیا دەکات , ماچی دەکات و هاوار دەکات بە گریانەوە , پۆلیسەکان داوای لێدەکەن کە بکشێتەوە .

– منداڵەکەم بدەنێ , باوکم گووتی .

دایکم منی گرت و بەرزی کردمەوە هەتا ئاستی ڕوخساری و منیش توند باوەشم پێدا کرد .

– ژاکووە داماوەکەم , ژاکووە داماوەکەم , باوکم گووتی بە ماچ کردنمەوە .

بەڵام پۆلیسەکان ناچاریان کردین کە لە یەک جیا بینەوە و باوکمیان برد , پاشان چووینە هۆڵی دادوەرییەوە .

من باش تێناگەم لەوەی کە لەوێ ڕوو دەدات , بەڵام دەبینم کە دایکم وەختە سەری بە هەنسکەوە هەڵدەکەنرێت کاتێک گوێی لە سەرۆک دادگایە دەڵێت کە گوایا باوکم سزا دەدرێت بە کردنی کاری قورس بۆ ساڵانێکی دوور لە زینداندا , لەو کاتەدا گوێم لێیە کە کۆنت نۆنساک بە ماسکخێ دەڵێت :

– لە زیندان لەژێر کاری قورسدا دەمرێت! باشتر , ئەوە یەکێکیان لێ کەم بۆوە .

زۆر بە دڵتەنگییەوە دەستمان کردەوە بە گەشتە درێژەکە و بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە .

لە دوای ئەو ڕۆژەوە دایکم ڕۆژەکانی بە گریانەوە دەبردە سەر , جار نا جار کاری دەکرد لای جوتیارەکان کە پێویستیان بە کەسێک دەبوو بۆ چەند هەفتەیەک , لەو کاتەدا من لە ماڵەوە دەمامەوە و هەندێ جار دەچووم بۆ ڕاو تا شتێک پەیدا بکەم بۆ خواردن .

زۆر جار بیرم لە باوکم دەکردەوە , دایکم دەیگووت کە ژیانی ناو ئەو زیندانییە زۆر سەختە و کاری زۆر قورسیان پێ دەکەن بۆیە هەمیشە خەمی ئەوی بوو .

دوای چەند مانگێک سەرۆک شارەوانی دەنێرێت بە شوێن دایکمدا و پێی گووتین :

– پیاوەکەت لە زیندان لەرز و تای گرت , ٥ ڕۆژە مردووە .

بێ ئەوەی یەک ووشە بڵێت , دایکم دەستی منی گرت و چووینە دەرەوە , ئەم جارەیان نەگریا , منی ڕادەکێشا بە هەنگاوی خێرا , لە ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە منی برد بۆ دارستانەکە , بە خێرایی ڕێمان دەکرد , جار بۆ جار خێراتر , لە کۆتاییدا گەیشتینە لێواری دارستانەکە , شەو داهاتبوو بەڵام کۆشکە شومەکەی ئێغم بەرامبەرمان دیار بوو کە ڕاوەستابوو , دایکم ڕاوەستا و بە دەنگێکی توند و سەختەوە هاواری کرد :

– کوڕم , باوکت لە زیندان مردووە , لە لایەن نۆنساکەوە کوژراوە , سوێند بخۆ کە تۆڵەی لێ بکەیتەوە , وەک من بکە .

بە گوێرەی نەریتی سوێند خواردنی سەختی خەڵکی لادێکە , تفی کردە سەر دەستی ڕاستی و بە کراوەیی بەرەو کۆشک ڕای گرت .

– تۆڵە سەندەوە دژی نۆنساک! سێ جار بە دەنگی بەرز ئەمەی دووبارە کردەوە .

وە منیش وەک ئەوەم کرد و سێ جار ئەو ڕستەیەم دووبارە کردەوە :

– تۆڵە سەندنەوە دژی نۆنساک .

پاشان گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە .

ژیان وەک پێشتر بەردەوامە , دایکم کاردەکات هەر هەفتەی لە لایەک , منیش بە دزییەوە ڕاوەکەم و جارجار ئەو پەیمانەم بەبیر دێتەوە کە بە دایکمم دابوو وە ڕقوکینە لە دڵمدا دژی نۆنساک دروست بوو .

ئەمڕۆ ڕۆژی (سانت ژان)ە , وەک هەموو ساڵێک لە

لادێکاندا ئاگر دەکەینەوە , پێم خۆشە تەماشای گڕ و بڵێسەی ئاگرەکان بکەم , لە ناکاو بیرۆکەیەک هات بە مێشکمدا: بۆچی دارستانەکەی ئێغم نەسوتێنم؟ ئەمە شێوازێک دەبێت بۆ تۆڵ کردنەوەی باوکم و زیان گەیاندن بەو تۆنساکانەش کە باوکمیان کوشت.
شەو و ڕۆژ بیرم لەوە دەکردەوە , نەخشەیەکم داناو بڕیارم دا ئەنجامی بدەم.
لەو کاتەدا دایکم لە کێڵگەیەک کاری دەکرد , ئەو گیایەی کۆ دەکـردەوە و هەڵیدەخستن تا ووشک ببنەوە کە دروێنە دەکران , بۆیە نەیدەتوانی هەموو شەوێک بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە چونکە کێڵگەکە دوور بوو لە ماڵەکەمانەوە , بۆیە ئەو هەلەم قۆستەوە بۆ ئەوەی تۆڵەی باوکم بستێنمەوە.
شەوێک چووم بۆ ناوجەرگەی دارستانەکە , پێڵاوێکی دارم پێبوو پڕم کردبوو لە پشکۆ , پشکۆکانم کردە سەر مەڵۆ گیایەکی ووشک کە دوای نیوەڕۆ کۆم کردبۆوە و دەستم کرد بە فوو کردن لێی و یەکسەر ئاگری گرت , هەندێک لقە داری ووشکم خستە سەری و بۆ ماوەیەک مامەوە و تەماشای ئاگرەکەم دەکرد تا بڵێسەی سەند و گەورە بوو پاشان بە خێرایی خۆم ڕزگار کرد , بەهۆی ڕەشەباوە سوتانی دارستانەکە زۆری نەخایاند , نزیکی نیوە شەو گوێم لە دەنگە دەنگ بوو لە هەموو لایەکەوە , چوومە دەرەوە تا بزانم چی ڕوو دەدات , ڕوانیم و بینیم کە دارستانەکەی کۆنت دەسوتێ , زۆر دڵخۆش بووم.
هەستم دەکرد چیتر منداڵ نیم و بووم بە پیاو , ئەو هەستەم هەبوو کە کەمێک تۆڵەی باوکم سەندۆتەوە , بەڵام دەمزانم لە ناخەوە تێر نیم و هێشتا دەگەڕام بە دوای ڕێگای تر تا تۆڵەی باوکم بسەنمەوە.
زستان گەڕایەوە و کەشوهەوا زۆر ساردە , سوتانی دارستانەکەی ئێغم ماوەیەکە لەبیر کراوە , کۆنت باوەڕی وابوو کە ئاگرەکە بەهۆی منداڵانەوە کەوتۆتەوە کە یارییان کردووە.
ڕۆژێک دایکم لە کار دەگەڕێتەوە و خوساوە بە باران و هەڵدەلەرزێ لە سەرمادا , یەکسەر خەوت , جەستەی وەک ئاگر گەرم بوو تاکەی هێندە بەرز بوو , ترسم لێ نیشت , ویستم بڕۆم یارمەتی بهێنم , بەڵام دایکم ڕەتی کردەوە و بەردەوام دەیگووت :
– جێم مەهێڵە ژاکووەکەم.
لە لای مامەوە و دەستەکانیم گرت , کاتێک هەڵدەستام تا شتێک بهێنم یەکسەر چاوەکانی دەکـردەوە و دەیگووت :
–تۆ لێرەیت ژاکووەکەم؟ جێم مەهێڵە !
منیش وەڵامم دەدایەوە :
– دایکە , تۆ دەزانی کە من هەرگیز جێت ناهێڵم.
بارودۆخی جار بۆ جار خراپتر دەبوو تاکەی بەرزتر دەبۆوە , بۆ چرکەیەک جێم نەدەهێشت , چرکەیەک خەوی لێدەکەوت بەڵام بەردەوام دەیناڵاند , لە ناکاو چاوەکانی کـردەوە و سەیری دەکـردم و چاوی لێ نەدەتروکاندم , ناڵە ناڵ نەما : مرد.
بە دڵێکی پڕ لە ئازار و ترسەوە بانگم دەکرد :
–دایکە! دایکە !
دەستم کرد بە گریان و بەو شێوەیە لە لایەوە مامەوە بۆ ماوەیەکی درێژ , پاشان بڕیارم دا بڕۆم خەڵک بهێنم.
بۆ ڕۆژی دواتر دایکم نێژرا , کاتێک هەموو شتێک کۆتایی هات , بڕیارم دا ئەو خانووە شومە جێ بهێڵم و بە دوای کاردا بگەڕێم.
هەندێ شتم لەگەڵ خۆم برد کە هی خۆمان بوو پاشان ڕێم گرتە بەر بەرەو یەکەم گوند.

***********

لەناو هەموو ئەو گوندانەی کە پێیاندا تێپەڕیم دەمپرسی بەو هیوایەی کارێک هەبێت بۆ من , بەڵام

خەڵکەکە دەیانویست زۆر شت بزانن لە بارەمەوە و پێش وەڵام دانەوە دەیانپرسی کە ئایا من کێم , لە کوێوە هاتووم , هەر کە دەمگووت من کوڕی ماتیسووم کە لابۆغیی کوشت و لە زیندان لەژێر کاری قورسدا مرد یەکسەر ڕوخساریان دەگۆڕا و دەیانگووت کار بۆ تۆ نیە لە گوندەکە.

هەست دەکەم بێ هیوام , بەڵام سەرەڕای ئەوە هەر بەردەوامم لە ڕێ کردن تا بەیانیەک گەیشتمە (فانلاک) , چووم بۆ شوێنی کەنیسەکە و بۆ ماوەیەک مامەوە بە تێڕوانینەوە لە کەنیسەکە , لە خۆم دەپرسی ئایا من چیم بەسەر دێت.

لە ناکاو گوێم لە دەنگێک بوو گووتی :

–چی دەکەی لێرە بچکۆل؟

ئاوڕم دایەوە و بینیم قەشەیک بوو , ئەو پیاوێکی باڵا بەرز و بەخۆیە , قژی مەیلەو ڕەساسییە , وە لە تێڕوانینە هێمنەکەیەوە یەکسەر هەستم بەوە کرد کە پێویستە قسەی لەگەڵ بکەم و نەهامەتی و غەمباری خۆمی بۆ بگێڕمەوە.

کاتێک لە قسە کردن تەواو بووم قەشەکە پێی گووتم :

– وەرە لەگەڵم.

ماڵەکەی نزیک بوو لە کەنیسەکە , من زۆر چڵکنم و جلوبەرگەکانیشم هەموو دڕاون , کاتێت خزمەتکارەکەی قەشە کە خەریکی ئامادە کردنی سوپ بوو منی لە دوای قەشەوە بینی , لە ناکاو گووتی :

–ئەوە کێیە؟

– باش دەبینیت کە منداڵێکی داماوی بێ جلوبەرگە , قەشە وەڵامی دایەوە , نە دایکی هەیە نە باوک.

–بەڵام تۆ بڵێی ئەسپێی تێدا بێت ؟

– ئەگەر تێیدا بوو , فانتایە باشەکەم لێی دەکەین و پاکی دەکەینەوە , لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە خواردنی بدەینێ.

لە سەرەوە دەفرێکی داگرت لە کەوانتەرەکە و پڕی کرد لە سوپێکی زۆر بەتامی کەلەرم.

– بیگرە بیخۆ بچکۆل , قەشە بە زەردەخەنەیەکەوە گووتی.

بە خێرایی نانەکەم دەخوارد بە بێ قسە کردن , دوای ئەوەی سوپەکەم خوارد جەنابی قەشە کە ناوی (بۆنال) بوو پرسیاری زیاتری لێکردم لەسەر خێزانەکەم , کاتێک باسی باوکم دەکرد ڕقوکینەم بۆ نۆنساک لە سەیر کردن و قسەکانمدا هەستی پێدەکرا , ئەوە زۆر کاریگەر بوو کە جەنابی قەشە لێی پرسیم :

–ئەگەر تۆڵەت پێ بکرێتەوە , تۆڵە دەکەیتەوە؟

–ئاه! بەڵێ , وەڵامم دایەوە و چاوەکانم دەبریسکانەوە.

لە ناکاو بیرۆکەیەکی بە مێشکدا هات :

– لەوانەیە پێشتر تۆڵەت کردبێتەوە؟ قەشە ئەمەی گووت و چاوی لێ نەدەتروکاندم.

–بەڵێ جەنابی قەشە...

ئینجا سوتاندنی دارستانەکەی ئێغمم بۆ گێڕایەوە.

– چۆن , بەدبەخت , تۆ بوویت کە ئەوەت کرد؟ تۆ دەزانیت کە دەبێت سەرەڕای ئەوەش لە دوژمنەکانت ببوریت؟

بوران لە کۆنت نۆنساک کە دایکم و باوکمی کوشت!

ئەو بیرۆکەیەم بە دڵ نیە , هیچم بە جەنابی قەشە نەگووت , بەڵام دەزانم لە ناخی دڵمەوە کە ڕۆژێک هەر تۆڵە لەو پیاوە ترسناکە دەکەمەوە , دوای ئەو گفتوگۆیە جەنابی قەشە بردمی بۆ ژوورەکەی خۆم , ئەوە یەکەم جار بوو لە ژیانم کە لەسەر جێگا و چەرچەفی سپی و جوان بخەوم.

جەنابی قەشە بەزەیی بە مندا دێتەوە و بڕیار دەدات کە لای خۆی بمهێڵێتەوە.

جلی نوێی بۆ دام بە کرد و هەموو ڕۆژێک لە کاتی

برسێتیدا نانم دەخوارد , چ گۆڕانێک بوو لە بوونی مندا !
ڕۆژێک قەشە پێی گووتم :
– ئێستا تۆ لەگەڵ من و ئەو ژیانە نوێیەتدا ڕاهاتووی , فێرت ئەکەم کە بە ڕاست و ڕەوانی قسە بکەیت و فێری خوێندنەوە و نوسینت دەکەم.
لە دوای ئەو ڕۆژەوە هەموو بەیانییەک دوو کاتژمێر وانـەی پێ دەگووتم و هەموو ئێوارەیەکیش دوو کاتژمێری تر.
ئارەزووی فێر بوونم دەکرد و هەموو هەوڵێکم دەدا بۆ ئەوەی باش فێر بم بۆ ئەوەی دڵی ئەو قەشە باشە خۆش بکەم.
٥ ساڵ بەو شێوەیە تێپەڕی و ژیانێکی خۆشم بردە سەر لە سایەی قەشە بۆنالەوە.
بە درێژایی هەفتە من دەمخوێند , بەڵام بە تایبەتی هەوڵم دەدا پیشەی جوتیاری فێر ببم , یەک شەممان دەڕۆیشتم بۆ یاری لەگەڵ کوڕەکانی تری گوندەکە.
هەندێ جار دەهات بە سەرمدا و بیرم لە تۆنساک دەکردەوە دڵم پڕ دەبوو لە کینە , هەوڵم دەدا لەبیری بکەم بەڵام دەمزانی کە بۆم نایەتە دی و ناتوانم.
ڕۆژێک قەشە دەمنێرێت بۆ گڤانڤال بۆلای غێی بۆ کارێک , کاتێک گەیشتمە ئەوێ ژنەکەی غێی بە ئاستەم منی ناسیەوە :
– چۆن گۆڕاویت ژاکوو! ئەوەتا کوڕێکی جوانت لێ دەرچووە !
نانی ئێوارەم لای ئەو خەڵکە ئازا و بەجەرگانە خوارد , بەڵام نەمدەتوانی بخەوم لەبەر ئەوەی بیرم لەو شەوە دەکردەوە کە باوکم لەم خانووەدا دەستگیر کرا.
بەیانیەکەی زوو هەستام و گەڕامەوە بۆ فانلاک.
بۆ ماوەیەک , تێنەدەگەیشتم بۆچی , کاتێک کچ و کوڕێکم دەبینی کە دەستیان لە دەستی یەکدا بوو , پێیان کاریگەر دەبووم و بیرم لە لینا دەکردەوە.

ئەو بەیانیە , بە هۆی نزیکیمەوە لەماڵیان , زۆر ئارەزووی بینینی لینام دەکرد , کچۆڵەیەکم بینی و لێم پرسی ئایا لینا هێشتا لێرە دەژی یان نا وە ئایا لە کوێ دەتوانم بیبینم , بە دەست ئاماژەی بۆ کێڵگەیەک کرد لە دوور و گووتی دەبێت لەوێ بێت لەگەڵ مەڕەکانی.
کەوتمە ڕێ بە شەقاوی گەورە گەورە بەرەو شوێنەکە , یەکسەر لینام بەدی کرد , لە بن دارێک دانیشتبوو خەریکی چنین بوو بە پاسەوانی کردنی مەڕەکانەوە , بەبێ دەنگ خۆم لێ نزیک کردەوە :
– ئۆو لینا! خۆ ئەوە تۆی !
– ژاکوو! ئەو گووتی , کە منی ناسیەوە ڕەنگی سوور هەڵگەڕا.
ئینجا دەستمان کرد بە قسە کردن دەربارەی ئەوەی کە ڕووی داوە لەو کاتەوەی کە یەکترمان نەبینیبوو.
– چەندە جوانیت لینا !
– تۆ ئەوە بۆ پێکەنین دەڵێیت , ژاکوو !
–نەخێر , هەرگیز , من ئەوە دەڵێم کە بیری لێ دەکەمەوە , بەڵام دەبێت بگەڕیمەوە بۆ فانلاک , چەندە ئارەزووم دەکرد بتبینم! ئەی تۆ؟
بـۆ چـەنـد چـرکـەیـەک دوودڵ بـوو پـاشـان بە زەردەخەنەیەکی دیارەوە گووتی :
–منیش , ژاکوو , زۆرم ئارەزوو دەکرد بتبینم , گوێ بگرە , ڕۆژی ٢٣ی ئاب جەژنە لە (ئۆغیاک) , لەگەڵ دراوسێیەکماندا دەچم بۆ ئەوێ...
–ئێ , باشە , منیش دێم بۆ ئۆغیاک , سەیرم دەکرد بە چاوێکی پڕ لە عەشقەوە , دەستەکانیم گرت و پێم گووت :
– ئۆە , لینا , ئەگەر دەزانـی چەندە دڵخۆشم... ماڵئاوا !
ڕامکێشا بەرەو خۆم و ماچم کرد , پاشان ڕۆیشتم و چەند جارێک ئاوڕم دایەوە بۆ دوای خۆم.

لە ئۆغیاک یەکترمان بینیەوە , لەگەڵ هاوڕێیەکی بوو بە ناوی (بێغتیل) , ڕۆژێکی زۆر خۆشمان بردە سەر پێکەوە , وە هەر جارێک کە ئاهەنگێک یان جەژنێک دەبوو هەوڵمان دەدا یەکتر ببینین.
من خۆشبەختترین پیاوی سەر زەویم , لینام خۆشدەوێت و دەزانم ئەویش منی خۆشدەوێت , هەموو بوونم بە ماوەیەکی کەم گۆڕدرا و ئەو هەستەم هەبوو کە هەموو مەینەت و ئازارەکانم بۆ هەتا هەتایە کۆتایی هات.
بە داخەوە هیچ شتێک تا هەتایی نیە و ئەو ژیانە خۆشەی کە من دەیبەم بەڕێوە ڕۆژێک دەگات بە کۆتایی.
ڕۆژێک قەشە نامەیەکی لە گەورەی قەشەکانەوە پێدەگات و پێی ڕادەگەیەنێ کە دەبێ فانلاک جێ بهێڵێت و چیتر ناتوانێ بەردەوام بێت وەک قەشە , هۆکاری ئەم کێشەیە وا دەردەکەوت کە پەیوەندی بە شۆڕشی فەرەنسیەوە هەبێت , چونکە قەشە هاوکاری شۆڕشگێڕەکانی دەدا.
قەشە فانلاک جێدەهێڵێت و من و فانتی دەبات و دەچێت لە گغانڤال نیشتەجێ دەبێت لە خانویەکدا کە هی خۆی بوو.
لە لایەکەوە غەمبارم بۆ قەشە بۆنال , بەڵام لە لایەکی ترەوە دڵخۆشم چونکە لە لینا نزیک دەبمەوە. خۆم سەرقاڵ کردبوو بە گغانڤالەوە و قەشەش لە چاکەی خۆی هاوکاری دەکردم , بەڵام هەستم بە غەمباریەکەی دەکرد و تەندروستیشی بەرەو خراپی دەڕۆیشت.
لە کاتی گەڕانەوەم بۆ گغانڤال یەکسەر لینام بە بیر هاتەوە و , بەڵام کۆنت تۆنساکم بەبیر نەهاتەوە , سەرەڕای ئەوە ڕووداوێک هاتە پێش و تۆنساک و تینوێتیم بۆ تۆڵە سەندنەوە بە بیر هاتەوە.
ئێوارەیەک لە گیا برین دەگەڕامەوە بۆ مەڕەکان , خەریک بوو شەو دادەهات , بە هێمنی ڕێم دەکرد لەسەر ڕێگاکە , لە دوامەوە گوێم لە دەنگی پێی ئەسپ بوو کە بە خێرایی دەهات , ئەو بیرۆکەیەم بۆ هات کە ئەوە کۆنت تۆنساکە بەڵام بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن بێ ئەوەی ئاوڕ بدەمەوە.
-خۆت لادە چەتە! لە ناکاو تۆنساک هاواری کرد.
خۆم وا دەرخست کە گوێم لێ نیە.
کاتێک ئەسپەکە گەیشتە دوای من , ئاوڕم دایەوە لە ناکاو , لغاوی ئەسپەکەم گرتوو گۆچانەکەم بەرز کردەوە و بە توڕەییەوە گووتم :
-دەتەوێ کوڕەکە بکوژی دوای ئەوەی باوکەکەت کوشت لە زیندان لە ژێر کاری قورس؟ بڵێ بزانم ناپیاو؟
تۆنساک یەکەم جار سەری سوڕما , وەک هەمیشە , کاتێک تۆنساک بڕیارێک دەردەکات گوندنشینەکان یەکسەر دەکشێنەوە , بەڵام خۆی گرتەوە و چەقۆی ڕاو کردنەکەی دەرهێنا و هەڕەشەی کرد.
- خێرا لغاوی ئەسپەکەم بەر بدە ئەگەر نا...
- ئەگەر نا گاڵتەت پێ دەکەم تۆنساک , تۆ نامترسێنیت !
لغاوەکەم بەردا و بە غاردان ڕۆیشت.
کاتێک گەیشتمە ماڵەوە ئەوەی ڕویدابوو بۆ بۆنالم گێڕایەوە , بۆنال نیگەران بوو , چونکە دەیزانی کە تۆنساک دەگەڕێ بە دوای تۆڵە سەندنەوە لەو گوندنشینانەی کە بەرەنگاری دەبنەوە.
- ئاگادار بە ژاکوو , بۆنال پێی گووتم , بەلای کۆشکی ئێغمدا تێنەپەڕیت و بە ناو دارەکانیدا نەڕۆیت.
بە قسەی بۆنالم کرد و بۆ ماوەی ٦ یان ٨ مانگ چاوم بە تۆنساک نەکەوتەوە.
کاتێک لە گغانڤال نیشتەجێ بووم وەک گووتم دڵخۆش بوو بەهۆی نزیک بوونەوەم لە لینا.
هەموو دوا نیوەڕوانێکی ڕۆژانی یەک شەممە

یەکترمان دەبینی بە تەنها یان لەگەڵ بێغتیلی هاوڕێی ، بەڵام یەک شەممەیەکیان کە دەبوو بیبینم لەجیاتی لینا دایکی هاتوو پێی گووتم :
– لەمڕۆ بە دواوە تۆ چیتر ناتوانی لەگەڵ لینا قسە بکەی ، ئەو خەریکە لەگەڵ کەسێک هاوسەرگیری دەکات و منیش بڕیارم لەسەر داوە .
دایکی دەیویست لینا بدات بە پیاوێکی پیری دەوڵەمەند .
لەو کاتەدا نەمدەزانی چی بڵێم ، بەڵام خۆم گرتەوە و گووتم :
– باشە چیتر کچەکەت نابینم ، بەڵام ناتوانی ڕێ بگری لەوەی کە خۆشم دەوێت .
– لە ڕاستیدا دەسەڵاتی ئەوەم نیە ، تۆ ناتوانی بێیت بۆ ماڵی ئێمە و نامەوێ بتبینم لەگەڵ لینا قسە بکەی لە دەرەوە .
ئەو هەواڵە دڵتەنگی کردم ، لینام خۆشدەوێت و دەمەوێ ببێتە ژنم ، بەڵام دەتوانم چی بکەم؟
یەک شەممەکانی داهاتوو چاوم بە بێغتیی دەکەوت ، هاوڕێکەی ، دەیگووت کە لینا زۆر نیگەرانە و ڕۆژەکانی بە گریان دەباتە سەر ، لەبەر ئەوەی نایەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو پیاوە بکات کە دایکی بۆی هەڵبژاردووە ، ئینجا دایکی لێی تووڕە دەبێت و لێی دەدات .
من زۆر بەدبەختم و دەزانم کە ناتوانم هیچ بکەم بۆ یارمەتی دانی لینا .
لەسەر ئەوەشەوە بەدبەختیەکی تر ڕووم تێ دەکات . بەیانیەک بۆنال دەچێتە دەرەوە بۆ ئەوەی بەڕوو بهێنێتەوە ، بەڵام سەکتەی دڵ لێی دەدات و دەمرێ . لەگەڵ فانتی هەموو شتێکمان ئامادە کرد بۆ بەخاک سپاردنەکەی .
بۆنال چەند ئامۆزایەکی هەبوو کە دەبوونە میراتگر لە گغانڤال .

دوای بەخاک سپاردنەکەی ، خانووەکەیان وەک میرات هەڵگرتەوە .
سەیرم دەکردن لەو کاتەدا کە خۆم کۆ دەکردەوە بۆ ڕۆیشتن ، چونکە ئەوان نەیاندەویست من ڕاگرن بۆ خزمەتی خۆیان .
ئەوان ناو هەموو چەکمەجەکان گەڕان و هەموو لێدوانێکیان دەکرد تا من تووڕە بکەن .
– بە ڕاستی ، ژنێکیان گووتی دوای ئەوەی هەموو چەکمەجەکان گەڕا ، من نا ئومێدم ، بڕوام وابوو کە قەشەیەکی کۆن بەرگ و پۆشاکی زیاتری هەیە .
– ئەی من ، پیاوێکیان هەڵیدایە ، پێم وابوو کە شەرابی زیاتری هەیە ، بەڵام دوای ئەوەی چومە ژێر زەمینەکە تەنها چەند شوشەیەکم دۆزیەوە .
ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم کاتژمێرێکی تر بمێنمەوە لەگەڵ ئەم مرۆڤە ترسناکانە ، بۆیە بە فانتیم گووت:
– با بڕۆین .
شتو مەکەکانمان هەڵگرت و بەرەو دەرگاکە کەوتینە ڕێ ، بە بینینی ئێمە کە شت و مەکەکانمان هەڵگرتبوو ئامۆزایەکی بۆنال گووتی :
– چیتان هەڵگرتووە لە ناو پاکەتەکانتاندا؟
– شتومەکی خۆمان ، بێ خەم بن هیچی ئێوەی تێدا نیە !
ڕۆیشتینە دەرەوە ، هاوکاری فانتیم کرد تا گەیاندمە فانلاک کە خزمەتی هاوڕێ کۆنەکانی بۆنالی دەکرد .
من دووبارە بە تەنها مامەوە ، بە بێ خێزان ، من چیتر پارێزگارێکم نیە ، لینای ئازیزمم نیە ، لە پەیوەندیدا مامەوە لەگەڵ ژانی خەڵوزچی کە یارمەتی باوکمی دا لە دارستانەکە دوای کوشتنی لابۆغی ، پێشنیاری کرد کە بچم لەگەڵ ئەو بژیم و منیش قایل بووم .
خانووەکەی هەژارانە بوو ، تەنها ئەوەمان هەبوو کە دەمانخوارد ، بەڵام ئەوەندە گرنگ نەبوو چونکە بەلای کەمەوە بە تەواوی تەنها نەبووم .

بۆ بەیانیەکەی بڕیارم دا بچم بۆلای ماڵی لیناوە و چاوم پێی بکەوێ ئەگەرچی نەشتوانم قسەی لەگەڵ بکەم , نزیک بوومەوە لە ماڵەکەی و بینیم لەگەڵ مەڕەکانی لە ماڵ هاتە دەرەوە , دووره پەرێز دوای کەوتم تا ئەو کێڵگەیەی پاسەوانیی مەڕەکانی لێ دەکرد , ئینجا دەستم کرد بە فیکە لێدان تا سەرنجی بەلای خۆمدا ڕاکێشم , منی بینی و بە دەست ئاماژەم بۆ کرد تا بێتە شوێنێکەوە کە کەس نەمانبینێت , بەرەو ڕووم ڕایکرد و خۆی فڕێدایە نێوان دەستەکانمەوە و بۆ ماوەیەکی درێژ ماچی یەکمان کرد.

پاشان هەموو ئەو شتانەی بۆ باس کردم کە دایکی بەسەری هێناوە و دەترسا لەوەی کە نەیدەوێرا لەگەڵ ئەو پیاوە پیرە هاوسەرگیری بکات.

– گوێ بگرە لینا بچکۆلانەکەم , بێ وورە مەبە , هەوڵ دەدەم ڕێگایەک بدۆزمەوە تا لەوە دەرت بکەم , تەنها ئارام بە , هێشتا کاتمان ماوە پێش هاوسەرگیریەکەت , لەوانەیە هەموو شتێک باش بێت , هەموو یەک شەممانێک دەچم بۆ (باغ) , بە بێغتیل بڵێ بێت بۆ ئەوێ و هەواڵی تۆم بداتێ.

چاوە تەڕەکانیم ماچ کرد و , توند لە ئامێزم گرت و پاشان ڕۆیشتم , شتەکان بۆ ماوەیەک بەم شێوەیە ڕۆیشتن: لینا هەموو کات نیگەران بوو بەڵام وورەی دەهێنایەوە بەر خۆی , منیش هەندێ کارم کرد لەملاو ئەولا بۆ ئەوەی هەندێ پارە بەدەست بێنم و ڕاویشم دەکرد.

ڕۆژێکی زستان گورگێکم ڕاو کرد و بردم بۆ سەرۆک شارەوانیی باغ , چونکە دەمزانی خەڵات دەدات بەوانەی کە گورگ ڕاو دەکەن , لە ڕاستیدا ٥ فرانکیان دامێ لە بەرامبەردا , نیوەی ئەو پارەیەم دا بە ژان وە نیوەکەی تریشم دا بە ئەنگوستیلەیەک بۆ لینا.

یەکشەممەی داهات و ئەنگوستیلەکەم دا بە بێغتیل تا بیدات بە لینا , ئەوش شێوازێک بوو بۆ ئەوەی لینا وورە لەدەست نەدات , بەڵام فێڵباز نیم , دەزانم کە شتەکان بە ئاسانی ڕێک ناکەوێتەوە.

**********

لەگەڵ ئەوەشدا کات هەر تێدەپەڕێت , کەشوهەوا خۆش بووە و ئێستا دەتوانم هەندێک پارە پەیدا بکەم بە کار کردنی ڕۆژانە لە چەند شوێنێک.

لەبەر ئەوەی چیتر گوێم لێنەبوو دەربارەی تۆنساک قسە بکرێت , وەک جاران ئاگام لەخۆم نەدەبوو کاتێک پیاسەم دەکرد یان کاتێک لەکار دەگەڕامەوە , ئەو هەستەم هەبوو کە نایەوێ تۆڵەی خۆی بستێنێتەوە , سەرەڕای ئەوە کاتێک باسی تۆنساکمان کرد ژان پێی گووتم :

– ئاگاداری خۆت بە , ئەو پیاوە هەموو شتێکی لە دەست دێت , وا خۆی دەردەخات کە تۆی لەبیر کردووە , بەڵام ئەوە بۆ ئەوەیە کە باشتر بتگرێت , زۆر فێڵبازە.

شەوێک نەمدەتوانی بنووم , چوومە دەرەوە پیاسەیەک بکەم پاشان لە بن دارێک دانیشتم , دڵتەنگم و بیر لە لینای بەدبەخت دەکەمەوە لە ماڵی خۆیان , یەکشەممەی ڕابوردوو توانیم قسەی لەگەڵ بکەم و هەموو ئەو شتانەی بۆ باس کردم کە دەبوو بەرگەی بگرێت , ئارەزووم دەکرد پێکەوە هەڵبێین بەڵام لەوە دەترسام کە زیاتر بەدبەخت و غەمبار بێت ئەگەر بماندۆزنەوە.

لە کاتێکدا کە بیرم لەو شتانە دەکردەوە , ڕێویەکم بینی نزیک دەبوّوە , دوای کەروێشکە کێویەک کەوتبوو ئاگای لە من نەبوو , ئەوەش بۆ من هەلێک بوو تا بیگرم , گرتم و کردمە ناو تورەکەکەمەوە و ڕۆیشتم.

کاتژمێر ٢ی بەیانیە و کەشوهەوا تەماویە , بە

خێرایی لەسەر ڕێگاکە ڕێ دەکەم , لە ناکاو قاچم لە گوریسێک گیرا کە لەسەر ڕێگاکە وەک تەڵەیەک نرابۆوە , بە درێژی کەوتم بە زەویدا , کاتێک من لەسەر زەویەکە بووم چەند کەسێک خۆیان فرێدایە سەرم و بە دەسرێک دەمیان بەستم , لە دواوە دەستەکانیان بەستم و پاشان قاچەکانم و ئینجا خستیانمە سەر پشتی ئەسپێک کە بە غاردان دەڕۆی , منیان فڕاند. دڵنیام لەوەی کە ئەمە کاری نۆنساکە , دەبێ چیم لێ بکات؟

دوای ماوەیەک گوێم لە دەنگی پێی ئەسپەکە بوو تێگەیشتم کە بەسەر پردێکی داریندا دەڕوات.

– ئەمە پردی کۆشکەکەیە , بە خۆمم گووت.

کەمێک پاش ئەوە منیان دابەزاند و بەسەر قادرمەیەکی بەرددا منیان برد , لە ژێر باڵمەوە گوریسێکیان برد , دەست بەجێ زانیم کە دامدەبەزێننە ناو بۆشاییەوە , دوای دابەزاندنێکی نزیکەی ١٠ مەتری بەر زەویەکە کەوتم و لەسەر زگ بە ڕاکشاوی مامەوە و پاشان گوریسەکەیان پچڕاند , گوێم لە دەنگە دەنگی پلێتە دارێکی قورس بوو کە کەوتە سەر بەردێک و هیچی تر.

من لە ناو زەویدا زیندانی کرام لە کۆشکی ئێغم , چیم لێ دێت؟ من لێرەم بێ ئەوەی بزانم چی بکەم , ناتوانم بجوڵێم , بیر لە لینای ئازیزم و ژان دەکەمەوە، ڕاستی کرد: نۆنساک هەموو شتێکی لەدەست دێت. توانیم بۆ ماوەیەک بەرەو رووی دیوارەکە دانیشم و بۆ ماوەیەک بەو شێوەیە مامەوە , ماوەی چەندە دەبێت من لەم کونەدام؟ برسیمە و هیچ ڕوناکیەک نایەتە ناو زیندانەکەمەوە , وا هەست دەکەم خەریکە دەمرم , بەڵام نامەوێ ئومێد لە دەست بدەم , ژان دوودڵ دەبێت بۆ من و دەڕوات بۆلای هاوڕێکانی بۆنال کە کەسانێکی گرنگن , بە دوامدا دەگەڕێن و ڕزگارم دەکەن.

کات تێدەپەڕێ و بێ هێز و ماندووم , زۆرم تینوە و ناچار دەخەوم , کاتێک خەبەرم دەبێتەوە چیتر نازانم لە کوێم , بەڵام پاشان هەموو شتێکم بە بیر دێتەوە , پێویستە کەمێک بجوڵێم ئەگەرنا جەستە لاوازەکەم لاوازتر دەبێت , دەستم کرد بە ڕۆیشتن لەسەر سنگ , کاتێک بەو شێوەیە دەڕۆیشتم دەستم لەسەر چەند شتێک دانا کە لە پارچە داری مردوو دەچوو , بۆ ماوەیەک دەستم دا لەو دارە و پاشان ڕاستییە ترسناکەکەم بۆ دەرکەوت: ئەوە پاشماوەی ئێسکی مرۆڤە.

– خودایە , ئەم چارەنوسەیە کە چاوەڕوانم دەکات , بە خۆم گووت بە بێ هیواییەوە.

لە ناکاو سەرم سوڕاو بورامەوە.

کاتێک دێمەوە هۆش خۆم , دەبینم لەسەر جێگایەکم و سوپی لە گیا و گۆشتی سوور ئامادە کراوم دەدەنێ کە تێکەڵە لەگەڵ شەراب و بە باشی گەرم کراوە , ڕووناکی ڕۆژەکە چاوەکانم ئازار دەدا , چاوەکانم داخست و پاش کەمێک چاوم کردەوە و ژانم ناسیەوە.

–ئەی لینا؟ من گووتم بە لاوازیەوە.

– ئاە باشە , دەیبینیت کاتێک باشتر بویت.

بە دڵێکی ئارامەوە خەوتمەوە , لە ماوەی چاک بوونەوەمدا زۆر جار باسی لینام دەکرد وە بە دڵنیاییەوە لە ژانم دەپرسی کە چۆن منی دۆزیوەتەوە , بۆی ڕوون کردمەوە کە بەیانییەک منی دۆزیوەتەوە لەسەر ڕێگایەک بە بێ ڕۆح , وە دەموچاو و دەستەکانم دیار نەمابوون لە خوێندا.

ڕۆژی دوای دیار نەمانەکەم , ژان چووە بۆلای هاوڕێکانی بۆنال , پاشان ڕۆیشتوون بە دوای پۆلیسدا , گوندنشینەکان کە بیسیتبوویان چیم بەسەر هاتووە , هەموویان دەمارگیر بوبوون دەیانویست بچن بۆ کۆشکی ئێغم.

لەگەڵ ژان گرەومان کرد کە کۆنت ترسی لێ نیشتووە

و پاشان بڕیاری داوه ئازادم بکات , ئارەزووی تۆڵە سەندنەوەم لە نۆنساک زۆر زیاتر بوو لە هەموو کاتێک , لە سایەی ئاگاداری ژانەوە پاش مانگێک چاک بومەوە.

دوای ئەوەی توانیم , یەکشەممەیەک چووم بۆ باغ تا بتوانم لینا ببینم , کاتێک گەیشتمە ئەوێ بێغتیلم بینی کە لە کەنیسە دەهاتە دەرەوە و بەرەو ڕووی من دێت.

لینا لێرەیە؟ لێم پرسی.

سەیری کردم بە غەمباری و سەرسوڕمانەوە.

– کەواتە تۆ هیچ نازانیت؟ لێی پرسیم.

– بەڵام چی بووە؟ خێرا بیڵێ !

–بە داخەوە ژاکووەکەم , تۆ چیتر لینا نابینیتەوە... ئەو مرد !

– ئای خودایە! من گووتم بە ناخێکی ڕوخاوەوە بە بیستنی ئەو هەواڵە.

بێغتیل منی برد بۆ دوورتر بۆ سەر لاڕێیەک و پاشان ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە ڕوویدابوو.

دایکی لینا دەیەوێت هاوسەرگیری لینا پێش بخات وە لیناش بەر هەڵستیی دەکات , دایکیشی کە شێتگیر دەبێت لە توڕەییدا هێندەی لێ دەدات لە هەموو کاتێک زیاتر.

– ئێوارەیەک کە دایکی زۆری لێ دەدات و ترسی لێ دەنیشتێت بۆیە لینا هەڵدێت بەرەو ماڵی ژان تا تۆ بدۆزێتەوە , بـەڵام کەسی لێ نابێت تەنها دراوسێیەکیان نەبێت , لینا سۆراغی تۆی لێ دەکات تا بزانێ لە کوێیت.

–ئاە! کچە داماوەکە! کێ دەزانێت ئەو لە کوێیە , وا سێ ڕۆژ و سێ شەوە کەس نەیبینیوە , لەوانەیە کوشتبێتیان و فڕێیان دابێتە ناو دەریاوە.

لیناش بە بێ هیوایی دەڕوات و خۆی فڕێ دەداتە ناو دەریاوە.

نەمتوانی چیتر گویم لەو شتانە بێت و هەڵهاتم بەرەو دارستانەکە , وەک شێتم لێ هاتبوو لە ئازاردا , خۆم فڕێ دایە بن دارێک دەستم کرد بە گریان بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێک.

ئێوارە هات و من گەڕامەوە بۆ ماڵی ژان و بێ نان خواردن چووم خەوتم.

لە دوای ئەو ڕۆژەوە دەستم کرد بە ڕۆیشتن بەرە و ئەو گوندانەی کە نزیکن لە کۆشکەوە بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ گوندنشینەکان بکەم , چونکە دەمزانی کە لە نۆنساک توڕەن , هەموو ئەو شتانەم بە بیر دەهێنانەوە کە نۆنساک بەرامبەر بە هەر یەکێک لە ئێمە کردبووی و ئازارمان چەشتووە بە هۆی ئەوەوە.

ئەوان هەموویان لەگەڵ بۆچوونەکانی من بوون بەڵام دەترسان , ئێوارەیەک پیاوێک پێی گووتم :

–ژاکووە داماوەکەم , تۆ باش دەزانیت کە باوکت ژیانی لەدەست دا لەبەر ئەوەی یاخی بوو دژی ئەم پیاوە چەپەڵە !

– گوێ بگرن , من پێم گووتن , هەموو گوند نشینەکان ناخەنە زیندانەوە تا لە ژێر کاری قورسدا گیان لەدەست بدەن , تەنها یەکێک باجی ئەوە دەدات , پێشەواکەیان: من دەبم بە پێشەواتان , من بەرپرس دەبم لە هەموو شتێک.

لەو جۆرە کێشانەدا دەبێت وریا بیت و ئاگادار بیت کە لەگەڵ کێ قسە دەکەی , بەڵام لێرەدا ترس نیە چونکە هەموو ڕقیان لە نۆنساکە.

بۆ ماوەی ٣ مانگ من قسەم بۆ ئەو خەڵکە کرد تا لە کۆتاییدا قایلم کردن , ڕۆژێک لەناو دارستانێک کۆ بوینەوە من چوومە سەر بەردێک و بەرامبەر ئەو خەڵکەی کە کۆبوونەوە گووتم :

–ئێوە بڕیارتان دا کە تۆڵەی خۆتان لە نۆنساکەکان بکەنەوە؟ تا هەتایە خۆتان ڕزگار بکەن لەم خێزانە گوورگە؟

- بەڵێ! بەڵێ! وەڵامیان دایەوە.
ئینجا بە ڕوو کردنە کۆشکی ئێغم منیش سوێندم پێ خواردن وەک چۆن دایکم سوێندی بە من خوارد.
- بمرن نۆنساکەکان !
- زۆر باشە هاوڕێکانم, ئێستاش بگەڕێنەوە ماڵەکانتان و خۆتان ئامادە بکەن, شەوێک سێ جار گوێتان لە دەنگی زوڕنا دەبێت و بە دوایدا گوێتان لە دانەیەکی تر دەبێت درێژتر لەوانی تر, هەر شەوێک گوێتان لەمە بوو, بە خێرایی لێرە کۆ ببنەوە.
کاتی تۆڵە سەندنەوە زەنگی لێدا, لەو کاتەدا لە یەک جیا بوینەوە, کوڕێکی گەنجی فێڵباز بەرپرس بوو لە چاودێری کردنی کۆشک.
ئێوارەیەک کە من و ژان کەمێک بوو لە نان خواردنی ئێوارە یەواو بوبووین, بینیمان ئەو کوڕە فێڵبازە هاتو گووتی :
- هەموو پیاوە باڵا دەستەکانی کۆشک ڕۆیشتوون, ئێستا تەنها کۆنت و کچەکانی و پاسەوانەکان و خزمەتکارەکانی لە کۆشک ماونەتەوە.
- ئاە, من گووتم بە هەستانەوە, لە کۆتاییدا ئەو ڕۆژە هات, کەمێک نان بخۆ و بگەڕێرەوە سەر پۆستی چاودێریەکەت لە نزیک کۆشک.
پاش کەمێک زەنگی ئاگادار کردنەوەم لێدا و پاش کاتژمێرێک هەموو بە پرچەک کراوی لەو شوێنەدا کۆ بوونەوە لە ناو دارستانەکە.
ئامانجی من هێرشکردنە سەر کۆشک بوو تا دەستی بەسەردا بگرم و پاشان بیسوتێنم بۆ ڕزگار بوون لەم خێزانە چەتەیە.
ڕۆیشتین و کەوتینە ڕێ بەبێ دەنگی, جارێک لەسەر ڕێگاکەی کە دەچوو بەرەو کۆشک چاومان بە کوڕە چاودێرەکە کەوت و پێی گووتین کە هەموویان لەناو کۆشک خەوتوون.
بەردەوام بووین و گەیشتینە بەردەم کۆشک, هەموو دەستیان کرد بە ڕاکردن بەرەو دەرگاکە و بە لێدانی داس دەرگاکەیان شکاند.
- بەرەو پیشەوە! من گووتم.
داسێکم گرت بە دەستمەوە و بەرەو قادرمەکان ڕۆیشتم و هەموو ئەوانەش کە لەوێ بوون دوام کەوتن, بە گەیشتنم بۆ قاتی یەکەم کۆنت و کچەکانی و ماسکخێم بینی بە جلی نوستنەوە و چەکیان بە دەستەوە بوو.
-ئاخ! چەتە! وام گوت و خۆم فڕێ دایە سەر کۆنت, هەوڵی دا چەکەکەی دەربهێنێت بەڵام من پەلامارم داو لێم سەند. وازی لە چەکەکەی هێنا.
هاوڕێکانم کچەکان و ماسکخێیان گرتبوو, ئەوانی تریش پاسەوانەکان و خزمەتکارەکانیان گرتبوو, هەستم دەکرد هاوڕێکانم زۆر توڕەن و خەریکە ناپاکی لەگەڵ دانیشتوانی کۆشک دەکەن.
- ڕاوەستن, ئێستا نابێت ئازار بە هیچ کەسێک بگەیەنرێت, من گووتم بە دەنگێکی سەرکووت کەرانەوە, بیانبەنە خوارەوە بۆ حەوشەکە.
هەندێ گوندنشینی تر لە حەوشەکە وەستابوون و منیان بینی کە هاتمە خوارەوە لەگەڵ نۆنساک, ژنێک بە پەلە ڕایکرد بەرەو ئێمە و داسێکی بە دەستەوە بوو.
- چەتەی چەپەڵ! کچەکەم شەرەفی لەدەست دا بە هۆی کوڕەکەتەوە, لەبەر ئەوەی کوڕەکەت لێرە نیە تۆ دەبێ باجی ئەو کارە بدەی !
کە گوێیان لەوە بوو, گوندنشینەکانی تر هاواریان دەکرد :
- بمرە! بمرە !
- ڕاوەستن! من گووتم, تا ئێرە بەسە هاوڕێکانم, باش ئامۆژگاریم کردوون, وا نیە؟
- بەڵێ! بەڵێ !
- بەڵام ژاکوو, تۆ لێرە لە هەمووان زیاتر دەبێ سکاڵا

بکەی , تۆ دایک و باوک و دۆستەکەت بەهۆی ئەوەوە لە دەست دا , ئەو ژنەی کە دەیویست نۆنساک بکوژێ بە هاوارەوە گووتی.
- بەڵێ ڕاستە , بەڵام کوشتن بە کەڵکی هیچ نایەت , پێویستە هەموو سامانەکەی لەناو بەرین , ئینجا تێدەگات لە واتـای برسێتی و ئاگر , ئـەوە تۆڵە سەندنەوەی ڕاستیە.
ئینجا هەموو هاواریان کرد :
- با کۆشک بسوتێنین !
پاش چەند خولەکێک کۆشک و دارستانەکەی ئێغم ئاگری تێ بەربوو , بۆ ماوەیەک لە ئاگرەکەم ڕوانی و پاشان بە هاورێکانم گووت :
- ئێستا دادپەروەری ئەنجام درا , واز لەو خەڵکە بهێنن با برۆن , ئینجا ئازار دەچێژن.
پاش ئەوەی کە وازمان لە کۆنت و خیزانەکەی هێنا , ڕایان کرد بۆلای نزیکترین سەرۆک کاری هاورێی کۆنت.
ئینجا من رووم کردە خەڵکەکە و گووتم :
-بیرتانە کە پێم گووتن من تاکە بەرپرسم لەم کێشەیە؟ ئەگەر پۆلیس هات پێی بڵێن کە من تاوانبارم بەرامبەر بە هەموو ئەو شتانەی ئەنجاممان داوە.
پاشان هەر یەکە و بە لایەکدا ڕۆیشتینەوە بەرەوماڵەوە.
بۆ بەیانیەکەی لە کاتی ڕۆژ هەڵهاتن زۆر بە توندی لە دەرگاکەیان دا , ژان هەستا و هاتەوە و گووتی :
- پۆلیسەکانن.
- پێیان بڵێ وا دێم , من گووتم.
خـۆم گـۆڕی و چـوومـە دەرەوە , دەستەکانیان بەستمەوە و منیان لەگەڵ خۆیان برد.
- سوپاس بۆ هەموو شتێک , ماڵ ئاوا ژان. من بە هاورێکەم گووت.

منیان برد بۆ (ساغلاد) و لەوێ مامەوە هەتا ڕۆژی دادگاییەکەم کە ڕێکەوتی ٢٩ی تەموزی ١٨٣٠ بوو.
نۆنساک و خێزانەکەی دژی من گەواهییان دەدا و بەڵام ئەوانی تر وەک هاورێکانی بۆنال بۆ بەرژەوەندی من قسەیان دەکرد , بە سەرەنجێکی کەمەوە گوێم بۆ قسەکانی داواکاری گشتی گرتبوو , سەرەڕای ئەوەی کە داوای مردنمی دەکـرد , پاشان باسی باوکم و کوشتنی لابۆغیی کرد.
من بیرم لە باوکم دەکردەوە , باوکیشم لەسەر هەمان کورسیی دادگایی دانیشتبوو پاشان لە زینداندا مرد , بیرم لە دایکم دەکردەوە کە لە ناو خانوویەکی ترسناکدا مرد , بیرم لە ئازیزەکەم لینا دەکردەوە کە بۆ هەمیشە لە ناو سەرچاوەی دەریاکاندا خەوت , وە ئێستا کە تۆڵەی هەموو ئەوانەم کردەوە دەتوانم بمرم , ناترسم...
- بەرێز (فۆنگغاڤ) قسەت هەیە , دادوەرەکـە گووتی.
ئینجا پارێزەرەکەم هەستا و دەستی بە قسە کردن کرد بە دەنگە ترسناکەکەی.
قسەی دەربارەی خێزانەکەم کرد , دەربارەی دۆخە سەختەکانی ژیانی دایـک و بـاوکـم , باسی ئەو شەرمەزارییانەی دەکرد کە بەهۆی نۆنساکەوە ڕوو بەڕوویان بۆتەوە , پاشان هاتە سەر منداڵیی من و باسی نەهامەتییەکانمی دەکرد کە بەهۆی نۆنساکەوە توشم ببوو , لەو کاتەدا کە قسەی دەکرد ڕوخساری دادگەرەکانم دەبینی کە دەگۆڕان :
ئەوان زۆر هێمن بوون بەڵام کاتێک پارێزەرەکەم باسی ئەو ٤ ڕۆژەی کرد کە لە کۆشک زیندانی کرابووم بە بێ نان بێ ئاو , لە ناو هۆڵێ دادگاکە بۆڵە بۆڵێک کە تورەیی پێوە دیار بوو بەرز بۆوە.
پارێزەرەکەم پرسی ئایا چۆن دەبێت تاوانێکی ئاوا ئەنجامدەرەکەی سزا نەدرێت , پاشان بەم ووشانە

کۆتایی بە قسەکانی هێنا :
- خەڵکانێکی ئـازای وەک ئەم پیاوەی کە لەبەر چاوتانە و ئازاری زۆری چەشتووە لەوانەیە لە لایەن دادگاوە تاوانبار بکرێن بەوەی کە کردویانە بەرامبەر بەو کەسانەی کە سەردەمانێکی زۆرە سەرکوتیان کـردوون , وە لەبەر ئـەوەی کە دادپــەروەری هیچ کاتێک لە بەرژەوەندی ئەوان نەبووە خۆیان دادوەریان ئەنجام داوە و ئەو مافەشیان هەیە , کەواتە جەنابی دادوەرەکـان داواتـان لێدەکەم کە ئەم پیاوە بەبێ تاوان لە قەڵەم بدەن ئینجا دادپەروەری بە رێکوپێکی ئەنجام دەدرێت.
پاشان بەڕێز فۆنگغاف دانیشتەوە لە ناو چەپڵە لێدانی خەڵکەکە و من بەبێ تاوان لە قەڵەم درام.
بۆ جاری یەکەم لە ژیانمدا هەستم کرد کە شتانێک هەن گـۆڕاون , کە ژیان خەریکە کەمێک ئاسانتر دەبێت بۆ ئێمەی هەژار.
گەڕامەوە تا لەگەڵ ژان بژیم , دڵم خۆشە بەوەی کە ئازادم بەڵام خۆشبەختییەکەم تەواو نییە چونکە بەردەوام بیر لە لینای ئازیزم دەکەمەوە.
کات تێپەڕی , بە ئاسانی کارم دەدۆزیـەوە لەبەر ئـەوەی دوای سوتاندنی کۆشکی ئێغم خەڵکەکە بەهایان دەزانیم , ئێستا خەڵکەکە ئارامن چونکە تۆنساک و خێزانەکەی بە یەکجاری هەرێمەکەیان جێ هێشت.
بانگێشتم دەکەن بۆ نانی ئێوارە یان بۆ خواردنەوە , هەست دەکەم کە بە هاوڕێ دەورە دراوم , بەڵام غەمباریم هەر بەردەوامە چونکە ناتوانم لینا لەبیر بکەم.
یەک شەممەیەکیان کە لە ڕادەبـەدەر بیرم لە لینا دەکـردەوە بڕیارم دا بچم بۆ بینینی بێغتیل تا لە بارەی هاوڕێکەمانەوە کەمێک قسە بکەین , لە نزیک ماڵی خۆیان دۆزیمەوە.

-چۆنی؟ باشی؟ بە بێغتیلم گووت.
- بە داخەوە ژاکووە داماوەکەم داماوی زۆرم چەشتووە لەو کاتەوەی تۆم بینیوە.
-کام بەدبەختیانە , بێغتیل؟
دایکم زۆر نەخۆشە و ناتوانێ لەسەر جێگاکەی بجوڵێ منیش بێکارم چونکە دەبێت ئاگام لێی بێت , وە (ئەغمەد)ە داماوەی دەستگیرانیشم کە سەرباز بوو لە ئەفریقا مرد.
- ئای بێغتیلی بەدبەخت , زۆرم بەزەیی پێتدا دێتەوە !
ئینجا بۆ ماوەیەکی زۆر دەربــارەی هــاوڕێ ون بووەکەمان قسەمان کرد هەستم کرد کە باشتر بووم.
کاتێک کە ڕۆیشتم پێم گووت یەکشەممەی داهاتوو دەتبینمەوە و هەندێ پارەت بۆ دەهێنم , چونکە دەمبینی کە خۆی و دایکی پێویستییەکی زۆریان بە پارەیە.
بە درێژایی هەفتە من کارم کرد و بڕیارم دا تا لە توانامدا بێت هاوکاری بێغتێل بکەم , یەکشەممەی داهاتوو چومەوە بۆ بینینی و هەموو یەکشەممەیەک بەم شێوەیە دەمبینی تا ٣ مانگ تێپەڕی.
ڕۆژێک کە سەیرم دەکرد بیرۆکەیەک هات بە مێشکمدا:
من بێغتیلم وەکو خوشکێک خۆش دەوێت , ناتوانم خۆشم بوێت وەک ئەوەی کە لینام خۆش دەویست , بەڵام هەردووکمان زۆرمان ئازار چەشتووە , بۆ یەک نەگرین و بەردەوام نەبین لە ڕێ کردن پێکەوە؟
لەو بارەیەوە هیچم پێ نەگووت , بەڵام ئەو بیرۆکەیە لە مێشکمدا هەر دەهات و دەچوو هەرکاتێک ئەوم دەدیت.
دایکی مرد , بۆ هەموو شتێک یارمەتی بێغتیل دەدەم , زستان هات و ڕۆیشت و پاشان کەشوهەوا خۆش بۆوە من هەر بەردەوام بووم لە بینینی بێغتیل , جار بە جار دڵخۆشتر دەبووم لەگەڵ ئەو , هەستم دەکرد بە

شێوەیەکی تر خۆشم دەوێت , دایکی چەند مانگێکە مردووە , ئینجا بڕیارم دا کە قسەی لەگەڵ بکەم :
- بێغتیل , پێویستە من و تۆ هاوسەرگیری بکەین ئەو ڕۆژانەی کە ماومانە لە ژیان لە نزیکی یەک بە ڕێی بکەین.
-ئـــۆە , ژاکــــوو! وەڵامـــی دامــــەوە , بـۆچـی نەهامەتییەکانمان کۆ بکەینەوە؟
- چونکە دەتوانین باشتر بەرگەی بگرین پێکەوە لە کاتێکدا کە یەکترمان زۆر خۆشدەوێت.
- ئەگەر تۆ بتەوێ منیش قایلم.
لەو کاتەدا دەستەکانی گرتم و باوەشی پێدا کردم.
دوای جەژنی لەدایک بوونی مەسیح هاوسەرگیریمان کرد , زۆر خۆشحاڵم چونکە چیتر تەنها نیم.

**************

من ئێستا پیرم , ژیانم لەگەڵ بێغتیل خۆش بوو , هەگیز بێکار نەدەبووین , ١٣ منداڵمان هەبوو , ئەوانیش هاوسەرگیریان کرد و بە هەمان شێوە منداڵیان هەیە , بێغتیلە باشەکەم ١٠ ساڵە مردووە و ئێستا لای کوڕێکم دەژیم لە ئێغم , من چیتر بە کەڵکی هیچ نایەم چونکە کوێرم , وە ڕۆیشتن و گواستنەوەم هەمیشە دەستێکم پێویستە کە هاوکاریم بکات , وە زۆر کات کچە بچوکە جوانەکەم (شاغلۆت) ئەوە دەکات , دەمبات بۆ شوێنێک بۆ بەر خۆر , لەوێ دەمێنمەوە و بیر لە ژیانی خۆم دەکەمەوە , بیر لەو کەسانە دەکەمەوە کە خۆشم دەوێن , بیر لەو شتانە دەکەمەوە کە کردومە , سوتاندنی کۆشک , یاخود وەک خەڵکانی ناو دادگا خۆم وەک گومان لێکراوێک بینی کە خۆم بە تاوانبار دانەدەنا.
لە گوندەکەدا خەڵکی منیان خۆش دەوێت و ڕێزم لێدەگرن , چونکە بۆ هەموویان من ئەو کەسەم کە ڕزگارم کردن لە کۆنتی ترسناک , لە ڕاستیدا دوای ڕۆیشتنی ئەو هەموو شتێک گۆڕا , خەڵکی دەیانتوانی زەوی بکڕن و خۆیان تەنها بە پارچە زەویەکی کشتوکاڵییەوە سەرقاڵ بکەن , ژیان بۆ ئەوان ئارامتر بوو , دانیشتوانی ئێغم بە تایبەتی شانازی بە منەوە دەکەن.
کاتێک چەند بەڕێزێک دێن بۆ سەردانی کۆشکە ڕوخاوەکە و پرسیار دەکـەن لەسەر ئەو بابەتە , وەڵامیان دەدەنەوە و دەڵێن :
- بڕۆ بۆلای ژاکـووی پیر ئەو هەموو شتێکت پێ دەڵێ لەو بارەیەوە و لە هەموومان باشتر مێژووی کۆشکەکە و دارستانەکەی ئێغم دەزانێت , چونکە ئەو بە سوتاندنی دان.
وە هەندێ جار دێن بۆ بینینم , منیش لەسەر بەردێکی گەورە لە حەوشەکە دادەنیشم و مێژووی خۆمیان بۆ دەگێڕمەوە , یەکێک لەو سەردانکەرانە کە دوو سێ جار هاتووە پێی گووتم کە چی دەڵێم وەک خۆی دەینوسێت , نازانم دەینوسێت یان نا , زۆر گرنگ نیە لەلام.
ژیانم خەریکە کۆتایی دێت , لەگەڵ کەس دوژمنایەتیم نیە , تەنانەت لەگەڵ خۆشم ئاشتم , ئەوانەی خۆم خۆشیان دەوێم , ڕێزم لێ دەگیرێ لە لایە هەمووانەوە , زۆر بە هێمنی لە دوای ئەو هەموو کاتەوە ماومەتەوە و چاوەڕێی مردن دەکەم.

سەرچاوە:
Jacquou le croquant [par] Eugene le Roy: Adapte en francias facile par Brigitte Faucard -Martmez

# چەردەیەک لە شیعری فیسوافا شیمبورسکا

شیعری: فیسوافا شیمبورسکا
و. لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد



## گفتوگۆ لەگەڵ بەردا

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکە ژورێ
دەمەوێت بخزێمە ناوتەوە
کونج و کەلەبەرەکانت بگەڕێم
لە هەناسەیەکدا هەڵت مژم

- بڕۆ لێرە -بەرد وادەڵێت
من زۆر قایم داخراوم
تەنانەت گەر پارچە پارچەیشم بکەن
پارچەکانیش قایم داخراون
تەنانەت گەر بکرێین بە لم
هەر کەس ناکەینە ژوورەوە

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکە ژورێ
من بۆ بازەڵەیی هاتووم
چونکە ژیان بۆ من
تاقە دەرفەتێکی گەڕانە بە ناوتا
تا دواتر فریا بکەوم
بەلای گەڵای درەختەکان و دڵۆپی ئاودا تێپەڕم
کاتم یەکجار کەمە، کەم
لە بیرت نەچێت من وەک تۆنیم

من مەرگم لەپێشە
- من لە بەردم -بەرد وادەڵێت
پێویستە سووربم لەسەر ئەمە
بڕۆ لێرە
من ماسوولکەی پێکەنینم نیە

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکەژوورێ
بیستوومە هۆڵی گەورە و خاڵیت تێدایە
نابینرێن، بێگومان جوانن
گەلێک هێور، بێ دەنگی پێی هیچ کەسێک
تەنانەت خۆیشت زۆری لێ نازانیت

- هۆڵی گەورە و خاڵی -بەرد وادەڵێت
بەڵام جێگای تیا نیە
ڕەنگە جوان بن،
وەلێ لە دەرەوەی هەستی هەژارانەی تۆدان
دەشێت بمناسیت
بەڵام هەرگیز ناتوانیت ئەزموونم بکەیت
هەموو ڕووکارم بەرامبەرتە
وەلێ هەموو ناوەوەم سەروبنە

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکەژوورێ
ناتکەمە مەنزڵی هەمیشەیی خۆم
من بەدبەختنیم
لانەوازیش نیم
دنیاکەم شایستەی بۆ گەڕانەوەیە
بۆ ئەوەیش بیسەلمێنم کە لای تۆ بووم
بە دەستی خاڵی دێمە ناوتەوە و

هەروایش دەگەڕیمەوە
بێجگە لە وشە چی تر لەگەڵ خۆم نابەم
کەسیش بڕوا بە وشە ناکات
- ناچیتەژوورێ -بەرد وادەڵێت
تۆ هەستی هاوکاری کردنت تیانیە
کە هیچ هەستێک جێگای ناگرێتەوە
تەنانەت هەستی بینینێکی قووڵ و بێ سنووریش
بێ هەستی هاوکاری کردن هەموو شتێک بێ سوودە
ناچیتە ژوورێ، تۆ دەتەوێت شتێک لەو هەستەت تیا بێت
ئەوە پەیوەندی بە خەیاڵدانی خۆتەوە هەیە

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکەژوووری
ناتوانم تا دوو هەزار ساڵ چاوەڕێ بم
بۆ ئەوەی بێمە ناوتەوە

- ئەگەر بڕوام پێ ناکەیت -بەرد وادەڵێت
بڕۆرە لای گەڵای درەخت
ئەوییش هەر ئەمەت پێ دەڵێت
بڕۆرە لای دڵۆپی ئاو
قسەی گەڵاکەت بۆ دەکات
بۆ دواجار پرسیار لە تاڵێکی قژی سەرت بکە
پێکەنین دەمکاتەوە، پێکەنین، پێکەنینی زۆر هەراو
کە نازانم پێی پێ بکەنم

لە دەرگای بەرد دەدەم
- منم، بمکەژوورێ
- من دەرگام نیە -بەرد وادەڵێت



# کۆمیدیا

ئەگەر فریشتەکان بوونیان هەبێت
گومان دەکەم چیرۆکی ئێمە بخوێننەوە
چیرۆکی نائومێدیەکان

دەترسم - بەداخەوە -
ئەوان شیعریشمان ناخوێننەوە
شیعری لەدنیا ناڕازی

هەراوزەنای شانۆگەریەکانمان
بێگومانم، شپرزەیان دەکات

فریشتەکان لەکاتی پشوویاندا
کە دەستیان لە کارەکانیان بەتاڵ دەبێت
تەماشای کۆمیدیاکانمان دەکەن
کۆمیدیای سەردەمی سینەمای بێدەنگ

فریشتەکان لەجیاتی گوێ گرتن لەوانەی ناڕازین
ئەوانەی تووڕەن
دەنگە بێزارکەرەکان
حەزدەکەن - بەڕای من -
لەو لانەواز و داماوە بڕوانن
کە باروکەی سەری خنکاوێک ڕادەکێشێت
تا لە خنکان ڕزگاری بکات
یان لە برساندا
قەیتانی پێڵاوەکەی خۆی دەخوات

لە کەمەر بەرەوژوور
بەروانکەیەکە پڕ لە شەوق و ئارەزوو
لە کەمەر بەرەوخوار مشکێکی تۆقیوە
لە داوێنی پانتۆڵەکەیدا
وای! بەڵێ.
ئەوەیە پێی دەڵێن ڕابواردنی تەواو.

ڕاونانی کەسێک لە بازنەیەکی بەتاڵدا
ڕاکردنە لە ڕاکردوو
ڕوناکی کۆتایی تونێلەکە
لە چاوی پڵنگێک دەچێت
سەد کارەسات
واتا سەد سەرمەقولات
بەسەر سەد هەڵدێردا.

ئەگەر فریشتەکان بوونیان هەبێت
- هیوادارم وابێت - پێویستە بڕوابکەن
ئەم شادمانیەی لە ترساندا لەرزی لێهاتوە
تەنانەت هاوارناکات: فریام کەون.
چونکە هەموو شتێک بە سانایی دەگوزەرێت

من وای بۆ دەچم
فریشتەکان باڵ پێکدادەدەن
فرمێسک لە چاویان دەڕژێت
هیچ نەبێت، ئەوکاتەی بە کوڵ پێدەکەنن.

# خۆشەویستی لە یەکەم نیگاوە

هەردووکیان لەوە دڵنیان
هەستێکی لەناکاو پێکی گەیاندوون
ئەم دڵنیا بوونە جوانە
بەڵام لەو جوانتر نادڵنیاییە
ئەوان بڕوایان وایە: چونکە پێشتر یەکتریان نەناسیوە
کەواتە هیچیان لەنێواندا نیە
لێ، ئەی شەقامەکان و نەردەوان و ڕاڕەوەکان
دەڵێن چی
ئەوساتانەی ژوانیان تێدا گرتوون؟



پێم خۆشە لە هەردووکیان بپرسم
ئاخۆ لەبیریان ماوە
لە پێچی دەرگایەکی خولاوەدا
ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕووبەڕوو بوبێتنەوە؟
داوای لێبوردن لەناو ئاپوورەی خەڵکیدا؟
یان دەنگی (ژمارەکە هەڵەیە)ی هەستەکی تەلەفۆنێک؟
- بەڵام من وەڵامەکەیان دەزانم
- نا، هیچیان لە یادنەماوە.

تووشی سەرسووڕمانێکی زۆر دێن
کە دەمێکە
بووکەڵەیەکی دەستی ڕێکەوتن

هێشتا ڕێکەوت ئامادەنیە

خۆی بە چارەنووسی یەکێکیان بگۆڕێت
نزیکی کردنەوە، دووری خستنەوە
ڕێگای پێ گرتن
پێکەنینەکەی خۆی خواردەوە
خۆی لە پەنایەکدا گرت.

نیشانە و ئاماژەگەلێک هەبوون
هەرچەندە نەدەخوێنرانەوە
لەوانەیە پێش سێ ساڵ
یان سێ شەممەی ڕابووردوو
گەڵای درەختێک
لە شانی یەکێکیانەوە فڕیبێتە سەرشانی ئەوی دی؟

شتێکی ون بوو دۆزرابێتەوە
کێ ناڵێت تۆپێک نەبوە
لە بێشەڵانی منداڵیدا؟
دەست گیر و زەنگی دەرکە بووبێت
دەستیان لە یەکێکیان دابێت و پاشان ئەوی دی
یان جانتای لە پاڵ یەکدا دانراوی ناو ئەنبارێک
ڕەنگە شەوێک بە هەردووکیان خەوێکیان دیبێت
لەپڕێکدا، لە ڕابووندا، خەونەکە توابێتەوە

هەموو سەرەتایەک
دەست پێ کردنەوەیە و چی تر نا
کتێبی ڕووداوەکانییش
هەمیشە لەسەر نیوەی کراوەتەوە.

# هیچ شتێک دووبارەنابێتەوە



هیچ شتێک دووبارەنابێتەوە
هەرگیز ئەوە ڕوونادات، بۆیە
کاڵ فامانە هاتینە دنیا و
هەروایش دەمرین

ئەگەر تەمەڵ ترین قوتابی ئەم دنیایەیش بین
وانەی چ زستانێک لە هاویندا ناڵێینەوە

هیچ ڕۆژێک خۆی دووبارەناکاتەوە
دوو شەو لە یەکتر ناچن
دوو ماچ وەک یەک نین
دوو نیگایش لە یەکدی ناکەن.

دوێنێ کە لەناکاوێکدا
یەکێک ناوی تۆی بە گوێدا دام
هەستم کرد گوڵێک
لە پەنجەرە کراوەکەوە فڕێدرایە ژوورەکەم

ئەمڕۆ کە تۆم لەگەڵدایت
ڕووم لە دیوارەکە کرد
گوڵ؟ ئایا گوڵ گوڵە؟ لەوانەیە بەردبێت؟

تۆ ئەی ساتە بەدەکە
بۆ بەبێ هۆ دەپەشۆکێیت؟
تۆ بوونت هەیە - کەواتە دەبێت تێ پەڕیت
تێ دەپەڕیت - جوانی لەمەیاندایە

پێدەکەنین و نیوە دەست لە ملانین
بەدوای ئاسوودەییدا دەگەڕێین
ئەگەرچی لەیەکدی جیاوازین
وەک دوو دڵۆپ ئاوی شیرین.



# کۆتایی و سەرەتا

دوای هەر جەنگێک
دەبێت یەکێک کاری پاک کردنەوە بکات
پاک کردنەوەکەیش
هەروا ناکرێت

دەبێت کەسێک
چیلکە و چەوێڵەکان
فڕێبداتە لارێ
بۆ ئەوەی گالێسکە پڕ لە تەرمەکان
بە ئاسانی تێپەڕن.

دەبێت کەسێک خۆی وەربداتە
نێو لیتە و خۆڵەمێش
نێو ورد و خاش بوەکانی تەختی نووستن
نێو وردە شوشە و
سیپاڵی خوێناوی

دەبێت کەسێک کۆڵەکەکان
بۆ ڕاگرتنی دیوارەکە ئامادەکات
کەسێک جام لە پەنجەرە ڕۆنێت
دەرگاکە بە ئەستووندەکانەوە ببەستێتەوە

ئەمانە هەموو بە جوانی وێنەیانی لێ ناگیرێت
پێویستمان بە چەند ساڵێکە
لەکاتێکدا گشت کامیراکان
بۆ شەڕگایەکی تر چوون

دەبێت پردەکان دروست بکرێنەوە
وێستگەکانیش هەروا
سەردەستی کراسەکان
کە زۆر هەڵکران زۆر دەدڕێن

کەسێک هێشتا یادەوەری خۆی دەگێڕێتەوە
گسکیشی بە دەستەوەیە
هەمیشە گوێ دەگرێت
بە ڕەزامەندیەوە سەرە نەبڕاوەکەی دەلەقێنێت
بەڵام لە نزیک ئەوانەوە
کەسانێک گینگڵ دەدەن
چونکە ئەو شتانە بێزاریی کردوون

هەندێک جار یەکێک
لەژێر دەوەنەکاندا
بەڵگە ژەنگ گرتوەکان دەردێنێت
پاشان بەرەو شوێنی سووتاندنی خاشاکیان دەکاتەوە.

ئەوانەی هۆکاری ڕووداوەکان دەزانن
پێویستە جێگا چۆڵ بکەن
بۆ ئەوانەی کەمی لێ دەزانن
بۆ ئەوانەی کەمترین لە کەم دەزانن
لەدواییشدا بۆ ئەوانەی هیچ نازانن

بەسەر سەوزە گیاکانەوە
کە بەسەر هۆکار و ئەنجامەکانەوە یەکسان ڕاوون
دەبێت یەکێک لەسەر پشت پاڵ بکەوێت
چڵێک گیا لەنێو دانەکانیدا بێت و
گێلانە لە هەورەکان بڕوانێت.

* سەرچاوە: دیوانی (کۆتایی و سەرەتا) وەرگێڕانی بۆ عەرەبی هاتف ئەلجەنابی.

فیسوافا شیمبورسکای شاعیر و وەرگێڕ و باسکار، لەدایک بووی ساڵی ١٩٢٣ی پۆڵەندایە. ساڵی ١٩٩٦ خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیی وەرگرتوە. بەرهەمی کەمە (نزیکەی دووسەد قەسیدە لەماوەی پەنجا ساڵدا) ڕەخنەگرە ئەدەبیەکانی پۆڵەندا بە گرنگترین دیاردەی شیعری پۆڵەندی سەردەم ناوی دەبەن کە بە زمانی سادە دەنووسێت و بیری قووڵ دەگەیەنێت. لە مانگی شوباتی ٢٠١٢ کۆچی دوایی کرد



# هێزە بنەڕەتییەکانی دراما دەروازە بۆ خوێندنەوەی نوێ دەکاتەوە

نووسینی: تریسا بێنەر
و. لە سویدییەوە: دانا ڕەوف

لە شانۆ ئینتیمەکەی ستریندبێری، «ئانا پێتەرشۆن» لە نمایشێکی باڵاو ناوازەدا، بە تەنها ئەکتەر و ریژیسۆرە، ڕۆڵی هەر سێ کارەکتەرەکە «ژولیا»، «ژان» و «کریستین» لە شانۆنامەی خاتوو ژولیادا دەگێڕێت و لە دیمەنی کۆتاییدا، بەوپەڕی تووڕەییەوە ناڕەزایی دەردەبڕێت.»١» بۆ چی پێویستە «ژولیا» کۆتایی بە ژیانی خۆی بهێنێت و خۆی بکوژێت؟»٢» بۆ چی «ژان» ئەو هەنگاوە نەنێت؟ ئەویش وەک «ژولیا» سێکسی کردووە، دەبووایە ئەویش بەهەمان شێوە بارێکی گران بووایە بەسەر شانییەوە؛ ئانا پێتەرشۆن، بەم شێوەیە گفتوگۆ لەگەڵ دەقەکە دەکات.»٣» ئەو وەک هاوگفتوگۆیەکی ئەمرۆ مامەڵە لەگەڵ شانۆنامە گرینگ و بەبایەخەکەی «ستریندبێری» دەکات، کە لە ساڵی ١٨٨٨دا



ستریندبێری

نووسیویەتی. «پێتەرشۆن» دەقەکەی بە شێوەی کتێب بە دەستەوەیە، لەگەڵ خۆی تاوتوێی دەکات و بە بەردەوامی ئاماژەی بۆ دەکات.»٤» هەندێک لەبەشەکانی دەخوێنێتەوە و دەیخاتە ژێر پرسیارەوە، دیمەنەکان پێشکەش دەکات و کارەکتەرەکان تاقی دەکاتەوە و لە هەمانکاتدا لەگەڵ بینەرەکانیدا لە پەیوەندییەکی چاپووک و خێراشدایە. «٥» کە دەقەکە بەم شێوەیە لەسەر شانۆ بەرجەستە بکرێت، لەهەمانکاتدا پەیام و هێزە بنەڕەتی و گەورەکانی دراماکەش، وەکوو خۆی بگەیەنێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئاوگۆست ستریندبێری «خاتوو ژولیا»ی وەک زنجیرە رووداوێک نووسیوە، کە تێدا فیگور و کارەکتەرەکان، بەشێوەیەکی سروشتی کاردانەوەیان بۆ ململانێکانی ئەمرۆمان دەبێت.»٦» ستریندبێری

بۆ خولْقاندنی کارەکتەرەکانی، بە ئاگاییەوە لە شێواز و فۆرمە کلێشەیی و تەقلیدییەکانی ئەو رۆژگارە دوور کەوتۆتەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە دەکرێت بەسانایی «خاتوو ژولیا» بەوپەری ئازادییەوە بگوێزرێتەوە بۆ ناو ژوورە مۆدێرنەکان و خۆی لە هەموو جۆرە بنەما کۆمەڵایەتییەکاندا دابڕێنێت و جیابکاتەوە.

هەموو نمایشێکی نوێی «خاتوو ژولیا» ڕەنگدانەوەی پەیوەندییە نوێیەکان، شوناس و سیستەمی داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانە، هەر لەبەر ئەوەشە هەموو ئەو نمایشانەی، کە لە وڵاتانی جیاوازی ترەوە پێشکەش دەکرێن، جێگای سەرنجن و پێویستە خوێندنەوە و لێکدانەوەیان بۆ بکرێت.

ئێستا دەتوانین «خاتوو ژولیا» لەسەر شانۆکانی ئەورووپا ببینین، بۆ نموونە لە خوێندنەوەیەکی رووسیدا، کە بەرێوبەری شانۆی شاوبینەی ئەڵمانی تۆماس ئۆستەرمایەر کاری ریژی بۆکردووە، لە بەریتانیا و لە وەرگێرانێکی تازەی پاتریک مابەر و ریژی ناتالی ئەبرەهامی، لە ئەڵمانیا بە شێوازێکی مۆڵتی - مێدیا و لە ریژی هونەرمەندی بەریتانی کاتچی میتچڵ و لیۆ وۆرنەر، هەروەها نمایشێکی فەرەنسی، لە نواندنی ئەستێرەی سینەما جولیا بێنۆچە لە یەکێک لە رۆڵ و کارە دەگمەنەکانیدا لەسەر شانۆ. تۆماس ئۆستەرمایەر «کە ئێستا لە فیستیڤاڵی دووەمی بێرگماندا، بە شانۆنامەی «شەیتانەکان»ی لاش نۆرێن بەشدارە» لە سەرەتای ساڵەکانی ٢٠٠٠ ەوە سەرکەوتنێکی گەورەی نێونەتەوەیی بە خوێندنەوە نوێ و هاوچەرخەکانی بە شانۆنامەی - ماڵی بووکەڵە - و - هێدا گابلەر - ی هێنریک ئیبسن بەدەست هێناوە. ئەم ریژیسۆرە رووداوەکانی ئەم شانۆنامە کلاسیکیانەی هێناوەتە پێشەوە و رەنگدانەوەی رۆژگاری ئەمرۆیان بە روونی پێوە دیارە. لەوێدا پاڵەوانە ئافرەتەکان؛ هێدا بەنموونە لە نێو تەڵەی زێدە رازاوەی دیزاینێکی مۆدێرن و دەستبڵاوییەکی زۆر و بێپایان و خۆشگوزەرانییەکی بێ گیان و ژینگەیەکی سارددا بەندکراون و بە تەواوی تاساون.«٧»

«خاتوو ژولیا» کەی تۆماس ئۆستەرمایەر لەسەر شانۆی نەتەوایەتی لە مۆسکۆ پێشکەش کراوە. شانۆنامەنووس میتچێل دێرنێنکۆڤ دەقەکەی ئامادەکردووە و رووداوەکانی هێناوەتە پێشەوەو لە شەوی سەری ساڵی ئەمرۆی مۆسکۆدا دایرشتۆتەوە. «ژولیا» کچێکی نازدار و بە دەمەوەدراوی ژەنەراڵێکی پێشووی دەزگای کەی، جی، بی KGB یە«٨» ئێستاش کەسێکی تازە دەوڵەمەندی گەندەڵە و لە ژیانێکی ماتەریالی و بێبایەخدا دەسورێتەوە و لە دەریای پارەدا مەلە دەکات. تۆماس ئۆستەرمایەر و سینۆگرافەکەی هونەرمەند ژان پاپێڵبۆم مەتبەخێکی سوپەر مۆدێرنیان دروستکردووە، لەو مەتبەخەدا کامێرایەکی فیدیۆ رووداوەکان بە شێوەیەکی زیندوو لەسەر شاشەیەک دەهێنێتە پێشەوە، هەر وەک ئەوەی کە ئەمە پرۆگرامێکی تیڤی چێشت لێنان و خواردن ئامەدەکردن بێت، ووردەکارییەکان دەخاتە روو.

لە رووسیایەکدا، کە ئەمرۆ مرۆڤ ئاژەڵەکانیان بۆ رازاندنەوە و جوانی، بە رەنگی زەق و جیاواز خاڵ کوتی دەکەن، لەم نمایشەدا بەباشی جێگای بۆتەوە. «ژولیا» خواردن بەدەمی سەگەکەیەوە، کە پەتێکی زیووینی لەملدایە و لە جانتایەکی قەشەنگی مۆدێرنی دیزاینی فەرەنسیدا، گرتوویەتی بە بەر سنگییەوە، تا بە شێوەیەکی توندوتیژی دراماتیکی، لە دوا دیمەنی شانۆنامەکەدا سەری لێبکرێتەوە.«٩» «ژان» کە لەووبەر لە «شێشان» سەرباز بووە، ئێستا یەکێکە لەو سەدەها شۆفێرە رووسییە تایبەت و شەخسیانەی، کە ئەمرۆ لە پشت سووکانی لانگرۆزەرەکانیانەوە، بە درێژایی چەندین کاتژمێر، بەبێ ئەوەی ماتۆری ماشێنەکانیان بکوژێننەوە، لە چاوەروانی ئاغاکانیاندان. «ژان» لێرەدا مرەمرێ ئەوە دەکات و خەون بەوەوە دەبینێت کە لە هندستان، ئەو شوێنەی رووسییە دەوڵەمەندەکان بە لێشاو گەشتی بۆ دەکەن، هوتێل بکاتەوە. بۆ ئەو مەبەستە بە دوای هاوکار و شەریکێکدا دەگەرێت، شەوی سەری ساڵیش ئەو شانسەی لەگەڵ «ژولیا» بۆ دەرەخسێت تا سەمایەکی بەهێزی لەگەڵدا بکات.



ئاهەنگەکە بە مۆسیقای جازی دونکە دونکە دەست پێ دەکات و لە دیمەنە پانتۆمایمە ناوازەکەی نێوان پەردەکانی تێکستەکەشدا، لە کاتێکدا خەڵکە مەست و سەرخۆشەکان ئاهەنگ دەگێڕن و مەتبەخەکە بە تەواوەتی بە بوتڵی فۆدگا، کاغەزی رەنگاوڕەنگی ئاهەنگگێران و پاشماوەی خواردن دەکەن بە تەویلە، مۆسیقاکەش بەردەوام دەبێت. «ئێڤگینی میرۆنۆف» یش بە پۆترێتە کز و هێمنەکەی خۆی بۆ «ژان»، وێنەی پیاوێکی دوای جەنگمان بۆ بەرجەستە دەکات، کە توندوتیژی و سەرکوتکردن و ئازارەکانی ئەو جەنگەی هەڵگرتووە. بەڵام ئێستا دەیەوێت لە دوای ئاشتییەوە لە دیاردە ناشارستانیی و ناشرینە شەڕانییەکانی هاوڕێ و هاوشانەکانی خۆی دوور بکەوێتەوە. چۆوپن کاماتۆڤا وەک «ژولیا» بەرهەمی چینێکی ئەرەستۆکرات، ئیمتیازپێدراو و ئەنانی وایە، کە هیچ شتێک لەبەرچاو ناگرێت. «ژولیا» هەرگیز فێری ئەوە نەبووە ڕەچاوی پێداویستییەکانی کەسانی تر بکات، هەر لەبەر ئەوەشە ئەو لەم بارودۆخەدا، پێویستی بەوە نەبووە، کە پێناسەی کەسێتی خۆی دەست نیشان بکات. «ژولیا» تا ئەم کاتە چارەنووسسازەی شەوی سەری ساڵ، بە ئازادییەوە، بەبێ ئەوەی خۆی هیچ هەڵبژاردنێکی بۆ بوونی خۆی هەبێت، لە نێو ژیانێکی زێدە رازاوە و خۆشگوزەرانی لوکس ئاسادا، بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک و ئامانجێک سوڕاوەتەوە. «ژان» بە «ژولیا» دەڵێت کە، لێرەدا مەسەلەکە سەبارەت بە سێکس نییە، بەڵکو سەبارەت بە دەسەڵاتە.

«ژولیا» لەگەڵ «ژان» ئەو دەرفەتەی بۆ دەڕەخسێت، کە دەسەڵاتی بەسەر ژیانی خۆیدا




هەبێت، بەڵام مانای ئەم هەست بەلێپرسیارێتی کردنە تووشی شڵەژان و پەشۆکانێکی تـەواو و هەڵچوونێکی شێتانەی دەکـات. «ژولیا» لە سەربەستی خۆی دەترسێت، بەڵام بە پێچەوانەوە کریستین لە بارودۆخێکی نایەکسانی سترکتوری دەسەڵات و هەژاری و هەروەها جاروبار دزیکردنێکی بچووک و بێبایەخیشدا لە خانەخۆیەکەی، هەست زیاتر بە ئاسودەیی و دڵنیایی دەکـات. تۆماس ئۆستەرمایەر بە شێوەیەکی تەواو هەر وەک «نورە» و «هێدا گابلەر» لەوە دەکۆڵێتەوە، کە چۆن چینی مامناوەندی لە بێتوانایی و دەستەوەستانیی خۆیاندا بەندبوون و توانای ئەوەیان نییە خۆیان لەو ئاکار و ڕەفتارە کۆمەڵایەتیانەوە دابڕێنن، کە لە باو و باپیرانەوە بۆیان ماوەتەوە. «ژولیا» دەبێتە «بیمبۆ»یەکی بێکرداری ئیفلیج،»١٠» کە تەنها بە پێڵاوە بەرزەکانییەوە سەرسم لێ ئەدات و ناتوانێت بڕوات بەڕێوە، نەک هەر ئەوە بەڵکو لەسەر پێگەی دەسەڵاتە لەرزۆک و نادروستەکەشییەوە دەکەوێتە خـوارەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە لەکاتێکدا بە نائومێدییەوە یاری بە دەمانچەکەی دەستی دەکات، دەبێتە جێگای مەترسی. «نـورە» ی تۆماس ئۆستەرمایەر لە دوا دیمەندا، بە شێوەیەکی دڕندە و خوێناوی «تۆرفاڵد»ی مێردی دەکوژێت،»١١» بەڵام لێرەدا «ژولیا» بە چەکەکەی دەستییەوە ڕواوڕوو لە «ژان» دەچێتە پێشەوە، بەمەش ڕووبەڕووی ئەو ڕووخان و کەوتنە دەبێتەوە، کە بە شێوەیەکی ڕاستی و ترسناک هەردووکیان دەگرێتەوە.

شانۆنامەنووسی ئینگلیزی پاتریک مابەر لە ستریندبێرییەوە ئەو هەست و هێزەی بۆ ماوەتەوە، کە چۆن بتوانێت زمانێکی توندوتیژ و درێژ و دیالۆگێکی بەهێز و خاوەن کردار بەکاربهێنێت. ئەم

نووسەره لە ساڵی ١٩٩٥ دا شانۆنامەی «دوای خاتوو ژولیا» دەنووسێت، کە بە تەواوەی شوێن پێی ستریندبێریی هەڵگرتووە، بەڵام ڕووداوەکانی هێناوەتە دوا ساڵەکانی جەنگی جیهانی دووەمەوە، واتە ساڵی ١٩٤٥، بە تایبەتی شەوی سەرکەوتنە گەورەکەی پارتی کرێکاران. لەم شانۆنامەیەدا باوکی «ژولیا» سەر بە پارتی کرێکارانە، ئەو سەمایەی لەگەڵ خەڵکیدا دەیکات بەرەو بیرکردنەوەیەکی نوێمان دەبات، بیرکردنەوەیەک سەبارەت بە یەکسانی نێوان چینەکانی کۆمەڵ. نمایشەکەی ناتالی ئەبراهامی لە بەهاری ئەم ساڵدا و لەسەر شانۆی Young Vic لە لەندەن، وەک درامایەکی سیاسی لە ڕوانگەی ڕیالیزمی دەست شۆرەوە، بە هاوشانی گۆرانییە باو و میللییەکانی ساڵانی چلەکانی ئەورووپاوە پێشکەش دەکرێت.»١٢» قژە زەرد و لولەکەی ناتالیا دۆرمێش و جگەرەکێشانەکەی بە چەشنی خانمی دیوەخانەکان لە بەرجەستەکردنی ڕۆڵی «ژولیا»دا، هەروەها بە جلە گوڵ گوڵییە درێژ و ئاودامانییەکەیەوە، وەک ئەوە وایە لە «خێزانی ئاشتۆن» ەوە وەرگیرابێت.»١٣» لە کاتێکدا ئەو بە خۆشی وێنەیەکی ڕۆمانسییانەی سۆسیالیزم و کرێکاران و ئاشتی پێکی هەڵدەدا، کەچی بەکردەوە بە شێوەیەکی بێباک و لە خۆبایی مامەڵەی کریستینی کارەکەری دەکرد. کاتێ یۆهان گاڵتەی بە جووتبوونی ئەوان «کرێکاران» دەکرد و ڕووی لە میش، وەک سوزانییەک، وەردەگێرا، ئەو خۆی بە خانمێکی بە ئەسڵ و فەسڵ دەزانی.

یۆهان لای خۆیەوە پەرۆشی ژیان بوو لە نیویۆرک. حەزی دەکرد لەوێ یانەیەکی شەوانە بکاتەوە و لە کۆمەڵگەیەکی یەکسانی ڕاستەقینەدا بژی. بەریتانییەکان لەکاتی شەڕدا لە بۆتەی یەکێتییەکی نەتەوایەتیدا دەژیان، پارتی کرێکارانیش لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەم یەکێتییە بقۆزێتەوە و بیکاتە ئامانجێکی سیاسی و ئەمەش هیوای لەلای خەڵکی دروست کرد. بەڵام ئەمە بەشێوەیەکی کۆنکرێتی ڕووبەڕووی چەندین کێشە بووەوە، بە تایبەتی لە کاتێکدا تاکی بەریتانی (ئیندڤید) لە نێو مێژووی سیستەمی چینایەتیدا مابوونەوە، دڵنیا نەبوون بە چ شێوەیەک و چۆن بەرجەستەی ڕۆڵە نوێیەکانی خۆیان، لەگەڵ یەکتردا بکەن. خوێندنەوەکەی ناتالیا ئەبراهام لە ناوەڕاستی زەمەنی گۆرانکارییەکاندا دووپاتی ئەم بارودۆخە نائارامە کۆمەڵایەتییە دەکاتەوە.

ڕیژیسۆری بەریتانی کاتچی میتچڵ، بە هاوکاری هونەرمەندی ڤیدیۆ و وێنەگر لیۆ وۆرنەر، یەکێک لە خوێندنەوە هەرە ڕادیکاڵە نوێیەکانیان بۆ خاتوو ژولیا کردووە. ئەم نمایشە تاکوو ئێستا چەندین پاداشتی گرینگی بەدەست هێناوە. ئەم دوو هونەرمەندە ئینگلیزە لە بەرلین، خاتوو ژولیاکەی خۆیان بە ئەڵمانی بۆ شانۆی شاوبینە بەرهەمهێناوە، ئەمساڵیش لە ستۆکهۆڵم بەشداری فیستیڤاڵی بێرگمان دەکات.»١٤»

کاتچی میتچڵ ڕەهەند و دیدی دەقە شانۆییەکەی هەڵگێراوەتەوە و لەبری «ژولیا» و «ژان»، ڕووداوەکانی لە مەتبەخەکەی کریستین و کارەکتەری کریستیناوە، کە ڕۆڵێکی لاوەکییە بەرجەستە کردووە. هونەرمەندی ئەڵمانی خاتوو جۆڵ بێو ڕۆڵی کریستین دەبینێت. ئەم ئافرەتە بێدەنگە کارەکەرە لە هونەر، دراما و تۆژینەوە و نووسینی مێژوودا بە تەواوەتی پەراوێز خراوە، بەڵام لێرە و لەم نمایشەدا لە چەقی ڕووداوەکاندایە. کریستین بەسۆز و خۆپێچاوە، وەکوو فیگورێکی ڤێرمەر،»١٥» بە پەرۆشییەکی زۆر و گەرمەوە، گوڵە هاوینەییەکان بۆ بەرگە سەرینەکانی



لێ دەکاتەوە، لە گەمە بێشەرمەکەی نێوان دەزگیرانەکەی و خانمی خاوەن زەوییەکە دەڕوانێت و لە ژووری تەنیاکەی کارەکەرییەکەیەوە، لە مەتبەخەکەوە گوێی لە شەڕ و دەمە دەمی نێوانیان دەبێت. ئەوە دونیا بچووکەکەی ئەوە کە کار و فرمانەکانی بەوپەڕی ڕێز و دڵسۆزییەوە جێبەجێ دەکات و ژیانی خۆی بۆ تەرخان کردووە، کە ئەوان بەوپەڕی بێ ڕێزییەوە پێی پیا دەنێن. کریستین هەست بەم بێڕێزییە دەکات و بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە، بە تەواوەتی بێدەنگ دەبێت. ناوازەیی ئەم کارەی کاتچی میتچڵ لەوەدایە ڕێگای بۆ گروپەکەی خۆشکردووە، کە ڕاستەوخۆ بەکامێرای سینەمایی وێنەی نمایشەکە بگرن، کە بە شێوەیەکی زیندوو، هاوتەریب لەگەڵ نمایشەکەدا لە سەر شاشەیەکی گەورە پێشان ئەدرێت. ئەمەش چەمکێکی مۆدێرنی هونەری ڕیژییە، کە ئەم هونەرمەندە لەووبەر لەگەڵ لیۆ وۆرنەر لە پرۆژەی (شەپۆلەکان) ی ڤیرگینیا وۆلف و (گەمژە) ی دەستەیۆڤسکی لە لەندەن لەسەر شانۆی نەتەوایەتی بەکاری هێناوە. «١٦»

کاتچی میتچڵ و لیۆ وۆرنەر پانتایی شانۆکەیان کـردووە بە ستۆدیۆی فیلم، چەند ئەکتەرێک لەم ستۆدیۆیەدا لە بەشی پێشەوەی شانۆکەدا، بەرامبەر بە مێزێک ڕاوەستــاون، کاریگەرییە دەنگییەکان دەخولقێنن یان وێنەی دیمەنەکان لە نزیکەوە دەگرن. لەپشت ئەوانیشەوە دیکۆری مەتبەخێک هەیە، کە بە شێوەیەکی کلاسیکی و بە چەشنی مەتبەخەکانی ساڵانی ١٨٠٠ ەکان ڕۆنراوە، لەگەڵ خولقاندنی ژینگەیەکی «هامەشهەی» یانەی هونەری ڕووناکی.»١٧»

بینەران لەلایەکەوە، بە شێوەیەک لە شێوەکان لە بارودۆخێکی دوورە و پەرێزیدان و بەهۆی هەموو بەکارهێنانی جۆرەکانی تەکنیک و کامێراوە خۆیان دەبیننەوە، میکرۆفۆن و ئێکسسۆارەکان بە بەردەوامی لەگەڵ نمایشەکەدا بەکار دەهێنرێت - لە هەمانکاتدا وەک لە بەشەکانی فیلمێکدا زۆر بە چڕی ڕووبەڕووی هەموو ژیانی کریستین دەبینەوە. وێنە نزیکەکانی دەستە سوورهەڵگەڕاوە قلیشاوە کارەکەرییەکەی، کە جگەری گوێرەکە چاک دەکات، لوتە چەورە بریسکاوییەکەی، تێروانینە ماندووەکەی و هەستە تێکشکاوەکەی، کە ئەو دەبینێت و دەزانێت «ژان» ی دەزگیرانی ناپاک بـووە - هەموو ئەمانە بە خـۆدا چوونەوەیەکی چڕ لـەلای ئەم کارەکتەرە دروسـت دەکـەن، کە دەروازەی چەندین بنەمای قووڵ بە ڕووی دەقەکەدا دەکاتەوە. سێ ئەکتەری جیاواز هەڵسوکەوت و جوڵە و سیناریۆکانی کریستین جێبە جێ دەکەن-




یەکێکیان هەندێک جار لە بەردەمی میکرۆفۆنێکی هەستیاردا دادەنیشێت و وەکوو مۆنۆلۆگێکی ناوەوەی کریستین، شیعرەکانی ئینگەر کریستنسەن دەخوێندێتەوە. «١٨» کاتچی میتچڵ و لیۆ وۆرنەر بەم کارەیانەوە بنەماکانی سینەماتۆگرافی و کۆمپۆسیشون بەباشی شیدەکەنەوە و چەندین دید و تێروانینی نوێ بە ڕووی شانۆدا دەکەنەوە، ئەم دوو هونەرمەندە لەم ڕووەوە کەوتوونەتە ژێر کاریگەری هونەری سینەمای ئینگمار بێرگمانەوە. «١٩» لە سەرەتادا «ژولیا» لە وێنەکەدا، لە نێوان «ژان» و کریستین، هەر وەک تەلیزمێک دەردەکەوێت. لە دیمەنێکی تردا کریستین بە تەنها لە پێشەوە، لە پشت چوارچێوەی شووشەی پەنجەرەکەیەوە راوەستاوە و سەیری دەرەوە دەکات، بەڵام «ژان» و «ژولیا» لە پشتەوە لە نێو حەزی یەکتریدا تواونەتەوە. کە کریستین دەنووێت، گروپەکە لە سەر شانۆ، بە ئاو و کاریگەرییەکانی هونەری رووناکی، لە دۆخێکی سرووشتیدا، زنجیرە وێنەیەکی فیلمی خەونە ئامێز دەخولقێنن. دەنگی سەر وێنەکان کە هونەرمەند گارێث فرای ئامادەی کردووە، «٢٠» بە هاوشانی مۆسیقایەکی چەلۆی زیندوو، کە هونەرمەندی مۆسیقی کڵاوی میلەر لە سەر شانۆکە و لە شوێنی تایبەتمەند و جیا جیادا پێشکەشی دەکات، بە درێژایی نمایشەکە ئامادەبوونیان هەیە، یەکەیەکی دینامیکیان دروست کردووە و کاریگەرییان بەسەر رەوتی ڕووداوەکانەوە هەیە. کاتچی میتچڵ بەم شێوەیە لە بەرجەستەکردنێکی نێزێک و ئینتیمی

لێکۆڵینەوەیەکی وردی سیکۆلۆژیای ئافرەتاندا سەرکەوتنی بە دەست هێناوە، ئەم ڕێژیسۆرە لێرەدا کارەکتەرەکانی دەقە شانۆییەکە بە چاوی ئەمرۆمانەوە دەخوێندێتەوە، لە هەمانکاتدا بەو تەکنیکە مەودا دوورەوە، بە شێوەیەکی لۆژیکی و بابەتییانە و فاکتە ئاسا هەموو شتە دەستکرد و نا سرووشتییە دراماییەکان بەرجەستە دەکات. ئەم نمایشە فرە میدیایەی کاتچی میتچڵ ئەکتەرەکانی لەو ساتەوەختەدا ڕادەکێشێتە ناو چالاکییەکی بە دەستوبردی ئەکتیفەوە، لە وێدا کارەکتەرەکانی بە هیچ شێوەیەک پشوو نادەن، بەڵکو بەردەوام ناچاردەکرێن خەریکی کامێراکان بن، ڕووناکی و دەنگ بۆ بە شەکان ئامادە بکەن یان کورتە حیواری ئاڵوگۆڕ پێکراو بۆ دیمەنەکان تۆمار بکەن.

هەروەها ڕێژیسۆری فەرەنسی فرەیدێرک فیزباچ لە نمایشی خاتوو ژولیاکەی خۆیدا ئەتمۆسفێرێکی لێوانڕێژ لە بێتەنایی و نائارامی لە ئێستا و لەم چرکەساتەدا دەخوڵقێنێت. لەم ئەتمۆسفێرەدا ژیان دەگوزەرێنرێت، خۆشەویستی و خەونەکان دێنەدی و دەبنە بەشێکی ئەو ژیانەی دەگوزەرێت. هەموو ئەمانە پێکەوە، بەوپەری خۆشییەوە لە شەوێکی درێژی بێ خەودا بەرجەستە دەبن. «ژولیا»ی جولیا بێنێوچە، «ژان» ی نێکۆلاس باچوۆد و «کریستین» ی بێنێدیکت سێڕاتی نوێنەری گەنجە فەرەنسییەکانی ئەمرۆن، بەرهەمێکی بێ ڕەگ و ڕیشەی میدیا کلتوری و بازرگانی شوێنە چێژ بەخشەکانی ئەم ئان و ساتەن، لەو شوێنانەدا، کە مرۆڤ بە هەموو ڕێگا و ستراتیژیەتێک لە









هەوڵی ئەوەدایە جێگا پێی خۆی بکاتەوە، خۆی پێشان بدات و ببینرێت. خانەوادە و فەرزەندەکانی ئەم کارەکتەرانە سەر بەنەوەی ساڵانی ١٩٦٨ -ن، ئەو نەوەیەی کە فێری ژیانی کۆمەڵگایەکی یەکسان بوون. «ژولیا» لەگەڵ کۆمەڵێک گەنج بەوپەری بەختیارییەوە سەمایەکی دیسکۆ ئاسا لەناو دارستانێکی سپیداری ڕووناک و پاکدا دەکات. دەیەوێت پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ «ژان» دروست بکات، بۆ ئەوەی خەمی هەڵوەشاندنەوەی مارەبڕییەکەی، کە لەماوەیەکی کورتی لەمەوبەردا ڕوویـداوە، لەبیر خۆی بەرێتەوە. قۆڵی کراسە رووتــە هەڵقلیشاوە ئاهەنگییەکەی، بەوپەری بێدەربەستییەوە دێتە خوارەوە، لە کاتێکدا زیاتر و زیاتر «ژان» دەبێتە جێگای سەرنجی و بەوپەری ئاڵۆشەوە، بە تێکەڵ بوونەوە گوێ لە چیرۆکە خودییە خەیاڵییەکانی دەگرێت. نێکۆلاس باچوۆد «ژان» ێک بەرجەستە دەکات کە جەستەی بە هۆی فشارەوە، لە نێوان پلە و پایەیەکی نزم و هەستی ژێر دەستەیی و پەرۆشییەکی زۆر بۆ پلە و پایەیەکی بەرز، گرژ و ڕەق بووە. «من بۆ ئەوە لە دایک نەبووم تا بکەوم» یان «گرمۆڵە ببم» وەک «ژان» لە وەرگێرانە فەرەنسییە ڕوونەکەی تێریَ سیندنیگ دا دەیڵێیت. «ژان» خۆی لە ستراتیژییەتێکی گەمەی ڕۆڵەکەیدا دەبینێتەوە، لەوێدا بە شێوەیەکی هۆشمەند بە دوای بنیاتنانی وێنەیەکی نوێی خۆیدا دەگەڕێت، بەڵام «ژولیا» لەم شەوەدا تا دێت زیاتر لەو وێنەیەی کە سەبارەت بەخۆی هەیەتی بەتاڵ دەبێتەوە. «ژولیا» لە









پڕ لـەوە تێدەگات کە هەموو بیر و بۆچوون و دیـدی ئەو بۆ ژیـان هی خۆی نییە، بەڵکو هی خانەوادەکەیەتی، کە ئەو هەر بەڕاستی خاوەنی هیچ پێناسێکی تایبەتمەندی خۆی نییە. هەستکردنی بە تەنهایی و لە پەراوێزدا مانەوەی، بە بەراورد لەگەڵ «ژان» و کریستین، بەتایبەتی لە دوا دیمەندا ئێجگار گەورە و ترسناکە. بەتایبەتی کە ئەوان («ژان» و کریستین) دەتوانن بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان، کریستین جگە لە کارەکەشی بەوپەری خۆشحاڵییەوە دەچێت بۆ کلێسا تا بڕوا پتەوەکەی بە خودا ڕازی بکات، ئەمەش جیهانێکی ئارام و ئاسوودەی پێ دەبەخشێت. خوێندنەوە ڕوون و شیکارییە ئەنالیتیکییەکەی فرەیدێرک فیزباچ (کە بەرهەمی فیستیڤاڵی ئەڤینیۆنی ساڵی ٢٠١١ یە، ئەم ساڵیش بە گەشتێکی ئەورووپی لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپادا نمایش دەکرێتەوە) لە هەموو ئەو نمایشانەی کە لێرەدا ئاماژەیان بۆ کراوە نزیکە لە تێکستەکەی ستریندبێرییەوە و بەوپەری دەست پاکییەوە مامەڵەی لەگەڵدا کراوە. لە هەمانکاتدا بە شێوەیەکی ڕەها و تەواوەتی مۆدێرن و سەربەم ڕۆژگارەمانە. زمانەکەی تا ئاستێکی باش هاوشانی زمانە فەڕەنسییەکەی ئەم سەردەمە و ساڵەکانی دوو هەزارە و جۆرە وشە و دەستەواژە و ڕستەی وای بەکارهێناوە کە نزیکە لە زمانی قسە پێکردنەوە، بە شێوەیەکی سەد لە سەدیش لەگەڵ زمانەکەی ستریندبێریدا نزیک و هاوتەرییە.



بە شێوەیەکی گشتی حیوارەکانی خاتوو ژولیا هەر وەک موشەک بە نێو ژوورەکەدا گڤەی دێت. ئەمەش بە تەواوەتی لەلای کاتچی میتچڵ رەت دەکرێتەوە و ئەو گرینگییەی پێ نادرێت، زیاتر لە پێناوی ئەوەی بینەران بە چاوێکی فرە رەهەندەوە تێی بروانن و هەڵوێستەیەک لەمەڕ بەرجەستەبوونی کارەکتەرەکاندا بکەن. دیدی ریژی و خوێندنەوەکەی کاتچی میتچڵ بە تەواوەتی پێچەوانەی خوێندنەوەکانی ستریندبیریە و جۆرە رەچە شکێنییەکە، لەوانەیە هەر لەبەر ئەمەش بێت کە ئەو زیاتر دەست پاک و نزیک بێت لەوەوە.

ئەوەی کە ستریندبێری لە (خاتوو ژولیا)ی دەوێت، جگە لە بەرەنگاربووبەوە و دابڕانێک زیاتر لە بنەما تەقلیدییەکان، کلێشە و کارەکتەرە جێگیر و ڕەگ داکوتراوەکان، هیچی تر نییە؟

سەرچاوە:

SvD, Understrecket. Dramatisk urkraft beddar for nytolkningar av Theresa Bener. ٢٠١٢

پەراوێزەکانی وەرگێر

١-ستریندبێری و ئاوگوست فالک، کە ریژیسۆرێکی ئەوکاتەی سوید دەبێت، لە ساڵی ١٩٠٧ دا شانۆی ئینتیم لە ستۆکهۆڵم دادەمەزرێنن. ستریندبێری شانۆنامەکانی گەمەی ژوور: باوبۆران، زەوی سوتاو، سۆناتای تارمایی، کەڵک و دەسکێشی ڕەش بە تایبەتی بۆ ئەم شانۆیە دەنووسێت. ستریندبێری لەگەڵ ئاوگوست فالک سەرپەرشتی شانۆکە دەکات، یارمەتی ریژیسۆر و ئەکتەرەکانی ئەدات و رێپۆرتواری ساڵانەی بۆ دادەنێت. شانۆی ئینتیم دوای چوار ساڵ، لە ساڵی ١٩١٠ دا بەهۆی تەنگەژەی ئابوورییەوە دادەخرێت و ناتوانێت بەردەوام بێت.

٢-ئانا پێتەرشۆن کە ژنە ئەکتەر و ریژیسۆرێکی دیاری سویدیە، خاتوو ژولیا لە نمایشێکی ناوازەدا، بە تەنها لەسەر شانۆی ئینتیم پێشکەش دەکات. نمایشەکە جۆرە مانیڤێستێکی هونەرییە و هەر خۆی ئەکتەر و ریژیسۆرە، تەکنیکی فیلم بەکاردەهێنێت و بە شێوازێکی دانسقە فیلم و شانۆ تێکەڵاو دەکات. زۆرجار ڕاستەوخۆ لەگەڵ بینەران دەدوێت و دەقەکەی ستریندبێری دەخاتە ژێر پرسیارەوە.

٣-ئانا پێتەرشۆن نمایشی خاتوو ژولیا لە زۆربەی وڵات و فیستیڤاڵە جیهانییەکاندا پێشکەش دەکات؛ تا ئێستا لە بولگاریا و مەکدۆنیا نمایش کراوە، بەم زوانەش بەرەو ئەمەریکا، ئەفەریقای باشوور، کۆریای باشوور و رووسیا دەروات.

٤-عەلی عوسمان یاقووب شانۆنامەی خاتوو ژولیای لە سویدییەوە کردووە بە کوردی و لە ژمارە (٣٠) زنجیرەی شانۆی بیانی دا لە دەزگای ئاراس، لە ساڵی ٢٠٠٩دا بڵاوکراوەتەوە.

٥-دیدی ئەم ریژیسۆرە ئافرەتە لە دووپاتکردنەوە و ناڕەزایی دەربڕینێکی تورەدا کۆدەبێتەوە سەبارەت بە خۆکوشتنی کارەکتەری ژولیا لە کۆتایی شانۆنامەکەدا. ئانا پێتەرشۆن چەمکێکی مۆدێرن و فەمێنستی بە دەقەکە دەبەخشێت و وەک ئافرەتێک ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێت لە ناچارکردنی ژولیا بە خۆکوشتنی، ئەو پێ وایە کە ژان-یش هێندەی ژولیا لەم گەمەیەدا تاوانبار و بەرپرسیارە و ئەوەی دەبێت بمرێت ژان-ە نەک ژولیا.

٦-ئاگوست ستریندبێری ١٨٤٩ - ١٩١٢ یەکێکە لە گەورەترین نووسەرەکانی سوید و بەرهەمەکانی وەرگێردراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی جیهان.

ئـەم نـووسـەرە بە شانۆنامەکانی ناوبانگێکی جیهانی و نێونەتەوەیی بە دەسـت هێناوە و گۆڕانکاری بنەڕەتی لە پرۆسەی هونەری شانۆ و شانۆنامەنووسیندا کردووە. ستریندبێری رابەری شانۆی ناتورالیزم بـووە، هەروەها یەکێکە لە نووسەرە رەچەشکێنەکان و لە بـواری شانۆی گوزارشت ئامێز و مۆدێرندا رۆلێکی یەک لایکەرەوە و گرینگی گێڕاوە. لە گرینگترین شانۆنامەکانی: باوک، خاتوو ژولیا، بـەرەو دیمەشق، خەونە نمایشێک، سۆناتای تارمایی، کەڵک، سەمای مەرگ، جەژنی هەڵسانەوە... تاد

٧ –تۆماس ئۆستەرمایەر یەکێکە لە ریژیسۆرە دیار و بەتواناکانی ئەڵمانیا، لە شانۆی (شاوبینە) لە بەرلین کاردەکات و کاریگەرییەکی دیـاری بەسەر شانۆی مۆدێرن و هاوچەرخی ئەورووپییەوە هەیە، وەک ریژیسۆری میوان لە زۆربەی شانۆ گەورەکانی ئەورووپادا کارەکات. ئەم ریژیسۆرە بە خوێندنەوە تازە و جیاوازەکانی بۆ شانۆی کلاسیکی، بە تایبەتیش خوێندنەوە نوێیەکانی بۆ شانۆنامەکانی هێنریک ئیپسن ناسراوە. یەکێک لە دیدی کار و پرۆگرامی ئەم ریژیسۆرە هەڵبژاردنی شانۆی کلاسیک و لە هەمانکاتدا نووسەرە نوێیەکانی ئەمرۆی ئەڵمانیا و ئەورووپایە. لەم رووەوە ئەم هونەرمەندە، چەندە کار لە سەر شانۆی کلاسیکدا دەکات، هێندەش بە گرینگییەوە دەڕوانێتە شانۆنامە نووسەکانی ئەمڕۆ و دەیانخاتە سەر شانۆ.

٨-KGB دەزگـای ئاسایش و سیخوڕیکردن و داپلۆسینی یەکێتی سۆڤیَتی جارانە، ئەم دەزگایە لە ساڵی ١٩٥٤دا دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٩٣دا بە بڕیاری سەرۆکی ئەوکاتەی رووسیا (بۆریس یەڵتسن) داخراوە. ئەم دەزگایە نزیکەی ٧٥٠٠٠٠ هەزار کارمەند (سیخوڕ)ی هەبووە و شانەیەکی ملێون کەسیش بۆ راپۆرت نووسین و سیخوڕیکردن بەسەر خەڵکی و تەنانەت ئەندامانی خێزانیشەوە. کەی جی بی KGB بەرپرسیارە لە گرتن، ئەشکەنجەدان، کوشتن، ونکردنی هەزارەها کەس لە یەکێتی سۆڤییەتی جاران، وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات و تەنانەت ئەورووپای رۆژئاواش.

٩ –مەبەست لەم «سەگە» ئەوەیە ئەم ریژیسۆرە لەبری هوزارە (باڵندە)کەی کە لە قەفەزێکدایە و ژولیا دەیەوێت ئەوکاتەی لەگەڵ ژان رادەکات و ماڵی باوانی بەجێ دەهێڵێت، لەگەڵ خۆی بیبات، بەڵام ژان بەمە قایل نابێت و لەبری ئەوە ملی هوزارەکە لێدەکاتەوە. لەم نمایشەدا لەبری ئەوە سەری ئەو سەگە دەبڕن.

١٠ –بیمبۆ بەو ئافرەتە قژ زەردانە دەوترێت کە گێل و نەفامن وتەنها روخسار و جوانی و رازاوەیی جل و بەرگیان مەبەستە و جۆرێکن لە کاڵایەکی سێکسی، بۆ ئەم مەبەستەش تەنها بە خۆپیشاندانی جەستەیانەوە خەریکن.

١١ –کارەکتەرەکانی شانۆنامەی (ماڵی بووکەڵە)ی هێنریک ئیپسنن.

١٢ –نـووسـەری ئینگلیزی جـۆن ئـۆزبـۆرن لە پەنجاکانی سـەدەی ڕابـردوودا، شانۆنامەی (بە تووڕەیی ئاوڕێک لە ڕابردوو بدەرەوە) دەنووسێت، ئەم شانۆنامەیە هاوارێکی تووڕە، راچڵەکینێکی توند و هەنگاوێکی نوێ بوو لە پەنجاکانی شانۆی ئینگلیزیدا. ئەم شانۆنامەیە دەرگـای بە رووی زۆربــەی شانۆنامەنووسەکانی ئەو سەردەمەدا کردەوە و جۆرە رێبازێکی شانۆیی خوڵقاند. دواتر رەخنەگرەکان ئەو بزوتنەوەیەی جۆن ئۆزبۆرنیان ناونا (ریالیزمی دەست شۆر) لەو رووەوەی هەموو وردەکارییەکانی ژیانی رۆژانـە و کۆمەڵگای تیا بەرجەستە بوو بوو.

١٣ –»خێزانی ئاشتۆن» زنجیرە درامایەکی

تەلەفزیۆنی ئینگلیزییە و لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧٢دا پەخشکراوە، ڕووداوەکانی زنجیرەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ١٩٣٨ - ١٩٤٥ لە شاری لیفەرپوڵ.

١٤ -نمایشی خاتوو ژولیاکەی کاتچی میتچڵ لە فیستیڤاڵی دووەمی ئینگمار بێرگماندا لە ستۆکهۆڵم دەبێتە جێگای سەرنج و ستایشی ڕەخنەگر، بینەر و هونەرمەندان و لە میدیاکانی سویددا بە هەند و گرینگیەوە مامەڵەی لەگەڵ کرا.

١٥ -یۆهانس ڤێرمەر وێنەکێشێکی بەناوبانگی هۆڵەندییە و لەسەدەی شانزەدا ژیاوە.

١٦-کاتچی میتچڵ داهێنەری ئەم فۆرم و شێوازەیە و شانۆی لە بارێکی تەقلیدی/ مۆدێرنەوە گوێزاوەتەوە بۆ توخمێکی فرە میدیایی و دروست کردنی شانۆیەکی تر و کردنەوەی دەروازەیەکی تر بە ڕووی هونەری شانۆدا. لەمەوبەر تەکنیکی فیلم و سینەما و فیدیۆ لە نمایشی شانۆیدا، لێرەو لەوێ بەکار هاتوون، بەڵام هیچ کەسێک بەم شێوازە چڕە و بەم تەکنیکە باڵایە سینەمای لە شانۆدا بەکارنەهێناوە. کاتچی میتچڵ شانۆ و سینەما تێکەڵاو دەکات و لە ڕوانگەی هونەرەکانی تریشەوە، مۆسیقا، تەکنیکی دەنگ، وێنەگرتنی سینەمایی و بە شێوەیەکی زیندوو و بەبەر چاوی بینەرانەوە هونەرێکی باڵا دەخوڵقێنێت.

١٧ -فیلهێلم هامەشهەی هونەرمەندێکی دانیمارکییە و لە ساڵی ١٨٦٤دا لە شۆپنهامن لە دایک بووە. ئەم هونەرمەندە زیاتر وێنەی پۆترێت، خانووبەرە، دیمەنی سروشتی و ئەندازەی ناوەوەی خانووبەرەی کێشاوە. فیلهێلم هامەشهەی لە بواری بەکارهێنانی ڕووناکی و دروست کردنی سێبەردا بەناوبانگە.

١٨ -شاعیرێکی دانیمارکییە، لە ساڵی ١٩٣٥دا لە دایک بووە و لە ساڵی ٢٠٠٩دا کۆچی دوایی کردووە. جگە لە شیعر ڕۆمان، شانۆنامە و وتاری ئەدەبی نووسیوە. لە ساڵی ١٩٧٨ەوە ئەندامی ئەکادیمیای دانیمارکی بووە.

١٩ -ئەم دوو هونەرمەندە سوودیان لە شێواز و تەکنیکە سینەماییەکەی ئەم هونەرمەندە گەورە سویدییە وەرگرتووە و بە ئاشکرا گاریگەری ئەویان بەسەرەوەیە.

٢٠ -واتە ئەو دەنگانەی کە ڕاستەوخۆ لەسەر شانۆ دەخرێتە سەر وێنەکان، هەر وەک سینەما.



# نووسەرانی نوبڵ

* لاش یلێنستێن
* بیۆرنشێرنێ بیۆرنسۆن
* نادیانێ گۆڕدیمێر



زنجیرەی: - نـــۆبێـلیـســـــــــتەکان
لاش یلێنستێن Lars Gyllensten*
نۆڤێلێك لە کتێبی: - "ئەفسانە مۆدێرنەکان، ١٩٤٩"
وەرگێڕانی: - دەزگای مەریوانی
بەسەرپەرشتی گۆران مەریوانی، ساڵی وەرگێڕان ١٩٨٤*

# هـــاوارێـــــــك

٢, ١٠

نزیکەی سێ بە چوار دەکات. بەرزیەکەشی، رەنگە خۆی لە دوو مەتر بدات. دوازدە کۆبیک (ئەندازەی قەوارە- وەرگێڕ) مەتر دەکات. ئەوجا نزیکەی مەترێکی خۆشمی لێدەرکەیت. دەکاتە دەوروبەری یازدە کۆبیک مەتر. تەختی خەوی لێدەرکەیت و ئاودەستخانەکەش. خۆ ئاودەستخانەکە لە هەمان وەتاقی نووستندایێ!

سیفۆنی ئاودەستەکەش هەم دڵۆپە دەکات و هەم ئاوی لێدەچێت. زۆر شەوان بەئەستەم خەوم لێدەکەوێت. بەڵام بۆ خۆشی، خۆ من بێگومان شتێکی ئەوتۆشم نییە ماندووم بکات. تەنیا ماندووم لێیان. لێ کوا خۆ ئەوە حیساب ناکرێت. بەهەرحاڵ ئەویش شتێکە بۆخۆی کە دێتە گۆرێ، شتێک ئاوەها وەک کەمێک هاودەمتە. تەنێ کاتێک مرۆڤ دەنوێت. بەڵام بێگومان خۆ ئێجگار نوستنیش ئەوەند گرینگ نییە. جا گەر خوای بکردبا و



لاش یلێنستێن

هەرچی چۆنێک بایا گڵۆپێک هەبایا! شەوان هێند درێژن.
دەنا شتێکی تریش هەیە ئەمن خۆزگەم پێدەخواست، ئەویش گەر بکرابا شووشەیەکی ئاسایی دەنێو ئەو دەلاقەیەدا بایا، نەک ئا ئەو شووشە تەڵخە، چەند خۆش دەبا بتوانیبا دەرەوەت ببینیبایا!
جا خۆ ناشکرێت مرۆڤ بزانێت. ئاخر کەوتۆتە سەر ئەوەی چی لە دەرەوە هەیە. بەڵام وابزانم تەنیا باخچەیەکە، رەنگە برێک درەختی تێدابێت و، ئاسمانێکیش بە هەورەوە. ئینجا حەزدەکەم ئا ئەوەم ببینابایا. وابزانم ئەو دەلاقەیە رووەو هەوای ئازاد و سەربەستە. رووناکی گەلێک بە هێزە سەرلەبەیانیان، کەچی دوایی کەم کەم تین و گوڕی نامێنێت. هەبێت و نەبێت رۆژ لێی دەدات. ئاخر تەنیا یەک شووشەی تەڵخکراو دەنێوانمدا رێگرە. ماوەیەک بوو وامدەزانی کە تەنێ یەک لای تەڵخ کراوە، ئەودەم وای بۆچووم کە دەشێت ئەوە دیوەکەی ناوەوی بێت. ئەی خۆ من دەستم پێڕاناگات تا دەستێکی لێبکوتم، بزانم چۆنە. ئیدی راوەستام و تفێکم بە روویدا هەڵدا، بەو نیازەی تفەکە ئەو تەڵخیە، گەر لە دیوی منەوە ئاوا تەڵخ بێت، رۆشنبکاتەوە، لێ بێ سوود بوو. جا هەبێت و نەبێت دەبێت دیوی دەرەوەی تەڵخ بێت.
ئەمن هەرگیز گوێم لە هیچ دەنگێک نەبووە کە لە دەرەوە بێت. جا یان ئەم دەرگایە تەواو دەنگبڕە، یاخود دەبێت لە دیوی دەرەوە هیچ شتێک نەبێت. ئەمن بۆ خۆم چاوم بۆ کونێکی سیحراوی لە دەرگەیدا گڕدا، ئەی چۆن، خۆ دەبێت شتێکی ئا لەوجۆرەی هەبا. جا یان ئەم دەرگە هیچ شتێکی نییە یان دەبێت بە شێوەیەکی زۆر شارەزایانە کوونە پەنهان بێت. ئەمن بۆ خۆم تاقیمکردۆتەوە بەوەی هەرجارەی دەستەسڕێک بکەم بە جایەکی

دەرگاوە. شەو و رۆژەی جارێک شوێنم دەمگۆڕی، تا تورەیان بکەم و بەجۆرێک بیانهێمە دەنگ، گەر رێکەوت و بەری کونەم گرت. ئیدی ئا بەو شێوەیە بیرمکردبۆوە شوێن کونە ئاشکرابکەم. بەڵام بە باش و خراپ شتێکی لێ سەوز نەبوو. جا یان ئەمانە زۆر زۆڵن یاخود، دەشبێت، هیچ کونێکی تێدا نەبێت یانەکە کەسێ نییە سەیربکات. چەندم حەز دەکرد کونێکی سیحراویم هەبایا. جا خوای دەکرد شوێن شەرەمەزاریش بایا، بەهەر حاڵ، خۆ دەبووە مایەی جۆرێک لە پەیوەندی. ناوکە سەمونێکی زۆری تێچوو، تا پێیەوە دەستەسڕەکەم بەولاو ئەولادا هەڵواسی. بەهەر حاڵ، جا چی بووە خۆ کەمێک سەرگەرمی کردم.

نا، لە هیچ جێگا و شوێنیکی تریشەوە گوێم لە دەنگی هیچ نەبووە. لە دەلاقەکەوە نا. بەلامەوە سەیرە. خۆ گەر رووبەڕووی هەوای ئازاد و دەشت و دەر بایا، هیچ نەبا گوێم لەدەنگی با دەبا، هیچ نەبا جار ناجارێک. یان تاقە باڵندەیەک. باڵندەیەک. دەنا هەمیشە ئاوها کش و ماتە. بێدەنگ. ئاخر هەر لەبەر ئەوێ کە من دڵنیانیم ئەو دەلاقەیە بەڕاستی رووەو ئەو دەشت و دەرە ئازادە بڕوانێت. ئەوجا ئەگەر ئەمەشم بۆ ساخ نەبێتەوە، ئەوە ئیتر هەر ناتوانم لێکیدەمەوە و حیسابی بکەم چۆن چۆنی دروستیان کردوە. دەشێت جۆرێک لە باخچە - گڵۆپ بێت. یان ریزێک شووشە بێت.

٤، ١٠

لە ژیانمدا لەوەو پێش بەتەنگ خواردنەوە نەهاتووم، وەلێ ئێساکونێ وانیم، بەتەنگەوە دێم. رەنگیشە هی خواردنەکە نەبێت بەڵکو ئەو شکاندنی بێدەنگیە بێت کە دەمی نانخواردنەکان لەتەک خۆیاندا دەیهێننە گۆڕێ. ئەدی ئێستا من کات بەسەر دوای نانخواردن و شەودا دابەشدەکەم. شەوێک و سێ ژەم لە رۆژێکدا. بەرچایی و قاوڵتی. بەشەو خەو بەوەوە دەبینم و بەرۆژیش داڵغە بەوەوە لێدەدەم کە داخۆ خواردنی ئەوڕۆ چی دەبێت. تا کاتم هەبێت ئیتر بەمەوە دەیکوژم.

ئێ باشە خۆ من هیچ سەرگەرمیەکی ترم نییە. بە شێوەیەکی گشتی. یەکەمجار کە حاڵی بووم هەلومەرج چۆنە زەندەقم چوو. لێ ئێستا بەلامەوە تابڵێێ کارێکی ئاساییە هەر وەک زۆربەی کارەکانی تر.

٥، ١٠

بێگومان من بیر لەوەش دەکەمەوە کە ئەمە پێکڕا بە کوێ ڕا دەگات. ئەو بێدەنگیە تۆقێنەرە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە رەنگە جۆرە دەنگانێکی تریش، ئیتر خوای دەکرد هەچ جۆرێک بن، هێند زیاتر تۆقێنەر بن.

٥، ١٠

رۆژانێک بوو وای بۆ دەچووم کە بارتەقایەک لە تەنیایی رەنگە وام لێبکات گەوەرەبم. وامدەزانی گەشەدەکەم و خۆم یەکلا دەکەمەوە، تەنێ بەمەرجێ گەر کاتم هەبا گوێم لە خودی خۆم بگرتابا. تەنێ بێدەنگی و گوێ هەڵخستن بۆ هەناسەی دراوسێکەت، کە لە پاڵ رەنگی ئەودا هێلانەی من دروستکراوە. هەر ئاوا بەو وشانەی کە لە کتێبی موتاڵاتی دەرەوەی قوتابخانەی میللیدا نووسرابوو. وەلێ ئێستاکونێ دەبینم چۆن

بێدەنگی و تەنیایی تەنیا بەتاڵم دەکەنەوە و پڕم دەکەن لە خامۆشی.
خامۆشیەکی نەک تەنێ بەکەیف و پشووبەخش بەڵکو پڕ هـەراو هوریا و ماندووکەر، کە هێند جارِستت دەکـات هـاوارت لێبەرزبێتەوە. وەک ئەوەی بە مێخێکەوە هەڵتواسن بۆ ماوەیەکی درێژ. خامۆشی و ترس.

٦, ١٠

ئـەورۆ دەبینم ئەوەند بە گرینگیەوە عەودالّی فرمانەکانی لەشم کە بەڕاستی تەنێ قەشمەریت پێدێت. بەدرێژایی سەرلەبەیانی چاوەڕوان بووم بزانم کەی تەنگەتاودەبم بچمە ئاودەستخانە. ئەوجا ئاوها لێی ڕادەمام و گوێم بۆ شلدەکرد تا بزانم، ها ئێستا نا توزێکی تر وەختێتی. جا خۆ بە دەیان شتی تریش هەن، کە دەشێت گەلێک خۆشتر بن خۆتی پێوە خەریک بکەیت، بەڵام گەر راستت دەوێت من وا سەرم کردبووە سەر ئەم کێشەیە دەمویست بە گشت بارێکدا لێکی بدەمەوە.

٧, ١٠

ئەم بێدەنگیە تابلّێی عەجیب و ئەنتیکەیە!
تەمەننای هیچ ناکەم ئەوە نەبێت ئەم بێدەنگیە کۆتایی بێت. ناشزانم گەر بتوانم دەڕۆستی بێم. خۆ من هیچ نەبێت هەوڵێکم دا لە ڕێی کونە ئەفسوناویەکەوە، کە دەشێت بوونی هەر نەبێت. ئەورۆ خۆمکرد بە مردوو، تا بزانم هیچ روو دەدات. بێجوولّە لەسەر تەختەکەم راکشام دوای ئەوەی رابووم بە زۆر خۆم ناچارکرد سەبر و ئارامم چەند سەعاتێک هەبێت. ئای کە ناخۆش بوو. دوای نیو سەعات هێندە شەکەت بووم، کە ئیدی تەنانەت بڕستم نەمابوو رێ لە خۆم بگرم و نەیەڵم رابم. جارێ کەمەر وگەردنم دایانە ژان. دوای ماوەیەک ژانەسەریش گرتمی. سەرباری ئەوەش هیچ شتێکم شک نەدەبرد، بتوانێت بیروهۆشم لە برسێتی دوور بخاتەوە. کەم کەم دەنووستم، لێ بە ئارامی و لەش سووکیەوە نا، بەڵکو ناڕەحەت و نیمە بێدار. بەڵام ئاخر خۆ هیچ روی نەدەدا. رەنگە بەدەم خەویشەوە خۆم جوڵانبێت. رەنگە نەمتوانیبێت تەواو هەناسەم ڕابگرم. رەنگە تەواوی کارەکە ملی بە ئاڕاستەیەکی هەڵەدا بردبێت.
ئەمن هەوڵمداوە گوێ بەم بێدەنگیە نـەدەم و فەرامۆشیبکەم. ماوەیەک خواخوام بوو، گەر بکرێت، سووووک و سادە کەمێ نەجاتم بێت لەدەستی و پشویەکەم پێدابێتەوە و ئیتر بیرم پێوەی مەشغوڵ نەبێت. بەڵام نەکرا. ئاخر هەر لەو پرسیارە دەچوو کە: - "دەتوانیت پێنج خولەک راوەستیت و بیر لە فیلێکی کەسک نەکەیتەوە؟" ئەمن هەوڵمداوە بیر بە خەستی لە شتێکی تر بکەمەوە. دەها خۆ هیچیش نیە لە ئارادا، کە ببێتە شوێن گرینگی پێدانی من. دوبـارە بە کورتی و موختوسەری دەیڵێمەوە ئەمن سەلماندنێکی جیومێتریسکیانەم (هەندەسیانەم) خستۆتە بەردەم، چی رووداو-و مێژوو هەیە، دوبارەمکردۆتەوە، معادەلە و حیساب و کیتابێک نییە سەرلەنوێ پێیدا نەچووبێتمەوە. لێ هیچ شتێک نەیتوانیوە تا کۆتایی خۆی راگر و بەرگەگربێت. ئیتر ئێستا بێ یان کەمێکی تر چی بکەم و بکۆشم ناکرێت مێشکم جەم بکەم و تەرکیزم لەسەر پێ رابگرم و ئاخری بیرێک یان دوو یان سێ لەمەڕ بێدەنگی خۆی قوتدەکاتەوە

و دەبێت دیسانەوە چاوەڕێی ئەوەبم کە چی ڕوودەدات.
لێ لە هەقیقەتدا تۆقێنەر نییە ، مەبەستم بێدەنگیە .
هیچ شتێک نییە کە نەکرێت تۆقێنەربێت.
یان دەکرێت وابێت، وا؟
نەخێر، بڕواناکەم توقێنەربێت. بەڵام خۆ ئەمە لەیەککاتدا هەم سەرسامکەرە و هەم دەردیشە.
ناخۆشە.

٨, ١٠
نەخێر، تۆقێنەرە.
ئەوڕۆکە دۆلکەکەم یەک لەسەر یەک دەکێشا بە تەختی خەوەکەمدا تا بزانم دەبیستم. لەناکاودا لە چاوتروکاندنێکی رەشکە و پێشکاویدا زانیم خۆ ئەوە منم، کەڕبووم، لە گوێچکەمدا یان لە مێشکمدا. بەڵام خۆ من گوێم لە دەنگی تەقە تەقەکە بوو.
ئیتر تۆقاندمی. یەکەم تەقە کە هەستا لە کاتێکدا دۆلکەکەم کێشا بە رووی تەختەکەدا موچوڕکێک بەدەنمی شەقکرد. ئیتر منیش ترسام، زۆر ترسام، هاوکات تەریقیش دەبـوومـەوە. نەخێر خێراو دەمودەست هەر بە ئۆتۆماتیکی تەقە تەقەکەم وەستان، هەر لەگەڵ لە تەختە بەرزبۆوە، بەوەی دەستم نایە بانی. وەک منداڵێکی تۆقێنراو دەستم برد بۆ دەمم. هێمایەکی ئاوها گەلحۆیانە!
دوایـی بینیم، هەر جوان دیـارە نەرڤۆیسبوم و خەریکم کۆنترۆڵم بەسەر خۆمدا نامێنێت. ئەوجا بۆ جاری دووەم بە خۆمدا شکامەوە و تەریقبوومەوە.
بەڵام تەقە تەقەکەم دووبارە نەکردەوە.

٩, ١٠
ئەوڕۆکە، تا کات بەسەر بەرم، هەوڵدەدەم شت بێنمەوە یادی خۆم. کەچی تەنێ بووە مایەی هێنانی یادگاری پڕ ژان و ئـازار، کە دەهاتنە سەر خوانی یادەوەریم. بیرەوەری بارودۆخی پڕ خەجاڵەتکێشی، بێسەلیقەیی، بێئەقڵی و بەدکاری تر.
بەدکاریەکان لە گشت شتێک زیاتر ئازارم دەدەن.

لەوەو پێش بڕوام وابوو، کە زۆربەی زۆری دڕندەیی و بێ ئیحساسی، کە من خۆمم قەرزبارکردوە پێیان، ڕێکوپێک لەو ساتە وەختەدا من کردومە لە ناهۆشیاریمەوە بووە. بەڵام ئێستا کاتێک جارەکی تر و دوبارە دەنێویدا دەژیمەوە دەبینم کە هەمیشە حاڵیبوونێک هەبووە لام کە ئەو کردەوانەی دەینوێنم بایی چەندن و قیمەتیان چەندە، یان تەقسیری کردەوەکانم، لە قەراری ناخمدا ئەودەم کارەکەم ئەنجامداوە. ناڵێم گوزارشێک، لێ بەهەر حاڵ تێگەیشتنێک، کە نیمە هەر بە نیاز پشتی خۆمم تێکردوە. یانی بابڵێین بە ئەنقەست. لەوەوپێش خەجاڵەتی دەبووم. و ئێستاکێ بەڕاستی ناتوانم تەنانەت ئەوەش بکەم. چونکی ناتوانم خۆم لە بێدەنگی بدزمەوە و فەرامۆشی بکەم. ئەو خۆی بەزۆر و زۆرداری بەسەرمدا دەسەپێنێت و نایەڵێت خۆم بەهیچی ترەوە سەرقاڵ بکەم.
جا ئەوە خوێنسارد و بەدئەخلاقم دەکات.
پێدەچێت تێکشکێنەریش بێت.
لە لایەکی تریشەوە رەنگە ئەمە بێت وای لێکردبم کە چاوم کردبێتەوە، تا بزانم من چۆن کەسێک بووم. من خۆم بەد بەکارهێناوە.

١٠, ١٠
نە بەباش نە بەخراپ، ئەو چەند شەوانەی پێشوو، چاوم نەچۆتە خەو.

١١, ١٠
من هەرگیز عاشقی کەس نابم. هەرگیز باسی خۆمم بۆ کەسێک نەکردووە. هەر بۆیێ تەنێ بووم و دائیمەش بێدەنگی دەوروپشتی تەنیوم. تەنێ شتێک کە گوێم بۆ رادێراوە خودی خۆم بووە. لە چاوانی ئەوانی تردا تەنێ رەنگدانەوەکانی خۆمم، هی زارم و تەوێڵم.

١٢, ١٠
دەکرێت ئێستا هەموو شتێک بقەومێت.!
ئەمڕۆ لەسەر تەختی خەوەکەم، سەر لەبەیانی دانیشتبووم و بیرم لەوجۆرە شتانە دەکردەوە، کە روویداوە و رووی نەداوە. شتێکی ئاسایی بوو. تەنێ بێدەنگی و بێدەنگی و بێدەنگی. و نیمە ئازاری ویژدانیش.
لە ناکاودا گوێم لە شتێک بوو — و جوانتر روانیم، قەیرێکە گوێبیستی شتێکم. وای بۆچووم کە دەنگی لێدانی دڵمە یان جیرەی تەختی خەوەکەیە یاخود سیفۆنی ئاودەستەکەیە. بەڵام هیچکام لەمانە نەبوون. بەردەوام، یەک لەدوای یەک. یەکەمجار گوێم، بێ ئەوەی گرینگیەکی وای پێبدەم، هەڵخست. بەڵام لە ناکاودا جوان و تەواو وئاشکرا حاڵی بووم.
ترپەی پێ بوو.
ترپەی پێی پاژنە و بنی پێڵاوێکی چەرم، جوان، بە رێک و پێکی بەر ئەو ئەرزە بەردرێژەی داڵانە درێژە دەکەوت. داڵان و ترپەی پێکان رووەو من دەهاتن. پلەی دەنگیان لە قوەتدا هەڵدەکشا.
هێند ترسام هێند ترسام. ئینجا حەپەساو و تۆقینیشم جوان و رێکوپێک لەگەڵ نزیک بوونەوەی ترپەی پێیەکەدا هەر هەڵدەکشا. بیرم جام بوو. تەنێ ترسێک کە تا دەهات زۆر و زۆرتر دەبوو تێی خورپیم. خێرا لەسەر تەختەکەم راستبوومەوە هەر دوو لاقم خستە سەر یەک و نام بە دیوارەکەوە. دەمزانی کارەساتێکی بێ سنور و نامرۆڤانە بەرێوەیە بقەومێت.
نەخێر ترپەی پێیان گەیشتە بەر دەرگاکەی من. لەوێندەرێدا وێستا. تەنێ چەند دێسیمەترێک لەمنەوە دوور.
ئەوجا شەق تێهەڵدان دەستیپێکرد. زۆر بەهێز. گەلێک بەهێز. بینیم چۆن دەرگاکە زرمەی لێوە هەستا. ورگیدا بۆ ناوەوە لێ کوونی تێ نەکەوت. گوێم لەدەنگی نوزەی، شێوە حەپینێکی بێکۆتایی هاوارێک بوو. مرۆڤانە بوو — نازانم. لێ بێ وچان. قیژە شێتانە، وەک ئەوەی بەدەم هەناسەدانەوە هەڵگەڕابێتەوە بۆ ناوەوە بەردەوام بوو.
لە ناکاودا گومانێکی وەحشەتناک گرتمی، دەستم راپسکان رووەو دەمم. لەوێدا هەستم بە بۆشاییەکی لەتوپەت و قەراخ رەق هەڵگەڕاو کرد. هەستم بەو هەوایەی کە وەک قیژە دەهاتە دەر کرد. هەستمکرد سەری قورگم دەلەریەوە.
حاڵی بووم. ئەوە من بووم دەمقیژاند. بەڵام بە ئەستەم هەستم پێدەکرد، هەرچەندە خۆ ئەوە منیش بووم دەمقیژاند.
ئەمن ناتوانم باس لەو هەستی لێوان لێوان لە

سوکایەتی کردنە بکەم، کە منی رایا. وام دەزانی سەگێکم دەقورسکێنم. تەریق بوومەوە. پێمخۆش بوو نەمێنم و وەلبم. تەریقبوونەوەم گەورەتر بوو لە تۆقینم، راستەوخۆ خەفەبووم. ئەوجا هەمدیسان قامکانم لە دەوری قورگ و زارم دا، تا خۆم دڵنیابکەم کە ئیدی هاوارناکەم.

چونکی بیستم کە هاوارەکە ماوە. قیژەکە مابوو. بەردەوام بوو، خۆی دەکوتایێ دەرێ، بە هەمان شێوە هەراسانکەرە ترسناکەکەی خۆی، وەک لەوەو پێش. هاوارەکە نەمرد، منیش نەمتوانی بیکوژم.

* لاش یوهان ڤیکتۆر یێلێنستێن Lars Johan Wiktor Gyllensten، لە دایکبووی ١٩٢١-١١-١٢ ستۆکهۆڵم، کۆچی دوایی ٢٠٠٦-٥-٢٥ هەر لە ستۆکهۆڵم.

یەکێکە لەهەرە هونەرمەند و زانستمەندە گەروکانی سوێد و دونیا، نووسەر، پزیشک، پرۆفیسر لە زانستی پزیشکیدا.

کوڕی کارڵ یێلێنستێن، بەڕێوەبەر، دایکی ئینگرید یێللێنستێنIngrid Gyllensten خوشکی توونسێتەرێ تویرێ رانگستروێم Ture Rangström.

لە کۆتایی ٤٠ کاندا بۆتە پزیشک، دکتۆرای لە پزیشکیدا لە غودەی دەرەقی و تیمۆسدا هێناوە، دوایش یاریدەدەری پرۆفیسۆر لە زانستی تەونەکانی لەش، هەر دوا بەدوای ئەو پرۆفیسۆر. تا ١٩٥٢ کە ئیدی بەتەواوی دەست لە پیشەکەی خۆی هەڵدەگرێت و خۆی تەرخانی نووسین دەکات. شایانی باسە بڵێین فرەگەلێک لە نوسەرە چاکەکانی دونیا دکتۆر بوون بە پێشە.

١٩٦٦ هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەندامی ئاکادیمیای زانستی سوید، کورسی ژمارە ١٤. لە ١٩٧٧/١٩٨٦ سکرتێری هەمشەیی هەمان ئاکادیمی. ئەندامی کۆمێتەی نۆبێل ١٩٦٨-١٩٨٧. ساڵی ١٩٧٩ هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەندامی ئەنجومەنی نۆبێل. نێوان ساڵانی ١٩٦٨-١٩٨٧ دەبێتە سکرتێری هەمان ئەنجومەن. ساڵی ١٩٧٥ هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەندامی ئاکادیمی پاشایەتی لە بواری زانستدا و....چەندەها ئاکادیمی و کۆمێتە زانستیەکانی تر. لێ ساڵی ١٩٨٩ واز لە ئاکادیمی زانستی سوید دێنێت دوای ئەوەی ئەندامان رێکناکەون چۆن بەرپەرچکاری فتوای کوشتنی، هاوڕێی نوسەریان، سەلمان روشدی لەلایەن رابەری رۆحی ئێرانەوە، ئایەتوڵڵا خومەینی، ببنەوە. یێلێنستێن دەستپێکەری ئەم کارە بوو. لەتەک چەند ئەندامێکی تردا. چەند ئارتیکلێکی لەمبارەیەوە لە رۆژنامە گەورەکانی سوید و ئاوروپادا نووسی، نووسینەکانی فەلسەفین. زۆربەیان خۆیان لە بوون، پرسەکانی وجود دەدەن.

گەلێک هۆگری فەیلەسوفی دانیمارکی، باپیری فەلسەفەی ئێکسیستێنسیالیزم، سورێن کیێرکێگارد-Sören Kierkegaard، هەمیشە لە نووسینەکانیدا دەگەڕێتەوە کن ئەو. مرۆڤدۆستێکی کەم وێنەیە. ئەمن لە دەقە وەرگێڕاوەکانی ئایندەدا دەگەڕێمەوە کن دانیمارک و نیشانیدەدەم کە چۆن هەندێک نوسەری ٩٠-کانی کورد راستەو خۆ ماڵی ئەم فەیلەسوفەیان، لە گەرمەی گەمارۆدانی رۆحی و خۆراکی کوردستاندا، بەڕاست و چەپدا، ئەنفالکردوە، گ. مەریوانی

**زنجیرەی: - نـــۆبێـلیـســـــــــــتەکان**
**{نوسەرانێك کە خەڵاتی نۆبێڵیان پێ بەخشراوە(١)}**
**نەرویژ: بیۆرنشێرنێ بیۆرنسۆنBjörnstjerne Björnson(٢)**
**وەرگێڕانی لە نەرویژیەوە: دەزگای مەریوانی، بەهاری ٢٠١٢**
**بە سەرپەرشتی گۆران مەریوانی**

# بـــــــاب

ئـــەو کـابـرایـەی، ئـەمـەی لێدەگێڕێتەوە، بەدەسەڵاترین کەسێک بوو لە قەزاکەی خۆیدا، ئەو نێوی تۆرد ئـــۆڤێرۆس بوو.. رۆژێک قیت و قنج، بە ویقارەوە لەبەردەم پرسگەی کڵێسای قەزاکەیاندا وێستا.

«کوڕێکم بووە«، رایگەیاند و، «دەمەوێت بە ئاوی پیرۆز باپتیستبکرێت.(٣)»

«ناوی دەنێیت چی؟»

« فین وەک بابم.»

«وەک باب و-باپیرانی؟»

ئەوان، خزمانی پیاو و ژنی ئەم کابرایە، وەک باشترین کەسانی گوندەکەی نێویان لەسەر زاران بوو.

«فەرمایشتێکی ترت هەبوو؟» قەشە هاتە پرسیار و کەمێک لە ئاسمانی ڕوانی.

جوتیارەکە هەڵوێستەیەکی بۆکرد.

«من دەمەوێت بۆخۆی، بە تەنیا بەئاوی پیرۆز باپتیسبکرێت» (٣)، ئەو گوتی.



بیۆرنشێرنی بیۆرنسۆن

«یانی رۆژێکی ئاسایی (٤)؟»
«هەینی داهاتوو، کاتی دوازدەی نیوەڕۆ.»
«فەرمایشتێکی ترت هەبوو؟» قەشە هاتە پرسیار.
«نا، دەها هیچ فەرمایشتێکی تر لە گۆڕێدا نییە«.
جوتیارەکە کەمێک کڵاوەکەی بادا وەک ئەوەی بڕوات. ئەودەم قەشە راستبۆوە.
«ئا دەزانیت چۆن، ئەمەش»، ئەوەی گوت و رێک بەرەوڕووی تۆرد رۆیشت، دەستی دەنێو دەستینا و چاوی دەنێو چاوی، «خودای میهربان، روحمێک بکات، ئەم منداڵە بۆ تۆ بکاتە بەرەکەت!»
شازدە ساڵ دوای ئەو رۆژە، تۆرد دەنێو ژوورەکەی قەشەدا قیتبۆوە.
«تۆ باش ئاگاداری خۆتی ها تۆرد»، قەشە هاتە گفت و ئاخر هیچ گۆڕانێکی وای لەودا نەبینی.
«دەی من هیچ گرفتێکیشم نییە«، تۆرد گوتی.
ئەوجا قەشە متەقی لێبڕا، دوای کەمێک لەوی پرسی: «دەی باشە فەرمایشتی ئەو ئێوارە وەختە چییە؟»
«ئەو ئێوارەیەی لەبەرخاتری کوڕی خۆم هاتوم، سبەی ئەو کۆنفێرم (٥) دەکرێت.»
«کوڕێکی ژیرە.»
«نامەوێت هەقی قەشە بدەم تا گوێم لێنەبێت سبەی چ ژمارەیەکی کۆنفێڕمی لەسەر کاشی کڵێسادا بە نسیب دەبێت.»
«ژمارە یەکی بەردەکەوێت»
«گوێم باش لێیە – ئەوەش دە ریاڵ هەقی ماندوێتی قەشە.»
«ئەوجا فەرمایشتێکی تر لە گۆڕێدا بوو؟» قەشە هاتە وەڵام و لە تۆڕدی روانی.
«نەخێر، ئەوجا چی دی لە گۆڕێدا نییە.» تۆڕد ئۆغریکرد.

هەشت ساڵی تر رابـورد، رۆژێکی دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵب لە دەرەوەی پرسگەی قەشە پەیدابوو، کۆمەڵێک پیاو بوون، تۆڕد پێشەنگیانی گرتبوو. قەشە روانی و ئەوی ناسیەوە: «بە کوڕگەلێکی رەند و قورسەوە ئەو ئێوارەیەی هاتوویت؟»

«دەمـەوێـت بەرگنامەی هاوسەرگیری بۆ کوڕی خۆم دەربێنم، ئەو کارین ستورلییێن، کچی گیودموند، ئەها ئا لێروکانێ وێستاوە، مارەدەکات.»

«جـا ئـەوە کچی دەوڵەمەندترین پیاوی قەزاکەیە.»

«بە قسەی خەڵکی»، جوتیارەکە هاتە وەڵام و بەدەستێکیشی قژی هەڵدایەوە بۆ سەرەوە. قەشە بۆ قەیرێک بێدەنگ بوو، پێدەچوو لە فیکری خۆیدا نوقم بووبێت، هیچی نەگووت بەڵکو ناوەکەی لەکن خۆی، دەنێو کتێبەکانیدا رێنوسکرد، کوڕگەلیش واژوویانکرد. تۆڕد سێ ریاڵی خستە بان مێزەکە.

«ئەمن تەنیا یەک ریاڵم گەرەکە«، قەشە گۆتی.

«بێگومان دەزانم، لێ ئەو تاقانەمە- پێمخۆشە باش بچێتە رێوە.» قەشە پوولەکەی وەرگرت «ئەوە سێیەمجارە بە کاری کوڕەکەت وابزانم دێیتە ئێروکانێ، تۆڕد.»

«ئیدی کارێکم بـەوەوە نـەمـاوە«، تۆڕد گووتی، جزدانەکەی قەدکرد، ماڵئاوایی کرد و بەرێکەوت. کوڕگەلیش بە کاووخۆ بە دوایدا.

چواردە رۆژ دوای ئەم رۆژە باب و کوڕ، لە رۆژێکی پڕ خۆش و سایەقەدا کە با ئارامە سەوڵیان بەرووی ئاودا لێدەدا بەنیازی چوونە کن ستولییێن تا لەمەڕ زەماوەند رێبکەون.

«ئەو تەختی دانیشتنە لەژێرمدا جوان چەسپ نـەبـووە«، کـوڕ ئـەوەی گـووت و رابـوو تا تەختەکە لە جێی خۆی جوان چەسپبکات. ئا لەودەمەیدا، ئەو تەختەی لەسەری وێستاوە، هەڵدەبەزێتەوە و دەخلیسکێت، هەر دوو دەستی بە هەوادا بڵند رادێت، هاوارێکی لێ بەرز دەبێتەوە و دەکەوێتە نێو ئاوی.

«ئـەو سەوڵە بـگـرە!» بابی هاواریکرد، بڵندبوو، سەوڵەکەی درێژکرد. لێ کوڕ دوای ئـەوەی دووجـارێـک تەکانی خـوارد و باڵی مەلەی هاویشت، ئیدی زەپ و رەقبوو.

«کەمێ بوێستە!» بابی گازیکرد و سەوڵی بەدوایدا لێدا. ئەودەم کوڕ بە گازی پشتدا وەردەگەڕێت، قەیرێک لە بابی جوان دەڕوانێت — و نووقم دەبێت.

تۆڕد بەهیچجۆرێک نایەوێت، بەوەی دەبینێت، بڕوابکات، بەلەمەکە بێجووڵە رادەگرێت و لەو پەڵەیە دەڕوانێت، کە کوڕی تێدا نووقم بووە، وەک ئەوەی جارەکی تر بێتەوە سەر ئاوێ. تا ئەو دەمەی چەند بڵقێک بەردەوام دەهاتنە سەرێ، ئەها چەند دانەیەکی تریش، ئەوجا ئەوەتە تەنیا بڵقێکی گـەورە، کە تەقی — و ئیدی دەریاچە جارەکی تر وەک ئاوێنەی ساف و بێگەردی لێدێتەوە.

خەڵکی سێ ڕۆژ و سێ شەو بابیان بە سەوڵ لێدانەوە لە دەوروپشتی پەڵەکە بینی، بێ ئەوەی هەق بەخۆی بدات کە کەمێک چاوی بچێتە خەو یان خۆراکێک بخاتە سەر زاری، هەر عەودالی دۆزینەوەی کوڕە بوو.
سەر لە بەیانی ڕۆژی سێیەمین کوڕەی دۆزیـەوە و کوڕەی هەڵگرت و بەسەر ئەو گردانەدا بەرەو کێڵگەکەی خۆیان گەڕایەوە.
دەشێت دەوروپشتی ساڵێک بەسەر ئەم ڕۆژەدا گوزەری کردبێت. ئەودەم، ئێوارەیەکی درەنگی پایزە، لە دەرگای سەر دالانەکەوە قەشە گوێی لە دەنگی هاتوچۆی کەسێکە، کە بە ئەسپایی دەست لە قفڵی دەرگاکە دەکوتێت، قەشە دەرگا دەکاتەوە، پیاوێکی ڕەقی درێژ، پشت چەماوە، لاغری موو سپی وەژوور دەکەوێت. قەشە قەیرێکی تەواو، پێش ئەوەی بیناسێتەوە، لێیدەڕوانێت، تا دەزانێت ئەمە خۆ تۆڕدە.
«بەو درەنگە وەختەی هاتوویت؟» قەشە ئەوە دەڵێت و بێدەنگ لەبەردەمیدا دەوێستێت.
«بـەڵـێ، وەیـێ، درەنگانێک هـاتـووم»، تۆڕد ئەوە دەڵێت و دادەنیشێت. قەشەش ڕۆدەنیشێت، وەک ئەوەی چاوەڕێیی بکات، ماویەکی باش بێدەنگیە. ئەوجا تۆڕد دێتە پەیڤین: «ئەمن چشتێکم لەتەک خۆمدا هێناوە، گەلێک حەزدەکەم بیدەم بەو هەژار و نەدەرانە، یانی چشتێک وەک بەخشینێک، بۆ خاتری کوڕەکەم و نێوی کوڕەکەشم هەڵبگرێت.»
هەڵدەستێ و چەردەیەک پارە دەخاتە سەر مێزەکە و ئەوجا دادەنیشێتەوە. قەشە پارەکان دەبژێرێت.
«پارەیەکی ئێجگار زۆرە«، قەشە دەڵێت.
«هـەقـی نـیـوەی کێڵگەکەمە، ئـەوڕۆکـە فرۆشتم.»
قەشە قەیرێکی زۆر بێدەنگ دادەنیشێت، دواجار، بە میهرەبانیەوە دەپرسێت:
«ئەوجا لەمەودوا نیازتە چ بکەیت تۆڕد؟»
«چشتێکی باشتر.»
قەیرێک ئاوها دانیشتن، تۆڕد چاوی بڕیبووە زەمین، قەشەش جوان لەوی دەڕوانی. ئەودەم قەشە بەدەنگێکی کپ و هێواش گوتی:
«ئێستا وای بۆدەچم، کوڕەکەت ئاخری لە بەخشندەگیدا بەر ڕەحمەتی تۆ کەوت.»
«بەڵێ، ئەمنیش خۆم وای بۆ دەچم»، تۆڕد ئەوەی گوت و بڵند ڕووانی، دوو فرمێسکی قورسیش بەسەر ڕوخساریدا داکەوتن.

(١) پێشەکی وەرگێڕ:
قوتابخانەکانی وەرگێڕان زۆرن. فۆرم بەشێکی گرینگی هونەرە. پشتگوێ خسنی فۆرم گوێ پێ نەدانە بە ناوەرۆک. ئەمن لە دەقی ئەم وەرگێڕانانەدا؛ کە لەمەودوا دەیبینن، تا بکرێت و بلوێت نزیک مەتنە ئۆرجیناڵەکە دەکەوم و خۆم لەوە دەپارێزم کە ماکێکی «کوردی» بدەمە وەرگێڕانەکان. ئەوجاش هەوڵدەدەم

«وەرگێڕانەکە« تا بکرێت «کوردی» بێت. بێگومان ئەمە کارێکی سەختە. لێ ئەمن دەمەوێت گشت دەقێک، تا بکرێت، هەناسە و ماکی وڵاتی یەکەمی خۆی، ڕێزمان، ڕستەبەندی، تەکنیک...تاد لە دووتۆی خۆیدا، بە شێوەیەک لە شێوەکان، هەڵبگرێت. ئەمن ئامانجی سەرەکیم، سەرباری ئارەزووی دونیای هونەر ناسین، ئەوەیە کە ئەم مرۆڤانە چ بەرگ و فۆرمێکیان لەبەردابووە پێش ئەوەی بچنە کن بەرگدروویەکی کورد! چۆن بە شاڵ و کراسی ئاودامانی کوردیەوە دێنە پێشچاوان! ئەوە لێیدەگەڕێم بۆ خوێنەران.

(٢). بیۆرنشێرنێ بیۆرنسۆن Björnstjerne Björnson، لە خێزانێکی قەشە لە نەرویژ لە ١٨٣٢-١٢-٠٨ هاتۆتە دونیاوە لە ١٩١٠-٤- ٢٣ کۆچی دوایی کردوە. شاعیر، ڕۆژنامەوان، نوسەر، دراماتیکار و سیاسی بووە. لە تەمەنی ٥ ساڵیدا دەگوێزنەوە بۆ گوندەکانی سەر کەنار دەریا Nesser لە دەڤەری Romsdalen. لەوێندەرێ سروشت و ژیانی مرۆڤەکانی، بەتایبەتی جوتیاران دەبنە هەوێنی هونەری ئەو. سێهەم کەسە، ١٩٠٣، کە خەڵاتی نۆبێڵی پێدەبەخشرێت. هاودەمی ئۆگۆست ستریندبێری سویدی و هێنریک ئیبسنە لە نەرویژ. گەلێک لە بەرهەمەکانی لە وڵاتانی زمان ئاڵمان ناوبانگیان پێش سکەندەناڤیا و نەرویژ پەیداکردوە. ساڵانێکی زۆر لە دەرەوەی وڵات ژیاوە، فەڕەنسا و ئیتالیا، هەر لە دەرەوەی وڵاتیش سەردەنێتەوە. بەرهەمی، بە ڕستەی کورت، تیژبڕ، بەواقیعی قورس و گران موتوربەکراوە، ئامادە نەبووە نووسین بکاتە قوربانی ڕێزمان؛ ئەم تۆڤلێتە لە هەڵبژاردنی شاکارەکانی ئەوەوە وەرگیراوە.
گ. مەریوانی

(٣). باپتیستکردن بەرامبەر بە بانگ بە گوێدانی ئاینی ئیسلامە لای کریستیانێکان.

(٤) ئەودەم تەنێ یەکشەممان پشوو بووە، ڕۆژانی تر بە ڕۆژانی کار یان ئاسایی نێوزەدن.

(٥). کۆنفێرم، بە عەرەبی/فارسی تعمید، سێرمۆنیەکی ئاینیە لای هەندێک لە کریستیانێکان، لەوانە کاتولیک، بەوەی مێردمنداڵ یان نەوجەوانان بەڵێنی ئاینی خۆیان دەنێو کڵێسادا دوپاتدەکەنەوە کە کریستیانێکی باشن. پێم باش بوو وشە لاتینێکە بەکاربێنم، چ وشەیەکی وامان دەنا نیە بۆ بەرامبەرەکەی. ئەمەش بۆخۆی کەمتەرخەمی زمانناسەکانی کورد و ئەو دەزگا بە نێو فەرمیانە دەردەخەن کە چۆن ئەو وشەو زاراوانەی لە ئاینەکانی تردا بەکارهاتوون پشتگوێیان خستوون. جێی داخە!

زنجیرەی: - نـۆبێـلیـســــــتەکان
{نوسەرانێك خەڵاتی نۆبێڵیان پێ بەخشرابێت(١)}
باشوری ئافریکا، نادیانێ گۆڕدیمێر Nadine Gordimer(٢)
وەرگێڕانی: - دەزگای مەریوانی، بەهاری ٢٠١٢
بە سەرپەرشتی گۆران مەریوانی

# ئــەمــنیســـــــــتــی

هەر کە ئێمە بیستمان ئەو ئازادکراوە بە نێو مەزراکەدا غارمدا، دەنێو تەلبەندەوە دەرکەوتم و بەرەو رووی کێڵگەی دراوسێکەمان تا هەواڵەکە بە مەردمگەلی خۆمان بڵێم. تا دواتر، نە پێمزانی بوو- و نە بینیبوشم کە درکی تەلبەندەکە کراسە ئاودامانەکەمی دڕاندبوو- و زامێکیشی کردبووە شانم، خوێنی لێدەچۆڕا.

ئەو نۆ ساڵ لەمەوبەر لێروکانێ گواستیەوە، کۆنتراکتێکی کـاری لـە شـار لـەتـەک یەکێک لە کۆمپانیەکانی بیناسازیدا — دروستکردنی رێگاوبانی شووشەی بەرەو ئاسمان، مۆرکردبوو تا لە شار کار بکات. دوو ساڵی یەکەم، مانگی جارێک، شەممە و یەکشەمەیەک، لە کریسمسیشدا بۆ دوو هەفتە دەگەڕایەوە ماڵ، ئا لەو دەمەدا بوو داوای کردبووم لە بابم. ئیدی دەستیکرد بە مارەییدان. من و ئەو وای بۆ دەچووین کە لە سێ ساڵدا رەنگە بتوانێت هێندە مارەیی بدات ئیتر بکرێت بگوازرێمەوە. لێ ئەو پۆشاکی گۆڕی بۆ ت-شێرتێکی ئاو لەوجۆرەی کە ئەو دەیگوت چۆتە ریزی سەندیکایەکەوە، ئیدی باسی مانگرتنی دەکرد و، دەیگۆت، ئەو یەکێکە لەو کرێکارانەی کە بۆ ئاخافتن لە پەیوەند کرێکارانێکەوە کە دوای مانگرتن دەردەکرێن



نادیانی گۆڕدیمێر

دەچێتە کن خاوەنکاران. ئەو هەمیشە قسەزان بوو، بە ئینگلیزیش — تەنانەت زیرەکترین قوتابی بوو دەنێو گشت قوتابخانەی گوندا. ئەو تەواوی رۆژنامەگەلێک کە هیندیەکان سابون و شەکریان تێدا دەپێچایەوە، کاتێک لە دوکانەکانیان بازاڕیت دەکرد، دەخوێندەوە.

تا نائارامی ئەو لەوحە خانوچکانەی ئەو پێخەف و نوێنەکەی تێدا گلدابۆوە گرتەوە. ئەوجا راپەڕین دژی کرێ دەنێو گەڕەک و کوچەی سیاپۆستەکاندا بەرپابوو، ئەودەم ئەو پێی گۆتم — تەنێ بە من، بە پیرەکان نا، لە گشت شوێنێکدا، لەو جێگایانەدا خەڵک خەباتی دژی چۆنیەتی سەروسەوداکردنی لەگەڵ ئێمەدا دەکرد، تەواوی خەباتی وان لەپێناوی ئێمەدا بوو، ئێمەی نێو کێڵگە و مەزراکان، هەروەها ئەوانەشی کە دەنێو شارەکاندا بوون، بە قسەی ئەو؛ سەندیکاکان لایەندارانی ئەوان بوون، ئەو خۆی دەنێو ریزەکانیاندا بوو، گوتاری دەدا، مارشی دەکرد. سێیەمین ساڵ بیستمان لە جیاتی ژن هێنانەکەی ئەویان دەنێو زیندانان هاویشتووە. ئێمە نەماندەزانی لە کوێ ڕا زیندانیان کردوە تا

رۆژی دادگایەکەی دەستیپێکرد. دادگاییکردنی ئەو لە شارێک بوو دوور دوور لێروکانێوە. ئەمن بۆم نەدەکرا زوو زوو بچمە دادگاییکرنەکەی چونکی ئەودەم تاقیکردنەوەکانی زانکۆم دابوو، کارتنامەی زانکۆشم وەرگرتبوو، ئیدی لە قوتابخانەی گوند دەست بەکاربووم. باوانیشم باری پولداریان خراپ بوو. دوو لە براکانم کە لە شار کاریان دیبۆوە پارە و پولێکیان بۆ ماڵ نەدەنارد، ئەوان بۆخۆیان لەتەک کیژە دەزگیرانەکانیاندا دەژیان و ئیدی دەبوو شتەکیان بۆ بکڕن. بابم و دووەمین برام لێروکانێ کاریان بۆ موڵکدارەکە دەکرد و مووچەیەیان گەلێک کەم بوو، ئێمە دوو بزن و چەند مانگایەکمان هەیە کە مۆڵەتدراوین بۆ لەوەڕ بەرەڵایان بکەین، زەویەکی گچکەش کە دایکم سەوزە و شینکەی تێدا دەڕوێنێت. هیچ پارەیەکی لێ هەڵناکرێنرێت.

ئەودەم لەبەردەمی دادگادا لە قاتێکی شین، پیرهانێکی خەتدار و کەرەواتێکی قاوەییدا ئەوم بینی گەلێک شیک بوو. هەموو تۆمەتبارەکان — هاوڕێکانی ئەو، گوتیان بەڕاستی ئەو رێکپۆشە. سەندیکا جلوبەرگەکانی کڕیبوو تا دادوەر و دادخوازان

گشتی وا تێنەگەن کە ئەوان سەروسەودایان لەتەک چەند ڕەشێکی گەمژەدا هەیە کە تەنێ دەزانن بڵێن: - یەس بـــاس yes baas و سەریان لە مافەماکی خۆیان دەرناچێت. ئەمە و چەندەها شتی تر کە خۆی بۆی ڕوونکرمەوە کاتێک مۆڵەتم پێدرا و لە زینداندا چوومە دیدەنی. کچە چکۆڵەکەمان لە گەرمەی دادگاییکردنەکەدا لە دایک بوو، ئەوە یەکەمجار بوو کچەکەم لەتەک خۆمدا بردبوو تا بیبینێت، هاوڕێکانی باوەشیان لـەوداو منیشیان لەسەر تانۆکەکەوە* کە قەفەسی تۆمەتباران جودا دەکاتەوە لە خەڵکی دە ئامێزکرد و پارەیان بۆ خڕکردمەوە و وەک دیاری بۆ کچەکە دایانمێ. ئەو ناوی کیژەی هەڵبژارد: ئینکولولێکۆ Inkululeko.

ئیدی دادگاییکردن هاتە کۆتایی و ئەویش شەش ساڵ زیندانی پێدرا. ئەو ڕەوانـەی ڕۆبن ئایلاند Robben Island کرا. ئێمە گشتمان نێوی ئەم دوورگەیەمان بیستبوو. لە مێژ بوو سەرۆکانی ئێمە لەوێندەرێ توند کرابوون. ئەمن بۆ خۆم هەرگیز دەریام لەوەوپێش نەدیبوو تەنێ لە نیگاری قوتابخانەدا نەبێت کە بە شینم دەچووان و ئەمنیش نەمدەتوانی پارچە ئەرزێکی گچکە بێنمە پێشچاوی خۆم دەوری بە دەریا درابێت. ئەمن تەنێ دەمتوانی ریخی مانگا بێنمەوە یادم دەمێک دەنێو گۆمێکی باراناودا وەسەر ئاوان دەکەون؛ دوای ئەوەی گاگەل بە نێویدا دەڕۆن، گۆمە باراناوێکی ئاوها ئاسمانی وەک ئاوێنە نیشاندەدا، شین. بە خۆمدا شکامەوە کاتێک بیرمکەوتەوە ئەمن بەوجۆرە بیردەکەمەوە. ئەو باسی لەوە دەکرد چۆن لە "دیواری شوشە"ـەوە؛ درەختانی کەنار شەقام و کۆشکەکانی تر و ڕەنگی تڕۆمبیلەکانی دەبینرێن کاتێک کرانێک ئەو لە پلاتفۆڕمێکەوە هەڵدەگرێت و بڵند بڵند بە ئاسمان ڕا بەرزی دەکاتەوە تا لەسەر سەربانی کۆشکێک کاربکات.

ئەو مانگی جارێک مۆڵەتی پێدرابوو تەنێ یەک نامە بۆ ماڵەوە بنوسێت. نامەکە حەڵاڵی من بوو چونکە باوانی ئەو نەیاندەزانی بنوسن. ئەمن هەمیشە ناو بەناو؛ دەچوومە ئەوبەر و سەردانیانم دەکرد، تا لێیان بپرسم کە داخۆ هیچیان هەیە بۆ کوڕەکەیان؛ ئاخر ئەوان لە فاڕمێکی تر کاریان دەکرد، دایکی هەمیشە دەگریا و دەستی دەنایە سەر سەری و ئیدی هیچی نەدەگوت، پیرەمێردەکەش کە گشت یەکشەممەیەک وەعزی دادەدان لە دەشت دەیگوت سەلام لە کوڕەکەم بکە و پێی بڵێ کە ئێمە دوعای بۆ دەکەین و لە خودا دەپاڕێینەوە کە گشت شتێک بە باری چاکە و ڕەحمەتدا بۆ ئەو بخات. جارەکی ئەو هاتە وەڵام و گۆتی: خودی گرفتەکە ئەمەیە - مەردمگەلی ئێمە لە دەرێ، لەو کێڵگە و مەزرانە بیستویانە کە خودا بۆخۆی دەزانێت چی بۆ ئەوان باشە و هەر بڕیاری خێریشیان بۆ نازڵدەکات تا ئەوان خۆیان هێز و تینێک نەدەنە بەرخۆیان و کارێکی وا بکەن خۆیان گۆڕانکاری دە ژین و زیندەگیاندا بهێننە گۆڕێ.

دوو ساڵ ڕابورد ئەوسا - من و باوانی ئەو- هێندە پارەمان پاشەکەوت کردبوو بەشی سەفەرێکی کاپستادن Kapstaden بکات و بتوانین بچینە سەردانی ئەو. ئێمە بە شەمەندەفەر ئۆغرمانکرد و لەسەر عەردی وێسگەکەش خەوتین، ئەوجا بۆ ڕۆژی دوایی سۆراخی ڕێگەی بەرە و پاپۆڕمان کرد. خەڵکی میهرەبان بوون — دەیانزانی گەر یەکێک عەودالی ئەو پاپۆڕە بێت ئەوە گوزارش لەوە دەکات کە یەکێک لە مەردمگەلی ئەوان لە دورگەکەی ڕا توندکردوە.

ئەها ئەوەتا خۆیەتی — ئەوە دەریایە. دەریا کەسک و شینی دەنواند، لە هەڵکشان و داکشاندابوو، کە دەتەقیەوە؛ تا کەشکەڵانی فەلەک؛ سپی دەنواند، رەشەبایەکی سامناک کەوتبووە وێزەی، قامچیکاری ئەملاو ئەولای دەریا دەکرد و ئیدی ئەویش دورگەی لە چاوان شاردبۆوە، خەڵکانێک کە وەک ئێمە چاوەڕێی پاپۆڕ بوون بە ئاڕاستەی دەستیان نیشانیان دەدا دورگەکە وەکوێ کەوتوە. زۆر دوور لە کەنارەوە، ئەمن هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات دەریا ئاوها بێت وەک خۆی چۆن دیارە.
بەلەم و کەشتی گەورەی خانوئاسای تریشی لێبوو کە دەچونە شوێنانی تر، لە سەرانسەری دونیادا، بەڵام ئەو پاپۆڕە تەنێ هاتوچۆی دورگەکەی دەکرد. بۆ هیچ جێیەکی تری دونیا نەدەچوو، تەنێ بۆ دورگەکە. ئیدی مەترسیەک بۆ گشت ئەوانەی لەوێندەرێ ماتەڵ بوون و دەیانویست بچنە دورگەکە، لە ئارادا نەبوو کە لەو شوێنەی ڕا بەهەڵە وێستابابین. چکلێت و بوسکویتمان پێ بوو، هەروەها پانتۆڵێک و قاپوتێک بۆ ئەو (خانمێک کە لەوێندەرێدا وێستابو گوتی، بڕواناکەم مۆڵەتتان پێبدەن جلکەکانی بدەنێ)، منیش ئەو بێریە کۆنینەی کە لەسەرم توند دەکرد و بەملاو ئەولای سەرمدا رامدەکێشایە خوارێ و چی کیژە وەرزێر هەیە هەیانە، پێ نەبوو، ئەمن کرێمی پێست نەرمونیان کردنم لەیەکێک لە هەگبەی ئەو وردەواڵا فرۆشە گەڕۆکانەی بە پاسکیل بە نێو کێڵگەو مەزراکاندا دەگەڕێن کرییبوو، قژیشم جوان هەڵدابۆوە و وەژێر رەفتەیەکی گوڵینم نابوو؛ لێ نەمهێشبوو ئەڵقە گوارە رەنگ زێڕینەکانم بشارێتەوە. دایکی ئەو بەتانیەکەی لە کەمەری، بەسەر عەزیزیەکەیدا گرێدابوو، وەک ژنە جوتارێک، لێ ئەمن وەک تەواوی ئەو کیژانەی تر کە لەوێندەرێدا وێستابون جوان و دڵگیربوم. کە پاپۆڕەکە هات ئێمە بەرێکات وەک مێگەلێک کە ماتەڵە لە حەسار دەرکەوێت بێدەنگ، جوان لە تەنیشت یەکەوە وێستابووین. یەکێک لە پیاوەکان هەر بەدەوروپشتی خۆیدا دەیڕوانی و چەناگەشی بەرزونزم دەبۆوە، دەیژماردین، دەبێت ترسی ئەوەی لێ نیشتبێت کە ژمارەی ئێمەی پێ فرە بووبێت تا بزانێت جێگەی گشتمان دەبێتەوە و نەیدەویست بە جێ بمێنێت. ریزمان گرت تا بەردەمی پۆلیسێک و ئەوانەی لە پێش ئێمەوە بوون سەرکەوتنە نێو پاپۆڕ. بەڵام کاتێک نۆبەی ئێمە هات دەستی بۆ شتێک، نازانم چی بوو، درێژکرد.
ئێمە بەرگی پەڕینەوەمان پێ نەبوو. ئێمە نەماندەزانی کە پێش ئەوەی بێیتە کاپستادن، پێش ئەوەی بێیتە کن پاپۆڕەکەی بەرەو دورگەکە بەڕێدەکەوێت، دەبێت بەرگی پەڕینەوە لەکن پۆلیس پەیدابکەیت تا سەردانی زیندانیەکی نێو دورگەکە بکەیت. هەوڵمدا میهرەبانانە تکای لێبکەم. رەشەبا پەلی بە سەدای نێو زارمدا کرد و لەتەک خۆیدا بردی.
ئێمەیان وەدەرنا. بینیمان چۆن پاپۆڕەکە بەملاو ئەولادا دەکەوێت، خۆی دەکێشا بەو پلاتفۆڕمەدا کە ئێمەی لەبان وێستابووین، چۆن خلدەبێتەوە، هەڵدەکشێت و دادەکشێت بە هەموو هێزیەوە خۆی بەو ئاوەدا دەکێشا، دەبینرا گچکە و گچکەتر دەبۆوە، ئیدی نەماندەزانی ئەوە بەڕاستی ئەوە لە هەتەری چاوماندا ماوە یان یەکێکە لەو باڵندانەی، کە رەش دەچوونەوە و لە دوورەوە بەرز و نزم دەبوونەوە.
تەنێ کارێکی باش ئەوە بوو یەکێک لە مەردمگەلەکە چوکلێت و بسکیوتەکانی لەتەک خۆیدا بۆ ئەو

برد. پاشان، نووسی  و گوتبوی کە ئەمانەتەکانی پێگەیشتووە. بەڵام نامەیەکی خۆش نەبوو. هەر بەڕاستیش وابوو نە باش بوو. ئەو لە من تورەبوو، دەبا من سۆراخی ئەو کارەم بکردبا، دەبوو بمزانیبا کە دەبوو بەرگی پەڕینەوەمان پێبایا. ئەو لەسەر هەق بوو — ئەمن بلێتی شەمەندەفەرم کڕی، ئەمن عەوداڵ و سۆراخی ڕێگەی پاپۆڕەکەم بووم، ئەمن شتێکم لەمەڕ بەرگی پەڕینەوەش بەر گوێ کەوتبوو. ئەمن تاقی کردنەوەی کارتنامەی زانکۆم هەیە، ئەمن وانەش دەڵێمەوە. لە شارێکی گەلێک نزیکمان بیرۆیەکی راوێژکاری هەیە، کە بە هیمەتی کڵێسا هاتبوە گـوڕێ، ئەمانەی هەموو بۆ نووسیبووم. لێ فاڕمەکەمان، {کێڵگەکەمان} هێند لە شارەوە دوورە، ئێمەیەکی گوندنشین زەحمەتە سەرمان لە سەروسەودای ئەوجۆرە کێشانە دەربچێت. ئاخر لە ڕێی جەهالەتمانەوە، هەروەکو ئەو دەیگوت، ئێمەیان لەو خوارەدا، لەو دامێنەدا هێشتۆتەوە، ئەوجا دەبێت ئەو جەهالەتگەلیە بە پایانی خۆی بگات.

سواری شەمەندەفەر بووین بەرەو ماڵ و هەرگیز نەگەڕاینەوە. نەچوینەوە بۆ دورگەکە- لە میانی ئەو سێ ساڵەدا کە ئەو لەوێندەرێ بوو بەهیچجۆرێک نەمبینی. تەنانەت بۆ جارێکیش. پوول و پارەی شەمەندەفەرمان پێهەڵنەدەسوڕا. بابی ئەو مرد و منیش دەبوو لە موچەکەم کۆمەکی دایکی بکەم. کێشەی مەردمگەلی ئێمە، ئەمن نووسیم، هەمیشە پوول و پارەیە. ئاخر کەنگێ ئێمە بۆ تاقە جارێک پوولمان دەبێت؟ ئەودەم ئەو نامەیەکی هێند جوانی نووسی. جا هەر بۆیێ ئەمن لەو دورگەیەی نراوم، بە هەزاران فرسەق لە تۆ دوور، ئەمن بۆیێ لێرەم تا رۆژێکی مەردمگەلمان ئەو شتانەی پێداویستیانە هەبێت، عەرد، خۆراک، کۆتایی جەهالەت. برێکی تریش نوسرابوو — لێ توانیم ڕێک و پێک وشەی "دەسەڵات" کە زیندان ڕەشی کردبۆوە بخوێنمەوە. سەرلەبەری نامەکانی خۆ تەنێ بۆ من نەبوو، یەکێکی دیکەش لە زیندان پێش ئەوەی بەدەستی من رابگات دەیخوێندەوە.

ئەو دەبوو تەنێ دوای پێنج ساڵ بگەڕێتەوە ماڵێ! یەکەمجار کە ئەم وشانەم بیست بەوجۆرە هاتنە بەر گوێم — لێ ئەو پێنج ساڵە هەر سەرت هێنا و برد تەواو بوو — هیچ نەبوو! کەمتر لە ساڵێک چاوەڕوانی مابوو. جارەکی تر دووبارە فۆتۆگرافیەکەی ئەوم نیشانی کچە چکۆڵەکەی خۆم — خۆمان دا. ئەوە بابتە، دەگەڕێتەوە، ئەودەم بەدیداری شاد دەبیت. ئەویش بۆ منداڵەکانی تری قوتابخانەی گێڕایەوە، ئەمن بابدارم، چۆن لاف و گەزافی بەو گیسکەوە کە لە ماڵەوە هەیبوو لێدەدا، هەر ئاوهاش، بە هەمانجۆر، بە بابیەوە.

ئێمە حەزمان دەکرد ئەو راستەوخۆ بگەڕێتەوە، هاوکاتیش خوازیاربوین کاتمان هەبێت تا هێندێک شت ئامادەبکەین. دایکی لەکن یەکێک لە ماڵە خاڵوانی دەژیـا، ئێستا کە بابی کۆچی دوایی کردوە ئیدی ماڵی بابی لەدەست دابوو تا لەگەڵ گوێزرامەوە بۆ وێندەرێم بەرێت. گەر وەختمان هەبایا بابم جووتێک کورسی دەتـاشـی، من و دایکم قوڕمان دەشێلا و خشتی دیوارمان دەبڕی، قامیشمان دەدوریەوە بۆ سەربان و خانوویکمان بۆ ئەو، خۆم و کیژە چکۆڵەکە دروستدەکرد.

ئێمە نەمان دەزانی ئەو چ رۆژێک دەێتەوە. ئێمە تەنێ گوێبیستی ناوی ئەو-و چەند هاوڕێیەکی ئەو بووین؛ کە لە رادیو خوێندرایەوە بەوەی ئازادکرابوون.

بەڵام ئەمن چاومکەوت بە ڕۆژنامەیک لە یەکێک لە دوکانی هیندیەکان، ،زێ نەیشن The Nation، کە سیاپۆستەکان دەریدەکەن، لە لاپەڕەی یەکەمیدا کۆمەڵێک مرۆی تێدا بوو کە دانسیان دەکرد و خۆیان بادەدا — ڕاستەوخۆ ناسیمەوە؛ ئا ئەوە پاپۆڕەکە بوو. چەند پیاوێک لەسەرشانی چەند پیاوێکی تر بوون. بە چاو نەمدەزانی کامەیەن ئەوە. ئێمە چاوەڕێمانکرد. پاپۆڕەکە ئەوی لە دورگەکەوە پەڕاندبۆوە؛ بەڵام ئێمە دەمانزانی کە کاپستادن زۆر لە ئێمەوە دوورە. دوایی ئەو هات. شەممەیەک، قوتابخانە نەبوو، بۆیێ لەگەڵ دایکمدا کارمدەکرد، دەوروپشتی کولەکە و گەنمەشامیەکانمان پاچەکۆڵە دەکرد و دەبژارد، کەزیشم، کە ئارەزومبوو جوان بێت، بە لەچکێکی doek* ی کۆنینە بەستبووم. کۆمبیەک لە دەشتەکەی پەڕیەوە و هاوڕێکانیشی بە ترۆمبێل بەدوایدا لەتەکیدا بوون. ئەمن حەزمدەکرد هەڵدێم، خۆم بشارمەوە و خۆم بشۆم بەڵام ئاخر ئەو لەوێندەرێدا قوتبووە؛ هەردوو لاقی بڵاوکردەوە و هاواریکرد: هەڵاو؟ سڵاو؟ هاوڕیکانیشی دەنگە دەنگیان بوو لە دەروپشتی و دایکم بە شێوە کەونینەکەی خۆمان لە قرمەی گازکردنی دا؛ ئایێ ئایێ aie! aie!! بابیشم هـەردوو دەستی بەیەکدا کێشا و رووەو لای چوو. ئەو پڕ ئامێزی بۆ ئێمە کـردەوە، ئەم کابرا کەتەیە لە جلکی شاری و پێڵاوی بریقەداردا، بەدرێژایی ئەو کاتەی کە دە ئامێزی نام هەردوو دەستی بە گڵ پیس بووم لە پشتی ئەوەو شاردبۆوە. ددانی دە نێوان لێوانیەوە توند بەر من دەکەوت، پەلاماری دایکمی داو، دایکیشم خۆی دەپاراست تا کیژۆڵەکەی بۆ بەرزبکاتەوە. ئەمن دەترسام کە هەموومان پێکڕا بە عەردا بکەوین! پاشان گشتمان هێمن بووینەوە.

کێژۆڵەکەمان لە پشت دایکمەوە خۆی شاردەوە. ئەو کیژۆڵەکەی بەرزکردەوە، نەخێر ئەم سەری نزمکرد. ئەو بەنەرمی لەتەک کیژۆڵەدا دەپەیڤا، لێ ئەو نەیدەویست وەڵامبداتەوە. کیژە نزیکەی شەش ساڵێکە! من کەمێک لێی تورەبووم و گوتم خۆت مەکەرە منداڵی ساوا کچێ. ئەو گۆتی: ئاخر ئەمە ئەو نییە!

تەواوی هاوڕێکانی لە قاقایاندا، ئێمە پێکەنین، ئەو هەڵات و ئەمیش گوتی: وەختی گەرەکە تا هۆگرم دەبێت.

ئەو کەمێک پەنماوە، با ڕاستە؛ زۆریـش. پیاو بـڕوای بە چـاوی نـەدەکـرد. پێشتر هێندە لاغر بوو لاقی وا دەهاتنە پێشچاو کە بەو گەورەبن. ئەودەم لەودا هەستم بە لاقی دەکرد لێ ئێستا — کە ئەو شەوە وەسەرم کەوت، هێند قورس بوو، کە ئیدی بەهیچجۆرێک وەبیرم نەدەهات کە لەوەو پێش ئاوها بووبێت. ماوەیەکی ئاوها دوور و درێژ. سەیرە کە ئینسان بەهێزتر دەبێت دەنێو زینداندا، ئەمن وای بۆ دەچـووم کە ئەو تاقەتی خواردنی نەمێنێت و بڕستی لەبەر ببڕێت ئـەودەم ئازاد دەکرێت. هەموویان گوتیان: بڕوانن؟- ئەو بۆ خۆی پیاوێکە، ئێستا. ئەو دەخەنیەوە و مشتەکۆڵەی لە سینگی دەدا، دەیگوت هاوڕێیان، سەرلەبەریان لە تاکە ژوورەکانی زینداندا مەشقیان دەکرد، ئەو پێنج کیلۆمەتر ڕۆژانە غاریدەدا، لە سەر عەردی هەمان ژوورە گچکەی تاکبەندی زیندادا غاریدەدا کە تێیدا بەندکرابوو. بۆ شەوێ، ئیدی کە بەتەنێ پێکەوە ماینەوە؛ ماوەیەکی زۆر ڕاکشابووین و چرپە چرپمان بوو؛ لێ ئێستاکونێ وا هەستدەکەم بیر لە هەندێک شت دەکاتەوە کە من سەری لێدەرناکەم و بۆشم نییە بە قسە جارسیبکەم. وێڕای ئەوەش

نازانم چ بڵێم. لێی بپرسم ئەرێ ئەو پێنج ساڵی نێو زیندانەت چۆن گوزەراند؛ یانە شتێکی قوتابخانەی بۆ بگێڕمەوە یاخود دەربارەی کچەکە بدوێم. دەها لێروکانێ داخۆ دەبێت چی تر روویدابێت، ها؟ تەنێ چاوەڕوانی. هەندێجار، بەڕۆژ هەوڵدەدەم بەڕاستی باس لەوە بکەم کە چۆنم گوزەراند، لێرە لە ماڵەوە لەسەر مەرز و کێڵگەکە، پێنج ساڵ. ئەو گوێ ڕادەدێرێ، باسەکەی لا گرینگە، بە هەمان شێوە؛ کاتێک خەڵکی لە کێڵگە و مەزراکانی تریشەوە دێن و لە وردە شتانێک دەدوێن کە لە ماوەی ئەو پێنج ساڵە دووردرێـژەدا لێیان قەوماوە کە ئەو دوور لێروکانێ، لە دورگەکە بوو، گوێی گرینگیی هـەڵـدەخـات. خـەنـدە دەیگرێت وســەری قایلی رادەوەشێنێت، چەند پرسیارێک دەکات و پاشان رادەبێت و خۆی دەکشێنێت. ئەمن حاڵـی دەبم لێی، دەزانم بۆ وادەکات، تا نیشانیبدات کە ئیدی بەسە، سەرلەنوێ بیر و زهنی خەریکی لێکدانەوەی شتێکە کە پێش ئەوەی ئەوان بێن لە کەللەیدا بوو. ئێمەی مەزرا و کێڵگەکانیش هێند بە کاووخۆین، بە کاووخۆوە لە شتان دەدوێین، ئاخر ئەو بۆ خۆشی وایە.

ئەو هیچ کارێکی تازەی پەیدا نەکردوە. بەڵام ئەو ناتوانێت لە ماڵەوە لەکن ئێمە بمێنێتەوە، ئێمە واماندەزانی دوای پێنج ساڵ لە نێوەڕاستی ئەو دەریای سەوز و شینەدا، دوور دوور لێروکانێ، ئیتر بۆ ماوەیەکی کەم دێت و لەکن ئێمە دەمێنێتەوە. ترۆمبێلە کۆمبیەکە یان دانەیەکی تر دێت و ئەو دەبات لەگەڵ خۆی، بەمیش دەڵێت؛ نیگەران مەبە، ئەمن نازانم چ رۆژێک دەگەڕێمەوە. لە سەرەتادا پرسیم چ هەفتەیەک، هەفتەی ئاینده؟ ئەو هەوڵیدا بۆ منی روونبکاتەوە، بزوتنەوە بە شێوە و کاروباری سەندیکا ناچێت، مرۆڤ لە سەندیکادا کاروباری خۆی رۆژانە رادەپەڕێنێت و پاشان سەرقاڵی کۆبوونەوەیە، لێ مرۆڤ هەرگیز دە نێو بزوتنەوەیدا نازانێت کەنگێ و دەبێت بەرەو کوێندەرێ ئۆغربکات و چی بەڕێوەیە بقەومێت. پوول و پارەش هەمان بەزمی هەیە. دەنێو بزوتنەوەدا بەوە ناچێت وەک ئەوەی ئیشێکت هەبێت، ناو بەناو–و بەردەوام مووچە بدرێت– ئەمن دەزانم، ئەو پێویست ناکات ئەمانە بۆ من روونبکاتەوە– ئەمە بەوە دەچێت بچیت بۆ دورگەکە. ئەمانە گشتی لە پێناوی خەڵکی خۆماندا کە رەنجدەکێشن چونکی ئێمە بێ پوول و پارەیان، عەرد و زەوییەک شک نابەین — تەنێ بڕوانە، ئەو گوتی، ئەوجا چووە سەر باسی ماڵە باوانم، ئەو ماڵەی لە چاوەڕوانی ئەمدا بوون، لەگەڵ منداڵەکەیدا: بڕوانە لەم شوێنەدا، تاک و تەنێ ئەو پیاوە سپی پێستە خاوەن عەردەکەیە و رێتان پێدەدات لەو کوخە بە قوڕ و لەوح دروستکراوانەتاندا بمێننەوە؛ تا ئەودەم کاری بۆ دەکەن — بابە Baba و براکەت شینایەکەی ئەو دەچێنن و مەڕوماڵاتەکەی بۆ بەخێودەکەن، ماما Mama گسکداری ماڵی ئەوە و تۆیش قوتابخانەکەی بۆ دەبەی بەڕێوە؛ بەبێ ئەوەی تەنانەت چانسێکت بە نسیب بێت تا کارتنامەیەکی خوێندنێکی باش بەدەست بهێنیت. ئێمە موڵک و ماڵی کێڵگەدارەکانین، ئەو دەڵێت.

من وای بۆ دەچووم؛ ئێمە ماڵێکمان شک نەدەبرد لەبەر ئەوەی کاتمان نەبوو خانووچکەیەک دروستبکەین، بەر لەوەی ئەو لە دورگەکە بگەڕێتەوە، لێ ئێمە تەنانەت خاوەن یەک ماڵ چیە نین. ئێستا لەوە جوان حاڵی بووم.

ئەمن گەمژە نیم. کاتێک هاوڕێکانی ئەو بە کۆمبیەکە دێنە ئێروکانێ تا لەتەکیدا وتووێژ بکەن، ئەمن لەگەڵ دایکمدا کەنار ناکەوین دوای ئەوەی چا یان

(ئەگەر فریاکەوتبێت بۆ کۆتایی پشووی هەفتە بیرەی سازکردبێت) بیرەمان وەبەردەم دەنان. ئەوان حەزیان لە بیرەی سازکراوی دەستی دایکمە، ئەوان باسی فەرهەنگ و کولتوری خۆمان دەکەن و یەکێکیان هەمیشە، جار بوێری ناکات، دەست دەخاتە سەر شانی دایکم ودەڵێت، ئەو مامای، Mama هەموویانە، مامای ئافریکایە. دایکم گەلێک کەیفی پێدێت کاتێک ئەوان باسی ئەوە دەکەن چۆن لەدورگەکە هەمیشە سترانیان چڕیوە و دایکم قایلدەکەن تا سترانێکی کۆنی خۆماڵی خۆمان بچڕێت، لەو سترانانەی کە ئێمە گشتمان گوێبیستی بووین کاتێک دایکی باوکمان یان دایکی دایکمان بێژاویانە. ئەوجا ئەوانیش بەدەنگە قەبەو گڕەکەی خۆیان تێدەکەون و لە تەکیدا دەیڵێن. بابم پێی خۆش نییە کاتێک دەنگمان لەو بەری دەشتەوە دەبیسترێت، چونکی ئەگەر بۆەرە موڵکدارەکە* boer بزانێت شووکەم دەم لە سیاسەتەوە وەردەدات، وە دورگەکە نراوە، کۆبوونە و دانیشتن لەسەر عەردی ئەو دەبەسترێت؛ لە بابم دەخـوڕن ماڵ باربکات و خاوو خێزانیشی لەتەک خۆیدا بەرێت. بەڵام براکەم دەڵێت خۆ گەر هات و بۆوەرە موڵکدارەکان *boer پرسیان ئەرێ ئەوە چ باسە، دەڵێین بۆ نوێژێ گردبووینەتەوە. ئیتر کۆتایی بە گۆرانیەکەش دێت؛ دایکیشم دەزانێت ئیدی کاتی ئەوەیە دووربکەوێتەوە، بگەڕێتەوە ماڵ. ئەمن دەمێنمەوە، گوێش ڕادەدێـرم. ئەو لە بیری دەچێت کە من لەوێندەرێم؛ ئـەودەم دەستدەکات بە ئاخافتن و بەڵگە و دەلیل هێنانەوە دەربارەی پرسەیەک کە دەیبینن گرینگە، گرینگتر لە شتانێک کە بتوانین؛ کاتێک هـەر خۆمانین، بۆ یەکتری باس بکەین. بـەڵام ناو بەناو، کاتێک یەکێک لە هاوڕێیان ئیزنی ئاخافتن وەردەگرن، دەبینم بەقەد چاوتروکانێک لێمدەڕوانێت، بە هەمان شێوە چۆن من لە قوتابخانە لە یەکێک لە قوتابیە خۆشەویستەکانی خۆم دەڕوانـم وەک ئـەوەی خەمی ئـەوەم بێت کە داخۆ لێم حاڵی دەبێت. پیاوەکان من نادوێنن و منیش ئەوان نادوێنم. یەکێک لەو شتانەی کە باسی لێوەدەکەن چۆنیەتی ڕێکخستنی مەردمگەلی نێو مەزراو کێڵگەکانە- کرێکارەکان وەک بابم و براکەم، یان وەک باوانی پێشوی خۆی. ئەمن خۆم فێری برێک زارەوە دەکەم، کەمترین مووچە، کاتی کاری جێگیر، مافی مانگرتن، پشووی ساڵانە لەمەڕ منداڵ. ئەمن دووگیانم، ئاخر منداڵێکی تازە لە دووتۆی مندایە، لێ ئەمە ئیشی ژنانەیە. دەمێک ئەوان ناوی پیاوە مەزنەکەThe bigman و پیرەمێردەکەThe old man دەبەن، ئەمن دەزانم ئەم جووتە پیاوە کێن: سەرکردەکانیشمان ئازادکراون. ئەمن چاوەڕێی منداڵ بوونم، بەوم گوت؛ ئەو گوتی: ئەو پێ و قەدەمی دەچێتە وڵاتێکی نوێ، ئەو، ئەو ئازادیە بینا دەکات کە ئێمە خەباتمان بۆکرد! ئەمن باش دەزانم کە ئەو دەیەوێت بمگوێزێتەوە لێ ئێستاکونێ کاتی تەواومان نییە. هێندە کاتی شک دەبرد کە تەنێ و بێ چەند و چوون بەشی دروستکردنی منداڵێک بکات. ئەو هێند دێتە کن من تەنێ تا ژەمە نانێک بخوات یان جلکەکانی بگوڕێت بە جلکی خاوێن. دوای ئەو منداڵە چکۆڵەکەمان هەڵدەگرێت و هەندێک بابە خولەی پێدەکات و ئا بەو جۆرە!

— ئیدی تەواو، خۆی لە کۆمبیەکە دەهاوێژێت، روو دەکاتە هاوڕێکانی، تەنێ ئەوەی سەر و سیمایەکی وەک ئەوی هەبێت دەزانێت چی لەسەری ئەودایە، چاوانی هێند خێرا دەجولێنێت پێدەچێت خەریکی نێچیرکردنی شتێک بێت کە کەسی تر نەبینێت. بۆ کیژە چکۆڵەکەش؛ تا ئێستا وەختی هێند نەبووە تا

خولیا و ئولفەتی ئەو پیاوە لێی دابێت. لێ ئەمن باشدەزانم، ڕۆژێکی دێ، شانازی بەوەوە بکات!
ئاخر مرۆڤ چۆن بتوانێت ئەمە بۆ منداڵێکی شەش ساڵان باسبکات. لێ من باسی پیاوە مەزنەکەThe bigman و پیرەمێردەکە The old man دەکەم تا ئەو بزانێت کە بابی لەتەک ئەواندا لە دورگەکە نرابوو، ئەم پیاوەش بەش بە حاڵی خۆی پیاوێکی مەزنە.
شەممە، قوتابخانە نییە و من لەتەک دایکمدا خەریکی ناشتن و بژاری گژوگیاین، ئەو گۆرانی دەچرێت لێ من نا؛ ئەمن بیردەکەمەوە. یەکشەممە هیچ کارێک نییە، تەنێ کاتی نوێژە لەژێر ئا ئەو درەختەی ها لەوێد قیت وێستاوە. دوور لە بینایی موڵکدارەکە و، بیرە خواردنەوە لەبەردەم ئەو کوخە قورین و لەوحدارانەدا کە موڵکدارەکە مۆڵەتی داوین لەسەر عەردی ئەودا ڕاستیبکەینەوە و دەنێویاندا زیندەگی بکەین. ئەمن بە تەنێ، ڕێبوارئاسا، ملی ڕێگا دەگرم، هەر چۆن بەمنداڵیش وام دەکرد، ئەمن ئەودەمیش یارەیەکانی خۆمم دەکرد و قسانیشم لەتەک خۆمدا دەکرد کاتێک کەسێک گوێی بۆ ڕانەدێراماباو لە چاوان دووربامایا.
لەسەر گابەردێکی گەرم هەڵدەتروکێم و درەنگانێکی دوانیوەڕۆیە، لە بەرزاییەک، تــەواوی دۆڵەکەش؛ دەنێوان ئەو گردانەدا؛ لە تولە ڕێیەک دەچێت، کە لەبەردەم پای منەوە درێژدەبێتەوە. پاکی ئەمانە کێڵگە و مەزرای موڵکدارەکەیە، ئەڵبەتە ئەمە ڕاست نییە، هینی کەسێک نییە. مەڕوماڵات هیچ حاڵی نابن ئەگەر یەکێک بێت و بڵێ مێگەل ئێوە موڵکی منن، مەڕەکان — ئەم بەردە خۆڵەمێشیانە کە لە کۆتادا دەبنە تولەڕێیەکی مارئاسای تەنگ ئەستوری خاکی-ڕەنگ — ئەوانیش بێ ئاگان. کەپرەکانی ئێمە و ئەو شاتووە پیرە لەتەک ئەو عەردە گچکە قاوەییە کە دایکم دوێنێ کێڵای، زۆر لە دامێنی خوارەوە، تا بەری ئەوبەر لەکوێ ئەو کۆمەڵە درەختە هەن لەدەوری ئەو دوکەڵکێشانە و ئەو شتەی کە ئاوا بریق و باق دەداتەوە و کە دەڵێن عامودی ئەنتێنی تێ ڤێیەکەی TV موڵکدارەکەیە – ئەمانە هیچ نین لەسەر پشتی ئەم زەمینە. دەکرێت زەمین گشت ئەمانە بەتەکانێک لە خۆی توڕدات؛ هەر وەک چۆن سەگێک گەنە لە خۆی دادەتەکێنێت.
ئەمن بەرز، دەنێو هەوری ئاسمانم. خۆر لە پشتمەوە ڕەنگی ئاسمان دەگۆڕێت و پەڵە هەورەکانیش هەوری خۆیان هێدی هێدی دەگۆڕن. هەندێکیان پەمبەن، برێکی تریان سپی بـاو، ئاوساو وەک بڵقن. لە دامێنیشدا دوو کەناری خۆڵەمێشی، لێ هێندەیان بەبەرەوە نییە باران بدەن. دوو ڕۆخەکە درێژدەبنەوە و تاریک هەڵدێن، کەپویەکی باریکی لێدەبێتەوە و لاشەیەکی گەورە و لە کۆتاییشدا دەبنە کلک. جرجێکی گەورەی خۆڵەمێشی بە ئاسمانەوە نەقشدەکەن کە دەجولێتەوە، ئاسمان دەخوات.
کیژە چکۆڵەکە فۆتۆگرافیەکەی وەبیرهاتەوە؛ ئاخر ئەوە ئەو نییە. ئەمن لە جێگایەکدا دانیشتووم کە زۆرجار؛ دەمێک ئەو لە دورگەکە توندکرابوو؛ هامشۆم کردوە. ئەمن بۆیێ دەهاتمە ئێروکانێ تا لەوان بە دوورکەوم، ئەوجا بە تەنێ ماتەڵ و چاوەڕوانبم.
ئەمن لە جرجەکە دەڕوانم، ئەو نامێنێت، لەودەمەیدا کە جرجە ئاسمان دەخـوات ئەم هێڵ و نەقشانە تێکدەچن، منیش ماتەڵم. چاوەڕێی ئەو دەکەم تا دێتەوە.
چاوەڕێ.
ئەمن چـاوەڕێ و ماتەڵم تا بگەڕێمەوە نێو ماڵــی خۆم.

## پەراوێزی وەرگێڕ: –

(١). دوو– سێ دێڕی بڕشتم دەربـارەی هونەری

وەرگێڕان لە نووسینەکانی پێشوومدا نووسی و، ماوەتەوە ئەمجارە بڵێم گرفتێکی تری هونەری وەرگێڕان لا کردنەوەیە نەک تەنێ لە فۆڕمی دەقەکە لە پەیوەند بە ناوەرۆکیدا، بگرە بیرۆکەی بنەڕەتی مەتنەکە پێش ئەوەی بەرگی نووسینی بەبەردا دابېڕێت، واتە لە دایکبێت، چۆنە! بێگومان مەتنی، پان و پۆ و دەق لای رەگەز– مێیەک؛ گەر راسگۆیانە لەتەک خۆیدا بنوسێت؛ بە رەگەز نێرینەیەک ناچێت. ئێستا کاتێک وەرگێڕ دادەنیشێت و خەریکی بەرگە شاڵیە کوردیەکەیە داخۆ ئەم بیرۆکە بنەڕەتیە لەکن نوسەری سەرەکی بە هەند وەردەگیرێت؟ یانی لە داڕشتنەویدا رەگەزگەرایی بەهەند وەردەگیرێت! سەرنجێکی بازاڕی وەرگێڕان بدەین، چ وەرگێڕانی دەقی فاکتەگر یان نافاکتەگر/ هونەر، دەبینین تەنیا یەک دەقی، فۆڕمی وەرگێڕان لای وەرگێڕی کورد هەیە، ئەمن بە هوروژاندنی پرسیارەکە وازدەهێنم تا دەرفەتیێکی فراوانترم دەستدەکەوێت بۆ گوزارشت لەم هونەرە.

ئەمن لەدەقەکنی خۆمدا، هەوڵدەدەم تا بکرێت فۆڕمە، بیرۆکە، بنەڕەتیەکە وەک خۆی بهێڵمەوە، بە هەند وەرگرتنی رەگەز، تەمەن، کولتور و ئێمبریۆی بیرۆکە بنەڕەتیەکە. جا چەند سەرکەوتودەبم؛ لێیدەگەڕێم بۆ خوێنەر. لێ ئەورۆکە کاتی ئەوە هاتووە دەقە وەرگێڕاوەکان بخەینەوە بەرگە بنەڕەتیەکانی خۆیان بێ ئەوەی جلوبەرگی نێر و مێینە کوردیەکەش وەلا نێین. ئەمە هونەری وەرگێڕانە لای من، کە پەیام لەتەک فۆڕمی پەیامدا، واتا، شێوە، زەرفی نامەکەدا دەگەیێنرێت.

* doek جۆرێکە لە لەچکی سەر، لە باشووری ئەفریکا هەیە

* boer زاراوەیەکی باشووری ئەفریکایە گوزارشە

لە کەسانێک وەچەی کۆلۆنیالە هۆڵەندیەکانن.

(٢). نادیانێ گۆڕدیمێر Nadine Gordimer لە ٢٠ نۆڤەمبەری ١٩٢٣ لە باشوری ئەفریکا، لە خێزانێکی جولەکە، بابی، ئیسادۆر گوڕدیمێر، سەعاتچیەکی کۆچبەری لیتوانی و دایکیشی، نانNan ، جولەکەیەکی لەندەنی، هەردووکیان بە بیروباوەڕی مرۆڤدۆستانە و یەکسانی نێوان رەگەزەکان ناسراون، هاتۆتە دونیاوە. دایکی یەکەم دایەنگە بۆ منداڵانی ڕەشپێست دەکاتەوە. گ هەر لە منداڵیەوە نووسین و چالاکەوانی سیاسی لە پرسەکانی مۆڕاڵ، دادپەروەری کۆمەڵایەتی... تاد خولیای بووە. لە ١٥ ساڵیدا یەکەم نووسینی پەخشکردوە. لە گەرمەی راونانی ئەندامان و بەیاسخکردنی رێکخراوەکەدا ئەندامی کۆنگرێسی ناسیۆناڵی ئەفریکا بووە، خەباتی دژی ئاپارتاید و رەگەزپەرستی، دامەزراندنی سەندیکای ئازاد و دواجار لە ناوبردنی ئایدس و هیڤ کردوە.. لە ١٩٩١ خەڵاتی نۆبێڵی پێبەخشراوە بەوەی خانمێکە : – "لە رێی نووسینی سەرگوزەشتە و گێڕانەوە ئامێزیەوە توانیویەتی — بە وشەی ئالفرێد نۆبێڵ — سوودێکی گەورە بە مرۆڤایەتی ببەخشێت". گ کەم و پچڕ پچڕ چۆتە خوێندنگە، ساڵێک لە زانکۆ بووە، زیاتر دایکی خەریکی فێرکردنی بوە، لێ هەر زوو دەبێتە یەکێک لە نوسەرانی رۆژنامە گەورە – زمان ئینگلیزیەکان و دواجاریش لە ئامریکا خەریکی وانە گوتنەوە بووە لە زانکۆ. ١٩٤٨ ماڵ دەگوێزێتەوە، لە گاوتێنگ کە شارۆچکەیەکی کاندەرهێنانە و زایەنگای خۆیەتی، بۆ پایتەخت، یۆهانسبێرگ، دەکاتە نشینگەی خۆی. گ. مەریوانی

# جیرۆم ڤێراری.. خەڵاتی کۆنکۆردی ٢٠١٢ وەرگرت

لە عەرەبییەوە: باوکی پایان

خەڵاتی کۆنکۆرد، بەرزترین خەڵاتی ئەدەبییە لە فەرەنسا، ئەم خەڵاتە لە ٧ تشرینی دووەمی ئەم ساڵدا، بەخشرا بە "جیرۆم ڤێراری" رۆماننوس، وەرگرتنی ئەم خەڵاتە کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، چونکە کێبرکێیەکی توند لە نێوان "جیرۆم ڤێراری" و "باتریک دۆفیل" خاوەنی رۆمانی (تاعون و کۆلێرا) و ئەدیبی سویسری "جویل دیکر" خاوەنی رۆمانی (حەقیقەت سەبارەت بە کێشەی هاری کیبیر) و رۆماننوس "لیندا لی" بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتەکە هەبوو.

ئەم لیستە بچوکە، لە میانەی پێشانگای بێروت/ فرانکفۆنی بۆ کتێب، راگەیەنرا. لیژنەی پێدانی خەڵاتەکە، گەشتە بێروت، تاکو گوروتینێکی زۆرتر بە پێشەنگاکە




جیرۆم ڤێراری

ببەخشێت و دواتر لە پاریس، براوەی خەڵاتەکە جیرۆم ڤێراری دەستنیشان کرا، ڤێراری لەسەر رۆمانەکەی (پەندێک لە کەوتنی رۆما)، خەڵاتەکەی وەرگرت کە لە دەزگای (ئاکت سود) بڵاوکرابوەوە.

هەرچەندە ماوەی چەند ساڵێکە، خەڵاتە ئەدەبییە دیار و بەرچاوەکان لە فەرەنسا، روبەڕووی رەخنەیەکی زۆر بوونەتەوە و بەوە تۆمەتبار دەکرێن کە خێروبێرەکەی بەسەر دەزگا بڵاوکراوە زەبەلاحەکاندا دەبەخشێتەوە، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەو کارە ئەدەبییانەی دیکە بدەنەوە کە دەزگا بچوکەکان بڵاویاندەکەنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەو رەخنانەشدا، زۆربەی چاودێران پێیان وایە بردنەوەی دەزگای (ئاکت سود) بۆ خەڵاتەکە لە میانەی جیرۆم ڤێراری نوسەردا، کارێکی راست و دروستە و دراوە بەوەی شایەنیەتی.

جێرۆم ڤێراری کە مامۆستای فەلسەفەیە و تەمەنی ٤٤ ساڵە، ئەوە یەکەمجار نییە ئەو خەڵاتە وەردەگرێت، ڕۆمانەکانی ئەم نوسەرە، مۆرکێکی مێژویی یان بۆن و بەرامەیەکی مێژویی لەخۆدەگرن و باس لە کۆمەڵێ روداوی گرانگ و جومگەیی دەکەن، وەک رۆمانی پەندێک لە کەوتنی رۆما، کە خەڵاتەکەی لەسەر وەرگرتووە.

ئەم نوسەرە لە میانەی ئەم چەند ساڵە کەمەی رابردودا، سێ خەڵاتی وەرگرتووە، بگرە لە هەر ساڵێکدا خەڵاتێکی وەرگرتووە، ساڵی ٢٠٠٩ لەسەر کتێبی (خواوەند، ئاژەڵ) خەڵاتی (لاندرنۆ)ی وەرگرت، ساڵی ٢٠١٠ دوو خەڵاتی

وەرگــرت: یەکەمیان خەڵاتی تەلەفزیۆنی ڕۆمانی کاسۆلیکی فەرەنسی بــوو، لەسەر کتێبی (ڕۆحم لە کوێ بەجێهێشت؟)، دووەمیان خەڵاتی (بۆنستۆن) کــە خــەڵاتــێــکــی گــەورەیــە، لەسەر هەمان کتێب وەریگرت. ئێستاش ئەوەتا ڤێراری، دوای گفتوگۆیەکی گــەرم و قورس لە نێوان ئەندامانی لیژنەکە، خەڵاتی کۆنکۆرد وەردەگرێت، ڕۆمانەکەی (پەندێک لە کەوتنی ڕۆمـا) پێنج دەنگی لیژنەکەی بەدەستهێنا، لــە بــەرامــبــەردا ڕۆمــانــی (تــاعــون و کۆلێرا)ی ڕۆماننوس پاتریک دوفێل چوار دەنگی بەدەستهێنابوو، هەروەها ڕۆمانی (حەقیقەت سەبارەت بــە کێشەی هــاری کیبیر)ی ڕۆمــانــنــوس جویل دیکر دوو دەنگی بەدەستهێنابوو. ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە ئەوەیە ڕۆمــانــی پەندێک لــە کەوتنی ڕۆما، پێشتر گەشتبووە قۆناغی کۆتایی دوو خەڵاتی ئەدەبی گــەورە کە بریتین لە هــەردوو خەڵاتی (فیمینان) و (انترالیە).




ڕوداوەکــانــی ئــەم ڕۆمانە، لە دورگــەی کۆرسیکای خوارو

فەرەنسا روودەدەن و نوسەری رۆمانەکە ئەو دورگەیە باش دەناسێت، چونکە خۆی لە فەرەنسا لەدایک بووە و لەوێدا ژیاوە. رۆمانەکە باس لە "مارسێل ئەنتوانی" پیر دەکات، کاتێ دەگەڕێتەوە بۆ دورگەکە، دەبینێ کوڕەزاکەی "ماتیۆ" وازی لـە خوێندنی فەلسەفە لە سۆربۆن هێناوە و گەڕاوەتەوە بۆ دورگەکە، تاکو لەگەڵ "لیبیرۆ" کە هاوڕێی منالّییەتی و ئەویش خوێندکاری فەلەسەفە بووە، پێکەوە مەیخانەیەک لە دورگەکە بەڕێوەببەن. مەیخانەکە سەرەتا سەرکەوتنێکی گەورە بەدەستدەهێنێت و خەڵکی ناوچەکە و گەشتیاران رادەکێشێت، کەچی زۆر بەخێرایی بەر نەفرەت دەکەوێت، هۆکارەکەشی بۆ هەڵدانەوەی برینی کۆن و ناکۆکی گـەورە و ئیرەیی نێوان ئەو دوو هاوڕێیە دەگەڕێتەوە، ئەمەش وادەکات دواجار هەردوکیان و مەیخانەکەش بەرەو وێرانبوون برۆن.

ناونیشانی رۆمانەکە لە ئامۆژگارییەکی قەشە "سانت ئۆگەستین"ەوە وەرگیراوە، ئەو قەشەیە دوای کەوتنی رۆما ساڵی ٤١٠، بە ئیمانداران دەڵێ: (رۆما کەوت.. رۆمایان لێ بردین.. بەڵام نە ئاسمان و نە زەوی نەهەژان.. جیهانیش وەک مرۆڤ وایـە.. دەژی، گەورە دەبێ، پاشان نامێنێ).

جیرۆم ڤێراری ئەدیب و نوسەرێکی فەرەنسییە، ساڵی ١٩٦٨ لە پاریس لەدایکبووە، فەلسەفەی خوێندووە و بووە بە مامۆستای فەلەسەفە، بەشێ لە وانەکانی لە جەزائیر خوێندووە، لە رۆمانی (رۆحم لە کوێ بەجێهێشت) باس لە جەزائیر دەکات، روداوەکانی ئەم رۆمانە، لەمیانەی شۆڕشی جەزائیر، باس لە ساڵانی پەنجاکانی جەزائیر دەکات، هەروەها رۆشنایی دەخاتە سەر شکستی فەرەنسییەکان لە هیندی سینی ساڵی ١٠٥٨.

ئەم ئەدیبە لە ئێستادا، لە دەزگایەکی خوێندنی فەرەنسی لە ئەبو زەبی کاردەکات، لێرەوە ئەم تێکەڵەیە لە دورگەی کۆرسیک و جەزائیر و فەرەنسا، لەگەڵ مەعریفەیەکی قووڵی نوسەر بە فیکری کۆلۆنیالیزم و قووڵبوونەوەی لە فەلەسەفەدا، وایانکردووە ئەم رۆمانە کە خـەڵاتـی ئـەم ساڵی کـۆنـکـۆردی وەرگـرت، ببێتە دەقێکی دەوڵەمەنی قووڵ کە شایەنی قسەلەسەرکردن و دەرخستنە. ڤێرای شەش ساڵ بە نوسین و رێخستن و پاکنوسکردنی ئەم رۆمانەوە خەریک بووە.

بەسەرهاتی مەیخانەکەی دورگەی کۆرسیک، بە هەستانەوە و بوژانەوەی و پاشان گەندەڵبوونی و دواتر هەرەسهێنانی، وێنەیەکی مەجازییە بۆ تێڕوانینی ڤێراری سەبارەت بە ئاوابونی خۆری، خۆرئاوا. ئەو نوسەرە پێیوایە ئەو خۆرە وردە وردە ئاوادەبێت، رۆژێ دێت خۆرئاوا ئاوادەبێت وەک چۆن هەموو شتێ ئاوادەبێت، بەڵام بێ ئەوەی ئەو ئاوابوونە نە زەوی و نە ئاسمان بێنێتە هەژان.

سـەرچـاوە: الـشـرق الاوسـط، ١١ تشرینی دووەم، ٢٠١٢

# فەیلەسوف و عامەی خەڵك

نووسینی: محفوظ ابی یعلا
لە عەرەبییەوە: سەردەم

فەیلەسوف ئەو کەسەیە کە حەزی لە حیکمەتە، ئەو کەسەیە بیردەکاتەوە، لە شتەکان رادەمێنێت، سەرقاڵی توێژینەوە و دەرئەنجامە، مۆرکی خۆی بە بیرکردنەوە و توێژینەوەکانییەوە دەنێت و ڕێگایەکی تایبەت بە خۆی دەگرێتەبەر. هەروەها فەیلەسوف کەسێکی پرسیارکەر و رەخنەگرە، بۆیە لە مەسەلە فیکرییەکان و ویژدانییەکاندا، دژی بیروباوەڕی باوە . لەبەرامبەردا مانای (العامە) لە فەرهەنگی (لسان العرب و المعجم الوسیط) دا ئاوا لێکدراوەتەوە: العامە پێچەوانەی خاسەیە، مەبەست لە عامە تەواوی خەڵک و جەماوەر دەگەیەنێت، زۆرجار مەبەست لێی خەڵکانی ئاسایی و سادەیە یان خەڵکانی عەوام و ئاژەوەچی دەگرێتەوە .
لەدێر زەمانەوە، فەیلەسوفەکان بەدەستی خەڵکانی ئاساییەوە ناڵاندویانە، زۆرجار دوژمن

و نەیارانی فەیلەسوفەکان، بۆ بەدیهێنانی ئامانج و خواستەکانیان کە لە سەرکەوتن و هێشتنەوەی کۆندا خۆیدەنوێنێت، چەقبەستن و دواکەوتویی خەڵکە رەشۆکەکەیان قۆستوەتەوە و لەدژی فەیلەسوفەکان هانیانداون. ئا لێرەوەیە دەبینین "ئیبن روشد"ی فەیلەسوف، لەلایەن خەڵکە عامەکەوە لە مزگەوت دەرکرا، بەهۆی تۆمەتی کافربون و بێ ئیمانییەوە کە نەیارەکانی خستبویانە پاڵی، لە راستیدا ئیبن روشد هیچ نەبوو تەنها



برتراند راسل

ئەوەنەبێت کە یەکێک بوو لەوانەی بانگەشەی کرانەوە و تازەگەری دەکرد (١).

گرنگی ئەم بابەتەی کە لەسەری دەنوسم، لەو شکستەوە سەرچاوە دەگرێت کە فەیلەسوف لەسەر دەستی خەڵکانی عەوام و پەلاماردانەکانیانەوە دووچاری دەبێت، سا ئەو پەلامارە بە قسە بێت یان پەلاماری جەستەیی بێت. ئەم پەلامارە لەوانەیە فەیلەسوف ناچار بکات بێدەنگ بێت و دوور بکەوێتەوە و تەریک و گۆشەگیری بکات، وەک ئەوەی لەگەڵ فەیلەسوفی موسڵمان "مالک بن وهیبی ئەشبیلی" رویدا، ئەم فەیلەسوفە بە هۆی ئەوەی خەڵکی عەوام داوایان کرد خوێنی حەڵاڵ بکرێت، ئیدی وازی لە قسەکردن لەسەر بابەتە فەلسەفییەکان هێنا (٢).

دەتوانین بیهێنینە بەرچاوی خۆمان چی روودەدات کاتێ فەیلەسوف بێدەنگ دەبێت. زۆر بە سادەیی بێدەنگبوونی فەیلەسوف، گۆڕەپانەکە بۆ خاوەن عەقڵە پوچەکان و فوقەهاکان و لایەنگرانی کۆن، جێدەهێڵێت، تاکو خوارفات و جەهل بڵاوبکەنەوە. لێرەوە ئەم پرسیارانەی خوارەوە سەرهەڵدەدات کە هەوڵدەدەم وەڵامیان بدەمەوە:

بۆچی خەڵکی ئاسایی (عامە) پەلاماری فەیلەسوفەکان دەدەن؟

ئەی هەڵوێستی فەیلەسوفەکان بەرامبەر بە خەڵکی ئاسایی چییە؟

ئایا پێویستە لەسەر فەیلەسوف گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکی ئاسایی بکات یان خۆی لێیان بەدووربگرێت؟

خەڵکی ئاسایی بۆیە پەلاماری فەیلەسوفەکان دەدات، چونکە فەیلەسوفەکان خەڵکانی یاخی و نوێخواز و تازەگەرن و خاوەنی فیکر و ڕەفتاری گەورەن. سەرەڕای ئەوە، خەڵکانی ئاسایی

بۆیە پەلاماری فەیلەسوفەکان دەدەن، چونکە فەیلەسوفەکان دەستکاری قەناعەت و بیروباوەڕە جێگیرەکانیان دەکەن و دووچاری نیگەرانییان دەکەن، کاتێ دەیانەوێ خوێندنەوەیەکی تازە بۆ ئەو قەناعەتە کۆنانە بکەن. خەڵکی ئاسایی زۆر بە دەگمەن رێگە دەدات بیروباوەڕ و پیرۆزییەکانی بخرێنە ژێر نەشتەری رەخنە، ئەوان بێ رەخنە و بێ قسەکردن، لەسەر نەهجی باو و باپیرانیان دەڕۆن و ڕازی نابن دەستکاری ئەو نەهجە بکرێت. تەنانەت پێغەمبەرەکانیش لە شەڕانگێزی خەڵکی ئاسایی بەدوور نەبوون.

"برتراند راسل"ی سەردەستەی فەیلەسوفەکان، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (حیکمەتی خۆرئاوا)، سەبارەت بە پەیوەندی نێوان خاوەن عەقڵە نافەلسەفییەکان، واتە عامەی خەڵک لەگەڵ فەیلەسوف دەنوسێت: (ئەوان، واتە خەڵکی ئاسایی یان عامەی خەڵک، بە لێبوردەیی و نەرمونیانی و بەزەییپیاهاتنەوە، مامەڵە لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا دەکەن، بەو پێودانەگەی فەیلەسوفەکان گێڵ و دەبەنگن و زەرەریان نییە، یان لەسەر ئەو ئەساسە مامەڵە لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا دەکەن کە خەڵکانێکی خاوەن ڕەفتاری سەیر و سەمەرەن، لوتبەرز و خۆبەزلزانن و پرسیاری سەخیف و هیچ و پوچ دەوروژێنن. بەڵام لەلایەکی دیکەوە، بیرکردنەوەی فەلسەفیانە، دەکرێ کاریگەرییەکی گەورە و قووڵی لەسەر هەڵتەکاندنی هەموو دابونەریتە باوەکان، هەبێت. ئالەم حاڵەتەدا بە چاوی گوماناوی تەماشای فەیلەسوف دەکرێت و وەک کەسێکی لادەر لە دابونەریتی باو لەقەڵەمدەدرێت، کەسێک عورف و عادات تێکدەدات، کەسێکە رازی نابێت بە کۆمەڵێ مەرج و نەریت، کە لەلایەن ئەوانی دیکەوە، بە مەرج و نەریتی راست و دروست دانراون. لێرەوە ئەوانەی لەسەر مەسەلەی رەخنەگرتن رانەهاتوون، هەست بە نیگەرانی و نا دڵنیایی دەکەن، کاتێ یەکێک دێت و قسە لەسەر نەریت و بیروباوەڕەکانیان دەکات کە شانازی پێوەدەکەن، بۆیە پەرچەکردارەکانیان هەڵگری ڕق و دوژمنایەتیەکی گەورەیە. ئا بەم شێوەیە سوقرات بەوە تۆمەتبار کرا کە ئامۆژگاری و رێنمایی روخێنەر بڵاودەکاتەوە، هەروەها سفستائیەکان بەگشتی و مامۆستایانی خاوەن گوتاری جەدەل بە تایبەتی تۆمەتبار کران (٣).

لێرەدا ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکانی ئێمەدا، ئەوانەی خەڵکە ئاساییەکە دژ بە فەیلەسوفەکان هاندەدەن و لە ژێرەوە دنەیاندەدەن، فوقەهاکان و لایەنگرای کەلتوری تەقلیدین. دوژمنی یەکەم و هەرە



ئیبن سینا

سەرسەختی فەیلەسوفەکان، فوقەهاکانن، کە لە ململانێیاندا لەگەڵ فەیلەسوفەکان، خەڵکی ئاسایی تێوەدەگلێنن، تاکو تای تەرازووەکە بەلای بەرژەوەندی خۆیاندا بەرزکەنەوە. لێرەدا لە نمونە دیارەکانی ئەم حاڵەتە ئیبن روشدە، کارەساتی ئیبن روشد ئەوەبوو فوقەها نەیارەکانی خەڵکی ئاساییان لە دژی هاندا. هەروەها یەکێک لە فوقەها نەیارەکانی "کیندی" فەیلەسوف، هەولێدا خەڵکە ئاساییەکە دژ بە "کیندی" هانبدات، بەڵام "کیندی" لەو لێزانتر و فێڵبازتر بوو، لە نوسینەکانیدا شێوازی کورتکردنەوەی گرتەبەر، تا نەیارەکانی وەک پێویست نەتوانن لە نوسینەکانی تێبگەن. تەنانەت "مەعەری"یش هەمان شێوازی کورتکردنەوەی گرتەبەر، مەعەری پێدەچێ لەبەر ئەوەی لە عامەی خەڵک دەترساو بە مەبەستی شاردنەوەی هەندێ لە بیروڕاکانی، پەنای بۆ ئەوە بردووە نوسینەکانی کورت بکاتەوە، لەم بارەیەوە دەڵێ: (تۆ کۆتوبەند لەسەر قسەکانی من دامەنێ، منیش وەک ئەوانی دیکە بە مەجاز قسەدەکەم)

فەیلەسوفانی رۆشنگەری، پێیان وابوو عامەی خەڵک خراپن، بۆ نمونە "لامتری" فەیلەسوف دەڵێ: (خۆشبەختی عەوام بە دروستی لەوەدایە وا بکات ئەوانی دیکە کەساس و بەدبەخت بن (٤)).

"هلفتیۆس"ی فەیلەسوف دەڵێ: (جەهل زۆر لە هیوا و ئاوات مەترسیدارترە، خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی دەبەنگن تا شەڕانگێزبن). هەروەها "ڤۆلتێر"یش هەڵوێستێکی دڵڕەقانەی توندی لەبەرامبەر خەڵکی عەوام هەبوو، ئەو لەوبارەیەوە رایدەگەیەنێت گوێ بەو خەڵکانە نادات، چونکە هەمیشە وەک خەڵکانێکی ئاژاوە چی دەمێننەوە. "دیدرۆ" لە ئینسایکلۆپیدیاکەدا هەڵوێستی خۆی بەرامبەر بە خەڵکی عەوام دەربڕیوە، پێوایە دەنگی خەڵکی عەوام دەنگێکی شەڕانی و گێل و دەبەنگ و نەزانینە (٥).

باشە ئەگەر بیروڕای فەیلەسوفانی خۆرئاوا، سەبارەت بە خەڵکی عامە ئاوابێت، ئەی ئاخۆ بیروڕای فەیلەسوفە موسڵمانەکان دەبێ چۆن بووبێت؟ لە راستیدا موسڵمانە بەراییەکان، ئەوانەی سەرقاڵی کاری زانست بوون، بە پشتگوێخستن و ڕقلێبونەوە مامەڵەیان لەگەڵ عامەی خەڵک کردووە، بۆ نمونە ئیبن روشد بە خەڵکی عامە دەڵێ: (مناڵە گەورەکان) و پێیوایە ئەوانە لەو جۆرە کەسانەن کە پشتیان پێنابەسترێت و شوێنی باوەڕنین، مەگەر تەنها لە لایەنی خەیاڵەوە نەبێت. ئیبن سینا بەو خەڵکانە دەڵێ (گێل) و پێیوایە لەودنیا، چارەنوسیان لەنێوان خۆشبەختی و نەهامەتیدا بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە (٦).

ڕقی رۆشنبیرە موسڵمانەکان لە خەڵکی عەوام، تەنانەت لە ناوی کتێبەکانیشیانەوە دەردەکەوێت، بۆ نمونە کتێبی (الجام العوام عن علم الكلام) و کتێبی (المضنون به على غير اهله) گوایە ئەو دوو کتێبە کتێبی ئیمامی غەزالی-ین.

ئاشکرایە فەیلەسوفانی ئیسلام، خەڵکیان بۆ دوو بەش دابەشکردووە: عامە و خاسە. دیارترین فەیلەسوف کە قسەی لەو پۆلێنکردنە کردبێت، ئیبن روشد بوو. ئەم فەیلەسوفە ئەوەی دەرخست خەڵکی لە تێگەشتن و وەرگرتنیان بۆ زانست جیاوازن، هەیانە حەز بە سەلماندن دەکات، هەیانە حەز لە گوتار و ئامۆژگاری و وەعز دەکات، هەشیانە حەزی لە گفتوگۆ و دیبەیتە.

ئیبن سینا-ش لە مەسەلەی پۆلێنکردنی خەڵکدا، بیروڕای خۆی هەبوو، ئیبن سینا پێیوابوو نوێژ بەو شێوەیەی کە هەیە، تەنها خەڵکی عامە ئەنجامیدەدەن، بەڵام خەڵکی خاسە ئەنجامینادەن چونکە پێویستیان پێی نییە. شەرع، بەپێی بۆچونی ئیبن سینا، بریتییە لە تەواوکردنی نەفس،

بۆیە کاتێ غایەتەکە بەدەستهات، ئەوا پێویست بە وەسیلەکە ناکات (٧).
لە کۆتایدا ئایا پێویستە فەیلەسوف گفتوگۆ لەگەڵ خەڵکی عەوامدا بکات یان بێدەنگ بێت؟
ئیمامی غەزالی پێوایە پێویستە فەیلەسوف لە عەوام دووربێت و بیروڕاکانی خۆی نەخاتە بەردەستیان، چونکە ئەوە بۆ فەیلەسوفەکە باشتر و سەلامەتترە، غەزالی لەمبارەیەوە دەڵێ: (هەمو ئەوەی کە دەبینرێ ناوترێ، بگرە سنگی ئازادیخوازان گۆڕستانی نهێنییەکانە-صدور الاحرار قبور الاسرار (٨)).
هەرچی ئیبن روشدە، پێیوایە پێویستە خەڵکی عامە لە تەفسیر و ئەئویل دووربخرێتەوە و ناچاربکرێت شێوە روکەشەکەی شەریعەت پەیڕەوبکات. بگرە لەوەش زیاتر پێداگری دەکات و ڕەخنە لەو کەسانە دەگرێ خەڵکی عامە لەو گفتوگۆ فیکرییە قورسەکانەوە دەگلێنن کە لێیان تێناگەن، وەک ئەوەی موعتەزیلەکان کردیان.
ئیبن طفیل لە کتێبەکەیدا (حی بن یقظان)، لەسەر هەمان ئەو ئاراستەیە رۆشت، واتە فەیلەسوف بیروڕاکانی خۆی بۆ خەڵکی عامە دەرنەخات. کاتێ (حی بن یقظان) بە مەبەستی ڕۆشنکردنەوەی خەڵکی عەوام و گەیاندنی راستییەکان پێیان، لە دورگەکەی خۆی هاتە دەرەوە، شکستیهێنا و سەرکەوتو نەبوو. خەڵکی لێی بێزاربوون و بەجێیانهێشت، چونکە ئەوان لەسەر ئەوە راهاتبوون بەشێوەیەکی رووکەشانە پەیڕەوی لە شەریعەت بکەن، بۆیە نائومێد بوو لەوەی چاکیان بکات، پاشان لەو خەڵکە ڕاما، بینی بەشی هەرە زۆریان لە پلەی ئاژەڵێکی قسەنەکەر دان، بۆیە گەڕایەوە بۆ بێدەنگییەکەی خۆی (٩).
بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، ئەگەر ئێمە راستییەکان بە خەڵکی عەوام نەڵێین، ئەوا ئێمە بەشدارین لە مانەوەی بارودۆخەکە وەک خۆی. ئەگەر گفتوگۆ لەگەڵ کەسی نەزان نەکەین، ئەی ئیتر سودی زانست چییە؟ لەسەر ئەم بنەمایە، من پێموایە فەیلەسوف یان بەشێوەیەکی گشتی رۆشنبیر، پێویستە لەسەری قسە بکات و بیروڕاو قەناعەتە رۆشنگەرییەکانی، بۆ تەواوی مرۆڤەکان، بە عامە و خاسەیانەوە، بخاتەڕوو. چونکە ئەگەر ئەوەی نەکرد، ئەوا بوار بۆ خاوەن عەقڵە پوچەکان خۆشدەکات، تاکو بیروڕای خورافی و بیرکردنەوەی کۆنەپەرستانە بڵاوبکەنەوە، لێرە بەشداردەبێت لە دواکەوتنی کۆمەڵگاو نەتەوەکەی.

پەراوێزەکان

١-منجی لسود، اسلام الفلسفه، دار الطلیعه للطباعه و النشر و رابطه العقلانیین العرب، الطبعه الاولی ٢٠٠٦، ص: ٣٧
٢-هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە ٣٦، هەمان شت دووچاری نوسەری میسری سەید قمنی بووەوە، دوای ئەوەی هەڕەشەی کوشتنی لێکرا.
٣-برتراند راسل، حکمه الغرب، ترجمه د. فؤاد زکریا، سلسله عالم المعرفه، عدد ٣٦٤، یونیو ٢٠٠٩، ص: ٨٩ و ٩٠.
٤-غیرترود هیملفارب، الطریق الی الحداثه، ترجمه د. محمود سید احمد، سلسله عالم العرفه، عدد ٢٦٧، سیبتمبر ٢٠٠٩، ص: ١٨٠.
٥-مرج نفسه، ص: ١٨٦.
٦-منجی لسود، اسلام الفلاسفه، مرجع سابق، ص: ٣١.
٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٧، ئەوەی لێرەدا شایەنی ئاماژە پێدانە ئەوەیە ئیبن سینا بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکانی.
٨-مرجع نفسه، ص: ٣٥.
٩-عبدالرحمن بدوی، حی بن یقظان لابن الطفیل، الهیئه المصریه العامه للکتاب

# کۆچی دوایی ئاریك هۆبزباوم

ئامادەکردنی: هەورامان وریا قانع

ڕۆژی ٤ تشرینی یەکەمی ٢٠١٢، مێژوونوسی بە ڕەگەز جولەکە، ئاریک هۆبزباوم، لە تەمەنی ٩٥ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و تاکو دوا ساتەکانی تەمەنی پارێزگاری لە هزر و ئاگایی خۆی کردبوو. ئەم پیاوە کە یەکێکە لە مێژوونوسە هەرە ناسراوەکانی سەدەی بیستەم، ساڵی ١٩١٦ لە خێزانێکی جولەکە و لە شاری ئەسکەندەرییەی میسر لەدایکبووە، ئەو ساڵە هەمان ساڵی بەرپابوونی شۆڕشی بەلشەفیک بوو لە یەکێتی سۆڤیەتی جاران. هۆبزباوم بە درێژایی ژیانی حەزیکردووە بیر لەو ڕێکەوتە بکاتەوە، ڕێکەوتی لەدایکبونی لە ساڵی بەرپابونی شۆڕشی بەلشەفیک، هەستیکردووە ئەو ڕێکەوتە، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر پێکهاتەی کەسایەتیەکەی دروستکردووە.



ئاریک هۆبزباوم

تەنانەت ئەو تاوانانەی ستالین ئەنجامیدان و بووە هۆی گیانلەدەستدانی دەیان ملیۆن کەس، قەناعەتیان بە هۆبزباوم نەهێنا بیر لەوە بکاتەوە کە لەوانەیە شۆڕشی روسی، بە حوکمی بارودۆخەکەی، بگۆڕێت یان ببێتە ئامرازێک بۆ کوشتنی بە کۆمەڵ. کاتێکیش ناچار دەکرێ بەرگری لە خۆی بکات، دەڵێ: (مرۆڤایەتی زۆر قەرزاری شۆڕشی روسی و یەکێتی سۆڤیەتە، چونکە ئەوە یەکێتی سۆڤیەت بوو جیهانی لە نازیەت رزگار کرد).

ئەم بیانووە فێڵبازانەیە، وەک دیارە زۆر راستی و حەقیقەتی مێژوویی گرنگ پشتگوێدەخات، لەوانە ئەو حەقیقەتەی کە ستالین پەیماننامەی دۆستانەی لەگەڵ هێتلەر مۆرکرد و وڵاتی پۆڵەندەیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکرد، یان یەکێتی سۆڤیەت بەشداری جەنگی جیهانی دووەمــی نــەکرد، تــەنها ئــەو کاتە نەبێت کە ئەڵمانیای نــازی پــەلامــاری دا. یەکێتی سۆڤیەتیش هیچ بژاردەیەکی دیکەی لەبەردەمدا نەبوو، ئەوە نەبێت بۆ بەرگریکردن لە خۆی، وەڵامی جەنگ بە جەنگ بداتەوە و بەشداری جەنگەکە بکات.

هۆبزباوم بەشێک لە ژیانی هەرزەکاری خۆی لە نەمسا پاشان لە بەرلین بەسەر بردووە، لەوێ هەرەسهێنانی دیموکراسی ئەوروپی و قەتڵوعامی کۆمۆنیستەکان و هەڵکشان و هاتنەسەر حوکمی نازییەکان دەبینێ. دواتر پێش ئەوەی هێتلەر دەرگاکانی ئەڵمانیا بــەڕووی جوولەکەکاندا دابخات و ژووری گازە خنکێنەرەکان دروست بکات، هۆبزباوم و خێزانەکەی بەرەو بەریتانیای مەزن رادەکەن. لەوێ هۆبزباوم خوێندنەکەی لە زانکۆی (کامبردج) تــەواو دەکـات و زۆر بەخێرایی ناوی وەک مێژوونوسێکی مارکسی دەردەکات. ئەگەرچی بڵاوبوونەوەی مارکسییەت

له خۆرئاوای ئەورووپادا و له میانەی ساڵانی پەنجا و شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، ببووە جۆرێک له مۆدە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکی بڵاوبوونەوەی شەپۆلی مارکسیزم بۆ کاریگەری ئەم پیاوە دەگەڕێتەوە کەببووە یەکێک لەو مێژوونوسانەی کتێبەکانی زۆرترین فرۆشیان هەبوو.
ڕەنگە هۆکاری ئەو دەرکەوتنەی هۆبزباوم بۆ دوو خاڵ بگەڕێتەوە:
یەکەم: ئەو لە بەریتانیا دەژیـا، بەریتانیا وڵاتێکی دیموکراتی لیبراڵی بوو، بەریتانیا نەک تەنها ڕێگەی بە فرەیی و جیاوازی دەدا، بەڵکو زۆر بە توندی پشتگیریش دەکرد. بۆیە شتێکی سەیر نەبوو شاژنی بەریتانیا، هەمان پلە و ڕێز لە هۆبزباوم بنێت، وەک ئەو پلە و ڕێزەی لە جۆن مێجەری نابوو کە یەکێک بوو لە سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا.
دووەم هۆکار لە پشت سەرکەوتنە بەردەوامەکانی هـۆبـزبـاوم، بریتییە لـەو شـێـوازە ڕوون و ئاشکرایەی لە نوسینەکانیدا بەکاریدەهێنا کە زیاتر لە شێوازی ڕۆماننوسێک دەچوو لە گێڕانەوەی ڕوداوە مێژووییەکاندا. ڕەنگە لەگەڵ تێڕوانینی هۆبزباوم بۆ ڕوداوە مێژووییەکان نەبیت و ناکۆکبیت لەگەڵیدا، بەڵام هەمیشە حەز بە خوێندنەوەی نوسینەکانی دەکەیت. ئەو مێژوووەی هۆبزباوم دەیگێڕێتەوە، بریتی نییە لە گێڕانەوەی ژیان و بەسەرهاتی دەسەڵاتدار و حاکمە داگیرکەرەکان، بەڵکو بریتییە لە گێڕانەوەی ژیان و بەسەرهاتی خەڵکانی سادەو ساکار، بریتییە لە گێڕانەوەی ڕوداوی ژیانی ئەو خەڵکە سادەیەی کاتێ بەسەرهاتەکانی ژیانیان پێکەوە دادەنرێن، وێنەیەکی دەوڵەمەندتر دەبەخشنە ئەوەی کە ڕویداوە.
سەرەڕای هەمو ئەوانە، هۆبزباوم لە بەریتانیا بووە یەکێک لە شارەزا هەرە گەورەکانی بواری مۆسیقای جاز، ئەو بەشێوازێکی زۆر جوان و نایاب لەسەر مۆسیقای جاز-ی دەنوسی کە شوێنی تێڕامان و سەرسوڕمان بوو. هەروەها ئەو یەکێکە لەو مێژوونوسە کەم و دەگمەنانەی بەردەوام کتێبەکانیان لە بازاڕەکاندایە. هۆبزباوم وایکرد خەڵکی لە سەرجەم ناوچە جیاواز جیاوازەکانی جیهانەوە، ڕوو لە خوێندنەوەی مێژووو بکەن. ڕەنگە تەنها ئەم خاڵە بەس بێت بۆ ئەوەی ناوی بە نەمری بمێنێتەوە.
هـۆبـزبـاوم لـەدەیـەی سییەکانی سـەدەی بیستەمدا، هاوڕێکانی لەقوتابخانە پێیان وتووە (کوڕە ئینگلیزەکە)، خێزانەکەی ساڵی ١٩٣٣ ئەڵمانیا جێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە بۆ بەریتانیا کە زێدی ڕاستەقینەی باوکیەتی. هۆبزباوم لە یاداشتەکانیدا دەڵێ لە ئەسکەندەرییە لەدایک بووە، باوکی سەر بە خێزانێکی ئینگلیزییە کە دارتـاش بـووە، دایکی یەکێک بووە لەو سێ کچەی کە باوکیان بازرگانی مجەوهەرات بووە لە ڤیيەنا. کاتێ خێزانەکەی ئەسکەندەرییە جێدەهێڵن، هۆبزباوم تەمەنی سێ ساڵ بووە، بۆیە هیچی وای لەسەر ئەو شارە بیرناکەوێتەوە، تەنها قەفەزێکی بچوکی باڵندە نەبێت لە باخچەی ئاژەڵان، لەگەڵ تۆزقاڵێکی کەم لە گۆرانییەکی یۆنانی بۆ منداڵ. هۆبزباوم چیتر دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخسا سەردانی ئەسکەندەرییە، شوێنی لەدایکبوونەکەی بکاتەوە و ئەو بەجێهێشتنە بەجێیهێشت، نەیتوانی جارێکی دیکەی بۆ بگەڕێتەوە.
ئەم مێژوونوسە، نەیارەکانی پێش هاوڕێکانی،

دان بەوەدادەنێن کە دواهەمین مێژوونوسی مارکسی مەزنە. هۆبزباوم خاوەنی چەندین کتێبە، بە ناوبانگترینیان چوارینەی (سەردەمی شۆڕش ١٧٨٩-١٨٤٨) ساڵی ١٩٦٢ بڵاوبوەتەوە، (سەردەمی سەرمایە) ساڵی ١٩٧٥ بڵاوبوەتەوە، (سەردەمی ئیمپراتۆریەت) ساڵی ١٩٧٨ بڵاوبوەتەوە، (سەردەمی توندڕەوی) ساڵی ١٩٩٤ بڵاوبوەتەوە. ئەو چوار بەرگە ڕووماڵی مێژووی مۆدێرنە دەکات، لەگەڵ بایەخدانی بە شتە ورد و بچوکەکان. هۆبزباوم بە شێوەیەک لە شێوەکان لەژێر کاریگەری قوتابخانەی (الحوليات)ی فەرەنسیدا بووە، بۆیە زیاتر بایەخی بەشتە لاوەکییەکان داوەو زۆر ئاوڕی لە ڕووداوە گەورەکان نەداوەتەوە.

هۆبزباوم بە ڕاشکاوی رایگەیاندووە سەدەی بیستەمی خۆشناوێت، سەدەی زێڕینی ئەو، وەک مامۆستاکەی کارل مارکس، سەدەی نۆزدەهەمە کە پڕ بووە لە بەڵێنی رۆشنگەری و تێڕوانین و فیکری گەشبین، بەڵام سەدەی بیستەم هات و هەموو ئەوانەی لەباربرد. لای هۆبزباوم ئەم ڕق و خۆشنەویستنەی سەدەی بیستەم، لە هەستوسۆزێکی قووڵ و لە نائومێدییەکی گەورەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەو دەیویست ئاوا بە سەدەی بیستەم بڵێ: تۆ شایەنی ئەوە نەبویت ئاوا بیت، نەدەبوو مرۆڤایەتی ئاوا نائومێد بکەی کە هیوا و ئاواتێکی زۆریان پێت هەبوو. ئەم هاوارەی هۆبزباوم، هاواری سۆفییەک نییە پشتی لە دونیا و لە خەڵکی کردبێت، هەروەها هاواری ئەکادیمییەکی گۆشەگیری نێو ڕاڕەوەکانی زانکۆ نییە، بەڵکو هاواری زانایەک و مێژوونوسێک و تێکۆشەرێکە کە خۆی لەناوەڕاستی جەنگە گەورەکانی سەدەکەدا بینییەوە.

هۆبزباوم پێی وابوو سەدەی بیستەم، بە تایبەتی چارەکی کۆتایی سەدەکە، هەندێ دیاردەی بەخۆیەوە بینی، پێشتر مرۆڤایەتی شتی لەو شێوەیەی بەخۆیەوە نەبینیوە. لەوانە بە ملیۆنان پەناهەندە لە جیهانی سێیەمەوە روویان کردە ئەوروپا و بەشوێن پەناگایەکدا دەگەڕان. توندڕەوی خەڵکی بێتاوان و بێ گوناهی زیاتر لەناوبرد تاکو دامودەزگاکانی دەوڵەت، (نمونە بۆ ئەوە جەزائیری ساڵانی نەوەدەکان دەهێنێتەوە). هەروەها چارەکی کۆتایی سەدەکە، دەسەڵاتدارێکی بەخۆیەوە بینی کە بۆ یەکەمجارە لە مێژوودا کیمیایی دژ بە میللەتەکەی خۆی بەکاربێنێت (سەدام حسێن). چەندین دەوڵەتی گەورە لێکهەڵوەشانەوە و بوون بە دەوڵەتی بچوک بچوک. (هۆبزباوم تەواو وەک مارکس، کیانە بچوکەکانی خۆشنەویستووە).

هۆبزباوم پێیوایە سەدەی بیستەم، هاوسەنگی خۆی لەدەستداوە و خلیسکاوەتە ناو توندڕەوی و دەمارگیری و نا جێگیرییەوە، ئەمە دوای ئەوەی ماوەیەکی زێڕینی بەخۆیەوە بینی، واتە ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوان کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی تا ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاکان. لەو ماوەیەدا کۆمەڵێ گۆڕانکاری ئابوری و کۆمەڵایەتی گەورە رویاندا و ئاستی بوژانەوەی ئابوری بەڕادەیەکی بەرچاو بەرزبوەوە. بەڵام کەڵەکەبوونی خێرای سامان و مەعریفە، هاوشان بوو بە دابەشکردنێکی نادادپەروەرانە و ئەو سەروەت و مەعریفەیە کەوتنە دەست کۆمەڵێ گروپی زۆر تایبەتەوە، ئەم گروپە تایبەتانە، تەنانەت هەڕەشە لە

خودی ئەو دامودەزگایانە دەکەن کە جیهانی سەرمایەداری خۆی دروستیکردوون.
لەسەر ئاستی رۆشنبیریش، ئێستا هەموو شتێ بووەتەوە ( پاش): پاش مارکسیزم، پاش بونیادگەری، پاش تازەگەری..هتد. بەڵام دوای ئەو هەمو (پاش)ە چی دیکە دێت؟ هۆبزباوم هیچ تێڕوانینێکی گەشبینانەی بۆ ئاییندە نەخستەڕوو، گوایە وەک مێژوونوسێک ئەوە ئەرکی ئەو نییە. لەوەش زیاتر پێدەچێت هۆبزباوم برِوای بەو قسە بەناوبانگەی مارکس نەمابێت کە دەڵێ: (ئەرکی سەرەکی بریتییە لە گۆڕینی جیهان، ئەمە دوای ئەوەی فەیلەسوفەکان تەنها کاریان لێکدانەوەی جیهان بوو). کەچی هۆبزباوم لە ساڵانی کۆتایی سەدەی بیستەمدا، زیاتر لە (فیورباخ)ەوە نزیکبوو تا مارکس و رایگەیاند ئەرکی سەرەکی تا ئێستاش، بریتییە لە لێکدانەوەی جیهان، پێش ئەوەی بیر لە گۆڕینی بکەینەوە. بەتایبەتی لەم قۆناغەی ئێستادا کە تابڵێی ئاڵۆزە و بەناویەکدا چووە.
لەم خاڵەوە، هۆبزباوم لەگەڵ مارکس یەکناگرێتەوە کە جارێک لە جارەکان وتبووی: (مرۆڤایەتی تەنها ئەو کێشانە باس دەکات کە دەتوانێ چارەسەریان بکات)، وەلێ ئەوەتا مرۆڤایەتی دووچاری چەندین کێشەی دیکە بووە کە پێدەچێت نەتوانێ چارەسەریان بکات. هەروەها واقیعێکی تازە هاتووەتە ئاراوە، ئەم واقیعە بەخێراییەکی سەرسوڕهێن، کۆمەڵێ بەهای تازەی لەگەڵ خۆیهێناوە کە هزری مرۆڤایەتی جارێ ئامادەنەبوو بۆ پێشوازیلێکردنی.
هۆبزباوم وەک خۆی دەڵێ، لە میانەی سەرنج و گوێگرتن، چاودێری کەوتنی بەها کۆنەکانی کردووە، بە تایبەتی ئەو بەهایانەی بە درێژایی ژیانی پێیانەوە پەیوەستبووە (ئەو لە تەمەنی شانزە ساڵییەوە پەیوەندی بە حیزبی کۆمۆنیستەوە کردووە)، بەڵام ئەم پیاوە دڵی خۆی بەوە دەدایەوە کە ئەگەر کۆمەڵگای سۆشیالیزم نەبوایە، ئەوا سیستمی سەرمایەداری نەیدەتوانی لە ژیاندا بەردەوامبێت، ئەو پلانە ئابورییەی سیستمی سەرمایەداری لە ئابوری سۆشیالیزم وەریگرت، ئەوە بوو سیستمی سەرمایەداری لە مردنێکی راستەقینە رزگارکرد.
هۆبزباوم گەرچی بەرِەچەڵەک جولەکە بوو، بەڵام ئەوە رێگری لەوە نەکرد لە دژی ئیسرائیل راوەستێت. ئەو لەگەڵ کۆمەڵێ لە جوولەکەکانی هاوڕێدا، لەوانە شانۆنوسی بەناوبانگ هارۆڵد پنتەر کە ساڵی ٢٠٠٥ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت، رێخراوێکیان بەناوی (دەنگە بێلایەنەکانی جوولەکە) دروستکرد، هۆبزباوم لەگەڵ ئەوانە و چەندان کەسی دیکە، نامەیەکی زۆر توندیان نوسی و رۆژنامەی (گاردیان) لە کانونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٩ بڵاویکردەوە، لەو نامەیەدا بە توندی ئیدانەی ئەو کوشتوبڕینە دەکەن کە سوپای ئیسرائیل لە غەزە پێی هسەتابوو، بە درێژکراوەی ئەو هێرشانەیان لە قەڵەمدا کە بە شەست ساڵە دەکرێتە سەر فەلەستینیەکان.

سەرچاوەکان:
محمد علی فرحات، الاوان، ٥ تشرینی یەکەمی ٢٠١٢
امیر طاهری، الشرق الاوسط، ٧ تشرینی یەکەمی ٢٠١٢
فاظل السلطانی، الشرق الاوسط، ٧ تشرینی یەکەمی ٢٠١٢

# جوانی ناسی
# «ئاوڕدانەوەیەك لە مێژووی بزاڤی جوانیناسی»



ئەرستۆ

نووسینی: د. بەهرام میقدادی
و. لە فارسییەوە: بابەك سەحرانەوەرد

«جوانی ناسی» یا « ستاتیکا» ( Aesthetics) بە گوێرەی «فەرهەنگی زاراوەی بریتانیکا» بەم چەشنە پێناسە کراوە:« لێکۆڵینەوەی هزری هونەر و چەشنە جۆراوجۆرەکانی هەڵسوکەوت و ئەزموونە پەیوەندیدارەکان بە هونەرەوە ١»٠

رەگەزی ئەم وشەیە بۆ وشەیەکی یۆنانی دەگەڕێتەوە کە ماناکەی دەبێتە (هەست پێکردن). بۆ سەرهەڵدانی ئەم چەمکە، مێژوویەکی دیاریکراومان لەبەر دەست نییە، چونکە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی هونەر، زەینی مرۆڤ هەمیشە بەرەو جوانی هۆگرایەتیی نیشان داوە٠

هەوەڵین باسە تیوری و هزرییەکان لەمەڕ ئەم چەمکە بۆ «ئەفلاتوون» و چەن هزرڤانی دیکەی سەردەمی کۆن وەک «ئەرستۆ»، «هۆراس» و «لانجاینووس» دەگەڕێتەوە٠ هەر کام لەم کەسایەتیگەلە پێوەرێکیان بۆ باشی یان نەباشی هونەر بە چەشنی گشتی و بەرهەمی ئەدەبی بە چەشنێکی تایبەتی دامەزراندووە٠



«ئەفلاتوون» لە پەرتووکی (کۆمار) فێرکاری بە سەرەکیترین تایبەتمەندی بەرهەمی ئەدەبی لە ئەژمار هێناوە و بۆ پارێز لە بڵاوبوونەوەی لەناوچوویی و دارمـاوی ئەخلاقی، هەبوونی جوانی لە شیعردا رەتدەکاتەوە. بـەڵام «ئەرستۆ» دژ بە روانگەی مامۆستاکەی، لە کتێبی «بووتیقا» بە لایەنگری لە شیعر هەڵدەستێت و لەزەت و چێژ بردن لە خوێندنەوەی بەرهەمگەلی ئەدەبی لە یەکەمین مەبەست و ئامانجی هەبوونی ئەو دەقە لە ئەژمار دێنێت.

روانگە و بیرۆکەی « هۆراس» لەسەر ئەم کۆڵەکە بینا کراوە کە دەبێت نێوان ئەم دوو چەمکە ئاشتی ساز بکرێت. ئەو دوو هێمانەی (سەرخۆش بوون) و (فێرکاری) لە پێوەرگەلی لێکدانەوەی بەرهەمی ئەدەبی لە ئەژمار دێنێت. دواتـر لە سەدەگەلی ناوەندی و ڕێنێسانسیش، هەر کام لەم بیرۆکانە یان رەتکرانەوە یاخود هاتنە ئارا و یان ئەوەی کە بە شرۆڤەی جۆراوجۆر هەمیسان سەریان هەڵدا.

بە تەواوی ئەمانە، زاراوەی جوانی ناسی بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٧٥٠)ی زاینی وەک وتەزایەکی فەلسەفی لە کتێبێک هەر بەم ناوە لە لایەن « ئەلیکساندر بووم گارتن» بە کار برا. لەم پەرتووکە «بووم گارتن» بەشوێن پەیوەندی نێوان لێکدانەوەی جوانی لە یەک لا، و بیرۆکەی هونەر لە لایەکی ترەوەیە. ئامانجی ئەم نووسەرە بەدەسهێنانی راڤەیەک لە هونەر بوو کە وەک چەشنێک لە چەشنگەلی داهێنەریەتی مرۆڤ کە مەبەستی بەکار هێنانی جوانییە، بهێنێتە ئارا. بەڵام گەورەترین گۆڕانکاری لەم بوارەدا لە لایەن «ئیمانوێل کانت» فەیلەسووفی ناوازەی ئەڵمانی بەکار براوە.

«کانت» لە کتێبی«ڕەخنەی ئەقڵی پەتی» بە رەوشتی میتافیزیکی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لە شیکاری مەسەلەی جوانیناسی ئاوڕدەداتەوە. ئەم فەیلەسووفە مەزنە، جوانی وەک پردێک نێوان جیهانی بەرهەست و دەرهەست لە ئەژمار هێناوە و ئەو تام و لەزەتانە کە لە جوانی هونەر لێدەبێتەوە لە چەشنە هەستیارەکانی دیکەی بەتام و چێژبوون جیا دەکاتەوە و ئەوانە ناو دەنێت: ( تام و چێژە بێ لایەنەکان).

بەم ڕوانگەی «کانت»، جوانی دیاردەیەکی تەواو پەیوەندیار بە هەست لە قەڵەم دراوە و گرینگییەکی ڕۆحی و دەرونی بۆ دابین بووە. هەر لەو سەردەمەدا «هیگڵ» فەیلەسووفی بەناوبانگ، جوانی وەک ( دەنگدانەوەی هەست ئاسای هزر ) ناولیدەنێت و لەسەر ڕوانگەی کانت پێداگرییەکی زۆر دەکات .

ئەمە بووەتە بنەمای فەلسەفی و فیکری جوانیناسی بۆ هاتنە ناوگۆڕەپانی ئەدەبەوە. کەواتە، بە کۆتایی هاتنی سەدەی هەژدهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدهەم، جوانی ناسی لە فەڕەنسا جێی خۆی کردەوە و بۆ یەکەم جار لە بواری ئەدەب رەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی دەبێت. لە ساڵی ١٨٠٤ «بینامین کۆنستان ٢» لە



ئیلیۆت

بیرەوەرییەکانی خۆی لەمەڕ جوانی ناسی ئاماژە بۆ ڕوانگەی کانت ئەدات. دوای بینامین، « تیۆفیل گۆتیە ٣» لە پێشەکیی دوو بەرهەمی خۆی بە ناو ( ئالبێرت تووس و مادمازێل دووموپەن) دروشمی (هونەر بۆ هونەر)ی ڕاگەیاندوە و بەیاننامە سەرەتاییەکانی ئەم بزاڤەی خستە ئاراوە. لە ڕوانگەی ئەو، ئامانج و ئاکامی هونەر سیما و ڕوخساری جوانە و هیچ پێوەرێک بەر لەم مەبەستە ناتوانێت پێوانەی هەڵسەنگاندنی هونەر لە ئەژمار بێت. هەر لەم زەمەنە «بودلێر»، « تیۆدۆر دووبانڤێل ٤» و «فلۆبێر» بە جەخت و تێکۆشانی خۆیان بۆ ڕزگاربوونی هونەر، لەم نووسەرە لایەنگریان کرد. بەڵام لە ئەمەریکا تەنها «ئێدگار ئالن پۆ» شاعیر و نووسەرە هەرە گەورەی ڕۆمانتیک بوو کە دەبێتە پێشەنگی بزاڤی جوانیناسی.

«بنەمای شاعیرێتی» ناوی وتارێک لە « ئالن پۆ » بوو کە لەم دەقە گەشە بە هەڵوێستی هونەر بۆ هونەر لە بەستێنی شیعر ئەدات. ئەو لە ڕەتکردنەوەی فێرکاری، ئەم پرسە دەهێنێتە ئارا کە چۆن دەکرێت بۆ دەربڕینی حەقیقەت، کە پەیویست بە زمانێکی سانا، ڕوون، کورت و دوور لە هەست هەیە، ئێمە لە شیعر یارمەتی وەربگرین. بە واتەی ئەو، کۆکردنەوەی شیعر و حەقیقەت ئەستەمە.

سێ دەیە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بە تایبەت دەیەی (١٨٨٠)ی زایینی بووە هۆی سەرهەڵدان و سەرکەوتوویی بزاڤی جوانی ناسی لە بەریتانیا، بەو جۆرە کە تینێکی زۆری پێدرا. « والتر پیتر ٥» نووسەر و ڕەخنەگەری ئینگلیزی، یەکەم نووسەر بوو کە دوای کاریگەری وەرگرتنی ڕاستەوخۆی «جان ڕاسکین ٦» و«گرووپی شاعیرانی پێش ڕافائێل ٧» لە نووسەرە پێشەنگەکانی فەرەنسە، خۆی سەرقاڵی کۆکردنەوەی میتۆدی بنەمای فیکری ئەم بزاڤە لە بەریتانیادا کرد. لە ١٨٧٣ ئەو کتێبی توێژینەوەیەک لە مێژووی ڕێنێسانسی بڵاوکردەوە و باسی ڕێژەیی بوونی ئەدەبی خستە ئاراوە. «پیتر» لە ژێر کاریگەرێتی «بودلێر» و «فلۆبێر»، وای بۆ دەچوو کە گەران بە شوێن حەقیقەت وەک ئەوەیە کە شوێن تراویلکە کەوتبێتی وبەر لەوە هیچ شتێکی دیکە بەدی ناهێنێت و لەو بڕوایە بوو کە هونەر دەبێت لە هەموو کۆت و بەندە دەرەکییەکان ڕزگار بێت.



ئێدگار ئالن پۆ

ئۆسکار وایڵد



«پیتر» هەروەها لەسەر فورمی بەرهەمی ئەدەبی پێداگری دەکــات و شێوازیش وەک پێوەرێک بۆ لێکدانەوەی ئەم جۆر بەرهەمە دەهێنێتە ئــاراوە. ئەندێشە و روانگەی «واڵتر پیتر»یش لە کۆتایی ســەدەی نۆزدەهەم کارتێکەری خۆی بەسەر چەند نووسەری نــاوازە وەک «لیۆنێل جانسۆن ٨»، « ئیرنێست داوسۆن » و «ئۆسکار وایڵد ٩»ی نوواندوە. لە بەرهەمگەلی ناوازەی ئەم بزاڤە دەکرێت ئاماژە بە رۆمانی «وایڵد» بە ناو (وێنەی دوریان گرەی ١٠ بدرێت.

ئەگەر چی بزاڤی جوانی ناسی بە (قوتابخانەی لەناوچوویی) گەیشت، بەڵام هیچ کاتێکیش لە ناو نەچوو و بە تــەواوی هەرەسی نەهێنا و تەنانەت شاعیرانێک وەک «ویلیام باتلێر» و «ئیلیۆت»ی خستە ژێر کاریگەرێتی و پەنجە دەسەڵاتی خۆییەوە.

سەرەڕای ئەوەی کە دروشمی خۆبژیوی بەرهەمی ئەدەبی وەک یەکێک لە کۆڵەکەکان و واتاگرینگەکانی قوتابخانەی جوانی ناسی بوو، دواتر بووە بنیاتنەری گەورەترین بزاڤی رەخنەی ئەدەبی هاوچەرخیش، واتە رەخنەی نوێ .

پەراوێزەکان:

١- Roy Davis “ Aesthetics” , Encyclopaedia Britannica , ١٩٧٣

٢- Benjamin Constance

٣- Teophile Gantier

٤- Theodore de Bauvilles

٥- Walter Pater.

٦- John Rnskin

٧- Pre - Raphaelite.

٨- Lionel Jonson

٩- Oscar Wilde

١٠- The Picture of Dorian Gray

ژێدەر:

فەرهەنگی زاراوەی رەخنەی ئەدەبی ( لە ئەفلاتوونـ ـەوە هەتا سەردەمی ئەمڕۆ)، نووسینی : دوکتۆر بەهرام میقدادی، دەزگای فکر روز، تاران:١٩٩٩




## ئەنتۆن چیخۆف.. ژیانی لە وێنەدا

ئەمە یەکێکە لەو کتێبە نایاب و گرنگانەی، تا ئێستا بە زمانی کوردی لەسەر ئەنتۆن چیخۆف نوسرابێت. گرنگی کتێبەکە لە سێ خاڵدا دەردەکەوێت: یەکەمیان ئەوەیە چیخۆف خۆی بەسەرهاتی ژیان و گوزەرانی خۆی دەگێڕێتەوە، خۆی باسی منداڵی و هەرزەکاری و گەورەبونی خۆی دەکات. باس لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنی و خۆشی و ناخۆشییەکانی دەکات و خوێنەر لە رێگەی ئەو قۆناغانەوە وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرای ژیانی ئەم کەڵە نوسەرەی روسیای لا دروستدەبێت. دووەم خاڵی گرنگی ئەم کتێبە بریتییە لەو ئەلبومی وێنەیەی لەپاڵ نوسینەکاندا بڵاوکراونەتەوە و جوانییەکی گەورەیان بە کتێبەکە بەخشیوە. بێگومان بوونی وێنە لەناو کتێبدا، چێژێکی زیاتر و زۆرتر دەدات بە خوێنەر و لەکاتی خوێندنەوەدا کەمتر ماندوو دەبێت. سێیەم خاڵی گرنگ بریتییە لەوەی خوێنەر لە میانەی تەماشاکردن و وردبونەوە لە وێنەکانەوە، کەم تا زۆر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و دەڕواتەوە ناو کەشوهەوای سالآنی کۆتایی سەدەی نۆزدە. بەشێک لە وێنەکان چیرۆکی شار و شەقامەکان و چیرۆکی خێزان و هاوڕێکانی چیخۆف و چیرۆکی

منالّی و گەورەیی و پیربونی چیخۆف -مان بۆ دەگێڕنەوە و لە کاتی تەماشاکردنی وێنەکاندا، ئەو گۆڕانکاریانە بەدیدەکەین کە بەسەر روخساری ئەم چیرۆکنوسە مەزنەدا هاتووە.

بێگومان بوونی ئەو هەموو وێنەیە کە نزیکەی ٧٣٠ وێنەیەک دەبێ، روناکی و تیشکێکی زیاتر دەبەخشنە سەر ژیانی چیخۆف، لەگەڵ خوێندنەوەی نوسینەکانی ناو ئەم کتێبە و لە هەمانکاتدا تەماشاکردنی وێنەکان، هەستدەکەیت لەگەڵ چیخۆف -دا بەناو شەقامی شارەکان و کۆڵانی گوندەکانی ئەو سەردەمەی روسیادا دێیت و دەچیت، هەستدەکەی تەواوی ئەو شوێنانە دەناسیت و ئاشنایت پێیان.

چیخۆف ئەگەرچی تەمەنێکی تابڵێی کەم ژیاوە (١٨٦٠-١٩٠٤)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەو ماوە کەمەی ژیانیدا کە لە ٤٤ ساڵ تێپەڕی نەکردووە، توانیویەتی ببێت بە یەکێک لە ئەدیبە ناسراوەکانی جیهان، تەنانەت بە درێژایی مێژوو، بە باشترین نوسەری کورتە چیرۆک دادەنرێت.

بەپێی هەندێ سەرچاوە، چیخۆف هەر لە تەمەنی منالّییەوە عاشقی شانۆ و ئەدەب بووە، لە تەمەنی ١٣ ساڵیدا بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا دەڕوات بۆ بینینی یەکەم نمایشی شانۆیی (ئۆپرای هێلین)ی باخ، لەو چرکەساتەوە دەبێتە یەکێک لە شەیدایانی شانۆ و دواتر کۆمەڵێ تێکستی شانۆیی دەنوسێت کە تا رۆژی ئەمڕۆمان، لەسەر شانۆکانی جیهاندا نمایشدەکرێن. چیخۆف لەو تەمەنە بچوکەیدا، هەر پارە و پولێکی دەست بکەوتایە، دەیدا بە بلیتی چوونە ژورەوە بۆ شانۆگەریەکان و هەمیشە لە ریزی پشتەوەی شانۆکە دادەنیشت، چونکە نرخی دانیشتن لەو ریزە هەرزانتر بووە!

چیخۆف کاتێ لە زانکۆی مۆسکۆ، خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی بووە، دەستی بە نوسین کردووەو لە هەردوکیاندا بەردەوام بووە، واتە لە کاری نوسین و خوێندنی پزیشکی و لەمبارەیەوە دەڵێ: (پزیشکی ژنەکەمە و ئەدەبیش عەشیقەکەمە).

کتێبی ئەنتوان چیخۆف.. ژیانی لە وێنەدا، گەشتێکی رۆحی و ئەدەبییە، بەناو ژیانی ئەم نوسەرە مەزنەدا، گەشتێکە لە یەکەم لاپەڕەی کتێبەکەوە تاکوو دواهەمین لاپەڕەی کتێبەکە، هەست بە زیندویی چیخۆف دەکەیت و هەست دەکەی پێکەوەن و پێکەوە لاپەڕەکان هەڵدەدەنەوە و گوێت بۆ چیخۆف شلکردووە کە یەک بە یەک باسی وێنەکانت بۆ دەکات و باسی ئەو رۆژگارەت بۆ دەکات کە تێیدا ژیاوە.

ئەم کتێبە لەلایەن بەڕێز رەووف بێگەردەوە کراوە بەکوردی، وەک لە پێشەکی کتێبەکەدا نوسیویەتی: (من لە هەوادارانی چیخۆفم و تا ئێستا بێجگە لە چەند وتارێک کە لە سەریم نووسیوە سێ کتێبیشم لە بەرهەمەکانی وەرگێڕاوە)، ئەم ئاشنابونەی وەرگێڕ بە ژیان و بەرهەمەکانی چیخۆف، وایکردووە لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا سەرکەوتوبێت و ئەو پەیامە نەرم و ژیاندۆستیەی لەناو نوسین و وێنەکاندایە، بە ئاسانی بگەیەنێت بە خوێنەر.

کتێبەکە ٣٣٦ لاپەڕەی قەبارە گەورەیە، تیراژی ١٠٠٠ دانەیە و نرخی ٦٠٠٠ شەش هەزار دینارە.




## بلیمەتە شێتەکان

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبەکانی نوسەری عەرەب «ڕەجا ئەلنەقاش ١٩٣٤- ٢٠٠٨»، نوسەری کتێبەکە لە پێشەکیەکی کورتدا مەبەستی خۆی لە نوسینی ئەم کتێبە دەربڕیوە، ئەو لەوێدا دەڵێ: (چەندین ساڵی دوورودرێژە تێبینی دەکەم زۆرێک لە کوڕوکاڵی نەوە تازەکانی عەرەب، تەنانەت لەنێو خوێندەواران و دەرچوانی زانکۆشدا، تێڕوانینێکی نێگەتیڤیان بۆ ئەدەب و فیکر و ڕۆشنبیری هەیە و بەشێوەیەکی خراپ لێیان دەڕوانن. ئەوان پێیانوایە ڕۆشنبیری بەشێوەیەکی گشتی بریتییە لە (شتێکی ئێسک قورس) و عەقڵ و دەروون شەکەت و ماندودەکات. لەبەرئەوە تەنها ڕۆشنبیرییەکی سوک و ڕوکەش، شوێنی بایەخ و گرنگیپێدانی نەوە تازەکانە. بەڵام ئامرازە ڕۆشنبیرییە قووڵ و جدییەکان، لەسەروو هەموشیانەوە کتێب، بوونەتە کۆمەڵێ مەسەلە باشترە مرۆڤ لێیان دووربکەوێتەوە، تاکو حاڵەتی ڕۆحی و تەندروستی لە لاوازی و نەخۆشکەوتن بەدووربگرێت و پارێزگاریان لێبکات. من هیچ گومانێکم لەوە نییە گەنجانی ئەمڕۆ، بە تەنها ئەوان بەرپرسی ئەم دیاردە نێگەتیڤەی ژیانی ڕۆشنبیریمان نین. زۆرێک لە ئەدیب و نوسەران بەشدارن لە دروستکردنی ئەم دیاردەیەدا. چونکە ئەو ئەدیب و نوسەرانە، لە گوزارشتکردن و دەربڕین و بیرکردنەوەدا، ڕوویان لە ئاڵۆزی کرد، تا وایلێهات ڕۆشنبیری گشتی، وەک جۆرێک لە حوکمی ئیشی سەخت و زۆرەملێی هەتاهەتایی لێهات، بەسەر مرۆڤێکی بێگوناهدا کە هیچ خەتاو تاوانێکی نییە.

ئەم کتێبە کە دڵخۆشم بەوەی پێشکەشی نەوەی نوێی گەنجانی دەکەم، هەوڵێکە لە نێوان هەوڵە زۆرەکانی دیکە، بۆ لابردن و سڕینەوەی ئەو وەهمانەی پەیوەستن بە مەسەلەکانی ڕۆشنبیری و لقە جیاوازەکانییەوە لە ئەدەب و هونەر و فیکر. ئەوە ڕاست نییە ڕۆشنبیری شتێکە جیا لە ژیانی مرۆڤ بە خۆشی و ناخۆشییە جۆراوجۆرەکانییەوە. هەروەها ئەوە ڕاست نییە ڕۆشنبیران توێژێکن و لە ناوچەیەکی دوورەپەرێزی جیهاندا دەژین، کۆمەڵە قەشەیەکی ئاڵۆزن کە هیچ کەسێک لە نهێنییەکانیان

تێناگات. بەڵکو ڕاستییەکە ئەوەیە ڕۆشنبیری گوزارشتکردنە لە کێشە و خەمەکانی مـرۆڤ، ڕۆشنبیرانیش هەم کۆمەڵێ شتیان خۆشدەوێ و هەم رقیشیان لە کۆمەڵێ شتی دیکەیە، ئازار دەچێژن و دووچاری هەمان ئەو کێشە مادیی و مەعنەویانە دەبن کە دووچاری هەمو خەڵکی دەبێت. هەوڵدان بۆ ئاشکرا کردنی هەندێ لە ماناکانی ژیانی ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیران، بابەتی ئەم کتێبەیە.

نایشارمەوە ئامانجی روون و ئاشکرای من لە نوسینی ئەم کتێبە، ئەوەیە حەزی ڕۆشنبیری و ئارەزوی خوێندنەوە و هەستکردن بەوەی جیهانی ڕۆشنبیری هەمان جیهانی ژیانە کە سەرجەم مرۆڤەکان تێیدا دەژین، وەلێ بە شێوەیەکی راشکاوانە و بێگەرد و راستگۆیانە، لای گەنجان بوروژێنم. ئەو ئەزمونە جیاواز جیاوازانەی کە ڕۆشنبیران پێیدا تێپەڕیون و گوزراشتیان لێکردووە، بە راست و هەڵەیەوە، بە ئازارو خۆشییەوە، بە سەرکەوتن و شکستییەوە، هەمان ئەو ئەزمونانەیە کە تەواوی مرۆڤەکانی دیکە، لە هەمو شوێنێکدا، تێیدا دەژین و پێیدا تێدەپەڕن.

گەر ئەم کتێبە توانی پەرۆشی و حەماسی گەنجان بۆ ڕۆشنبیری و حەزی زیاتری ئەوان بۆ فێربوون و خوێندنەوە بوروژێنێت، ئەوا من ئەو ئامانجەم بەدەستهێناوە کە کتێبەکەم لەپێناودا نوسیوە و پێشکەشی خوێنەرانم کردووە. پوختەی ئەو ئامانجەی من دەمـەوێ بیگەمێ، بریتییە لە دروستکردنی هاوڕێیەتیەکی پتەو لەنێوان گەنجان و جیهانی ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەر. من گومانم لەوەنییە لە کۆمەڵگاکەماندا، قووڵکردنەوەی حەز و مەیلە ڕۆشنبیرییەکانی مـرۆڤ، ئامانجێکە لە ئامانجە هـەرە پیرۆزەکان. چونکە بڵاوبونەوەی ڕۆشنبیری بە شێوەیەکی راست و دروست، مانای وایە کۆمەڵگاکەمان دەتوانێت زۆرێـک لەو دیوار و بەربەستانە ببڕێت کە ڕێگرن لەنێوان خۆی و ڕێنیسانس و پێشکەوتن و تێگەشتنی راست بۆ ئەم سەردەمە سەختەی تێیدا دەژین.

خوێنەر لە دوتوێی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا، هەستدەکات لە سەدە کۆنەکانەوە دەگوێزێتەوە بۆ سەدە تازەکان. لەنێوان نیشتیمانی عەرەبی و نیشتمانە جیاواز جیاوازەکانی جیهاندا دێت و دەچێت. لەنێوان ئەدەب و سیاسەت، شارستانیەت و هونەر، ڕوداوەکانی مێژوو و ڕەوشتی خەڵک، دێت و دەچێت. پرۆگرامی کتێبەکە لەسەر بنچینەی ئەم گەشتە رۆحییە جۆراوجۆرانەی نێوان ژیان و هونەر و مێژوو دامەزراوە. رەنگە ئەم گەشتە لە دواجاردا چەند لاپەڕەیەکمان لە توانا و ماندوبونی مرۆڤەکان، لە پێناو گەیشتن بە چاکە و خۆشبەختی و ستاتیکا، بە درێژایی چاخە جیاواز جیاوازەکان بۆ ئاشکرا بکات. مرۆڤ لە هەمووی ئەم توانا و ماندوبونانەیدا، جارێک سەرکەوتوو بووە و جارێک دۆڕاو بووە. جارێک دەستی خستۆتە سـەر کانییە روون و بێگەردەکان، چەندین جاریش بووەتە هۆکاری ئێش و ئازار بۆ خۆی و بۆ ئەوانی دیکەش. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ژیان بۆخۆی راناوەستێ و تێدەپەڕێت، مرۆڤ دڵخۆشدەبێت و خەمباریشدەبێت. لە هەموو حاڵەتەکاندا نمونەیەکی باڵا بۆ خۆشبەختی و کامەرانی پێویستە، تەنانەت ئەگەرچی ئەو نمونە باڵایە، لە نەوەیەک لە نەوەکانیشدا، بە شێوەیەکی تەواوەتی بەدینەهاتبێت).

لێرەوە ئەم کتێبە هەوڵێکە بۆ هاندانی گەنجان تاکو لە دنیای کتێب نزیکببنەوە و کتێب بکەنە بەشێک لە ژیانی خۆیان و بەشێک لە کاتی خۆیان بۆ خوێندنەوە تەرخان بکەن.

کتێبەکە ٣٤٥ لاپەڕەی قەبارە مامناوەندییە، تیراژی ٦٠٠ دانەیە، نرخی ٥٠٠٠ هەزار دینارە.




## ئینسایکلۆپیدیای کۆمەڵناسی

ئەم کتێبە یەکێکە لە بەرهەمە بە پێزەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم کە لە ماوەی رابردودا بڵاوکراوەتەوە. لە راستیدا بوونی ئەم ئینسایکلۆپیدیایە بە زمانی کوردی، کارێکی تابڵێی بەسودە و جێگای دەستخۆشی و پێزانینە، چ بۆ وەرگێڕی کتێبەکە بەڕێز دانا مەلا حەسەن و چ بۆ دەزگای سەردەم کە بەشێوەیەکی پوخت و جوان چاپیکردووە.

ئاشکرایە کتێبخانەی کوردی لە مەسەلەی بابەتەکانی کۆمەڵناسیدا، کتێبخانەیەکی هەژارە و ژمارەی ئەو کتێبانەی لەم بوارەدا چاپکراون، تابڵێی کەمن و تینوێتی خوێنەر ناشکێنن، بەتایبەتی ئەو خوێنەرانەی حەز بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە کتێبانە دەکەن و دەیانەوێت لەم بوارەدا خۆیان پێبگەیەنن.

هەروەها ئەم کتێبە سودێکی گەلێک گەورە بە خوێندکارانی بەشی کۆمەڵناسی زانکۆکانی کوردستان دەگەیەنێت، چونکە ئاشکرایە بەشێک لە خوێندکاران، تەنها زمانی کوردی دەزانن، ئەمەش لەکاتی خوێندن و لەکاتی نوسینی تێزی دەرچونیان، گرفتی گەورەیان بۆ دروست دەکات. نەبونی سەرچاوە بە زمانی کوردی لە بوارەکانی کۆمەڵناسی، یەکێکە لە کێشە گەورەکانی ئەمڕۆ کە رووبەڕوی خوێندکارانی خوێندنی باڵا دەبێتەوە. نەبوونی کتێبە زانستی و مەعریفی و فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەکان، بە زمانی کوردی، چ لە زانکۆکان و چ لە کتێبخانەکاندا، هۆکارێکی سەرەکییە بۆ کەمتوانایی خوێندکار و دابەزینی ئاستیان.

لێرەوە بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە، دێت بۆ ئەوەی کەمەکێک ئەو بۆشاییە گەورەیە پڕ بکاتەوە و ببێتە سەرچاوەیەک بۆ هەموو ئەوانەی لە بواری کۆمەڵناسیدا کاردەکەن، چ وەک خوێنەر، چ وەک خوێندکار و چ وەک توێژەر. ئەم کتێبە ژمارەیەکی زۆری زاراوەی کۆمەڵناسی لەخۆگرتووە کە بەشێکی هەرە زۆریان، لە نوسین و توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکاندا، بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاردەهێنرێن، ئەم خاڵە وادەکات کتێبەکە بەهایەکی زیاتری هەبێت. شیکردنەوە و شەرحکردنی ئەو زاراوانە، یارمەتییەکی گەورەی هەموو ئەو کەسانە دەکات کە حەز لە دنیای کۆمەڵاناسی دەکەن.

ئەم کتێبە ٦٤٨ لاپەڕەی گەورەیە، تیراژی ١٠٠٠ هەزار دانەیە و نرخی ١٠٠٠٠ هەزار دینارە.




## گاتاکان سروده ئەهوورايیەكانی زەردەشت

یەکێک لە هۆکارە هەرە سەرەکییەکان کە وایکردووە تا ئێستا کەسایەتییەکی گەورەی وەک زەردەشت، بە شێوەیەکی باش نەناسرێت، بریتییە لە نەبونی سەرچاوەی باوەڕپێکراو، بە زمانی کوردی، لەسەر ئەم کەسایەتییە. هەژاری کتێبخانەی کوردی لەسەر زەردەشت و زادگای لەدایکبوونی و شوێنی ژیانی و ڕێبازە ئاینیەکەی، وایکردووە ئەم کەڵە پیاوە وەک پێویست تیشکی نەخرێتەسەر و هەمیشە جۆرێک لە تەمومژ لەسەر شوێنی لەدایکبوونی و ژیانی و ئەو زمانەی قسەی پێکردووە، بمێنێتەوە.

لێرەوە ئەم کتێبە دێت بۆ ئەوەی تاڕایەکی باش ئەو تەمومژە بڕەوێنێتەوە و ئاشنامان بکات بە ژیان و شوێنی لەدایکبوون و زێدی ڕاستەقینەی زەردەشت.

ئەم کتێبە چەندین زانیاری وردی لەسەر زەردەشت و ڕێبازە ئاینیەکەی لەخۆدەگرێت، واتە کتێبێکە لە نزیکەوە زەردەشت بە خوێنەر دەناسێنێ و کۆمەڵێ زانیاری گرنگی دەخاتە بەردەست کە دواجار ئەو زانیاریانە دەبنە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زەردەشتناسی و تێگەشتن لە ئاین و ڕێنماییەکانی.

لەم کتێبەدا باس لە چەندین وشە و زاراوەی گرنگی ناو فیکری زەردەشت دەکرێت و ئەو وشە و زاراوانە بە شێوەیەکی جوان شیکراونەتەوە، ئەمەش وادەکات تێگەشتن لە کتێب و نوسینەکانی زەردەشت ئاسانتربێت. چونکە بێ تێگەشتن و زانینی مانای ئەو وشە و زاراوانە، ئەستەمە لە فیکر و بیروڕا و تێڕوانینەکانی زەردەشت تێبگەین. لەوانە باس لە مانای وشەی ئاهورا، ئەمشاسپنتە، ئەشا، ڤەهومەنا، خشەترا، ئارمەیتی، هەروتات، ئەمرتات کراون. بێگومان ئەم وشانە بەشێکی سەرەکین لە فیکری زەردەشتادا و تێگەشتن لێیان و لەو واتایانەی هەڵگرین، وادەکات بە ئاسانی لە جیهانی ئەم بیرمەندە تێبگەین و لەو قۆناغانەش تێبگەین کە فیکری ئەم بیرمەندەی پێدا تێپەڕیووە. لە ڕاستیدا ساغکردنەوەی مانای ئەو کۆمەڵە وشەیە، کارێکی گرنگی ئەم کتێبەیە و بایەخی کتێبەکەی زیاتر کردووە. چونکە وەک وتمان تێگەشتن لەو وشانە، هەنگاوی یەکەمە بۆ تێگەشتن لە فیکری زەردەشت و هـەنـگـاوی یەکەمە بۆ چوونە ناو جیهانی کتێبەکانی ئەم بیرمەندەوە.

وەرگـێـڕی کتێبەکە بـەڕێـز «هـادی مـحـەمـەدی» پێشەکییەکی تاڕادەیەک درێژی بۆ کتێبەکە نوسیوە کە نزیکەی ٢٨ لاپەڕەی کتێبەکەی لەخۆگرتووە، ئەم پێشەکییە دەروازەیەکی گەلێک باشە بۆ ناساندنی هەم کتێبەکە و هەم زەردەشت و ئەو سیستمە فەلسەفی و ئەخلاقییەی زەردەشت کاری لەسەر کردووە یان ڕاستتر دایمەزراندووە. واتە وەرگێڕ کارێکی باشی کردووە کە ئەو پێشەکییە بە پێزەی بۆ کتێبەکە زیاد کردووە و چەندین زانیاری گرنگ و بایەخداری لەسەر زۆر لایەنی زەردەشت لەخۆگرتووە. بەمەش کتێبەکە دەوڵەمەندتر بووە.

ئەم کتێبە ١٥٧ لاپەڕەی قەبارە بچوکە و تیراژی ٦٠٠ دانەیە و نرخی ٢٥٠٠ دینارە.




## خۆشەویستێکی ترسناک

ئەم کتێبە وەک لە پێشەکیەکەیدا نوسراوە، دووەم ڕۆمانی نوسەری ژاپۆنی «هارۆکی مۆراکامی»یە، کە لە ساڵی ١٩٩٢ لە ژاپۆن چاپکراوە. هێڵی سەرەکی ڕۆمانەکە، باسکردنە لە مەسەلەی خۆشەویستی، بەڵام لە چەند دیدگایەکی جیاوازەوە. دەکرێ بڵێین پرسیاری هەرە سەرەکی لەم ڕۆمانەدا بریتییە لەوەی ئێمە بۆچی کەسێکمان خۆشدەوێ و کەسێکی دیکەمان خۆشناوێت؟ ئەوە چییە وادەکات تۆ هەمو ژیانت هۆگری کەسێک بیت و پێتخۆشبێت تەواوی زیندەگی خۆتی لەگەڵدا بەشبکەیت، بەڵام لە هەمانکاتدا ناتوانیت لەگەڵ کەسێکی دیکە بژیت و پێتخۆشنییە تەنانەت ببینیت؟

کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکە، پیاوێکی ئاساییە وەک ئەو هەزاران پیاوەی ڕۆژانە دەیانبینین و تاڕادەیەک لە نزیکەوە دەیانناسین، وەک هەر کەسێکی دیکە حەز لە خۆشەویستی و دروستکردنی پەیوەندیی عاشقانەیە لەگەڵ ڕەگەزەکەی بەرامبەری. لە هەمانکاتدا وەک هەر پیاوێکی دیکەی ئاسایی، حەزی لە مومارەسەکردنی سێکسە و بۆ ئەو مەبەستەش لەگەڵ چەندین ئافرەتدا دەنوێت. کێشەی ئەم کاراکتەرە ئەوەیە، هەندێجار بەشوێن خۆشەویستیەکی ڕۆحی و پاکیزەیی گەورەدا دەگەڕێت، هەندێجاری دیکە دوور لە خۆشەویستی و تەنها وەک پێداویستیەکی جەستەیی بە شوێن ئافرەتدا دەگەڕێت و سێکسی لەگەڵ دەکات.

بە مانایەکی تر «هاجیما» کە کارەکتەری سەرەکی ڕۆمانەکەیە، لەنێوان دوو جیهاندا دێت و دەچێت، جیهانێک عەشقی پێدەبەخشێت و وەک

کەسێکی عاشق هەڵسوکەوت دەکات، لەگەڵ جیهانێک لەزەتی جەستەی پێدەبەخشێت، ئەگەرچی ئەو لەزەتە هیچ خۆشەویستییەکی تێدانەبێت و تەنها خۆخاڵیکردنەوەیەکی ناچارییە یان تەنها بەجێهێنانی تێرکردنی غەریزە سێکسییەکەیەتی. ئەم دوو جیهانە بە درێژایی ڕۆمانەکە لەپاڵ یەکدا بە تەریبی دەڕۆن، وەلێ لە هەندێ جێدا جیهانی یەکەم زاڵە و زۆر بە چڕی ئامادەیە، کەچی لە هەندێ لاپەڕەی دیکەدا جیهانی دووەم دێتە پێشەوە و پاشەکشە بە جیهانی یەکەم دەکات.

پێویستە ئەوە بڵێین کە «هاجیما» زیاتر حەز لە جیهانی یەکەمیان دەکات و مەیلی بەلای مەسەلەی عەشق و ئەڤین و دڵدارییدا زۆرترە، وەک بەلای مەسەلە جەستەییەکان. ئەم پیاوە بەشێکی زۆری تەمەنی تەرخاندەکات بۆ گەڕان و دۆزینـەوەی خۆشەویستەکەی سەردەمی منداڵی کە کچێکی تۆزێک شەلە و ناوی «شیمامۆتۆ»یە. بەڵام لەکاتی ئەم گەڕان و سۆراخکردنەیدا، خۆی بێبەشناکات لە چێژی جەستە و بەدەم غەریزە سێکسییەکانییەوە دەچێت و تاڕادەیەکی باش تێریان دەکات. ئەم کاراکتەرە لە میانەی گەڕانەکەیدا چەند جارێک خۆشەویستەکەی دەدۆزێتەوە و لێوندەبێتەوە. ئەوەشی ئەم گەمەی دۆزینەوەیە و لێونبوونە ئەنجامدەدا، کچەکەیە، واتە «شیمامۆتۆ»یە.

«شیمامۆتۆ» کچێکی سەیر و ئاڵۆزە، دەکرێ بڵێین پڕ نهێنییە و نایەوێت نهێنییەکانی دەرکەوێت، تەنانەت نایەوێت نهێنییەکانی بۆ «هاجیما»ی خۆشەویستیشی بدرکێنێت. ئەم کچە کاتێ وندەبێت و پاشان دێتەوە، هەندێ نهێنی دەپەڕنە ناو ژیانی، بێ ئەوەی نە خوێنەر و نە خۆشەویستەکەی بزانن ئەو نهێنیانە چییە. تەنها ئەوە نەبێت کچەکە داوا لە خۆشەویستەکەی دەکات سەبارەت بە ژیانی و نێهێنییەکانی هیچی لێ نەپرسێت. ئەویش بە گوێی دەکات و هیچی لێناپرسێت. بێگومان نوسەری ڕۆمانەکە، واتە هارۆکی مۆراکامی، ئەویش نایەوێت ئەو نهێنیانە دەرکەون.

لێرەوە ئێمەی خوێنەر وەک هاجیما کە شەیدای شیمامۆتۆ بووە، پەی بەو نهێنیانە نابەین کە لەکاتی ونبوونی «شیمامۆتۆ»دا دێنە ناو ژیانییەوە. ئەمەش وا دەکات خوێنەر خۆی بە دوای ئـەو نهێنیانەدا بگەڕێت و لە دوتوێی لاپەڕەکانی ڕۆمانەکەدا هەوڵی دۆزینەوەیان بدات.

دواجار پێویستە سەبارەت بە وەرگێڕانەکە دەستخۆشی لە بـرای وەرگـێـڕ «ئـەردەڵان عەبدوڵڵا» بکەین کە سەرکەوتوانە ڕۆمانەکەی کردووە بە کوردی. بەڵام لە هەندێ شوێندا زیاد لە پێویست (کە)ی بەکارهێناوە، ئەو زیاد بەکارهێنانە وایکردووە لە کاتی خوێندنەوەی ئەو شوێنانەدا هەست بە جۆرێک قورسی بکەیت. دەکرا بڕێکی زۆر لە (کە)یانە لاببرێن. جگە لەو تێبینییە بچوکە، ئێمە لە بەردەم وەرگێڕانێکی پوخت و جوانداین و بە ئاسانی لێیتێدەگەین و دوچاری هیچ جۆرە گرێوگۆڵێک نابین.

ئەم کتێبە ٢٥١ لاپەڕەی قەبارە بچوکە، تیراژی ٧٠٠ دانەیە، نرخی ٤٠٠٠ دینارە.